سوپاس بۆ:

بەڕێز **د. طـاهر حسـو زێبـاری** کـە سەرپەرشـتیی لێکۆڵینەوەکــەمی بــە ئەســتۆ گــرت و لــە هــیچ کۆششێك درێغی نەکرد.

# کۆمەڵناسیی

## خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان

فائیز ئیبراهیم محەممەد



هەولێر - ٢٠١٣




خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **کۆمەڵناسیی** **خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان**
- نووسینی: **فائیز ئیبراهیم محەممەد**
- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**
- بەرگ: ڕێمان
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانە: ڕۆژهەڵات (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٩) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧١٩)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# بســـم الله الرحمــن الرحيــم

﴿ولا تلقوا بأيديكم إلى التهلكة و أحسنوا﴾

**﴿خۆتان به دەستی خۆتان مەخەنە نەهامەتی و، کاری باش بکەن﴾**

(البقرة / ١٩٥)

# ناوەڕۆك

## پێشەکی:

لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە، مادده هۆشبەرەکان هەڕەشەیەکی ستراتیژی و فرەڕەهەندە کە لە هەندێ کاتدا، ڕوویەك لە هەموو ڕوویەکانی تری زیاتر بەرجەستە دەبێت. نە تەنیا ((ئاسایشی تاك))، بەڵکو ((ئاسایشی نیشتمانی و نەتەوەیی)) و ((ئاسایشی بوون و مانەوە))ی کۆمەڵگایەك دەخاتە هەڕەشەوە. ئاڵۆزی ئەم هەڕەشەیە کاتێك زیاتر دەردەکەوێت کە جگە لەوە، یەکەم: ڕەهەندێکی سەروو نەتەوەیی و سەروو نیشتمانی و، دووەم: ئامانج، ناوەڕۆك و لایەنە سیاسی و کولتوورییەکانی بخەینە ژێر تیشکی لێکۆلینەوە. لە کوردستانی ئەمڕۆشماندا، خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان وەکو کێشەیەکی کۆمەڵایەتی جیددی و نوێ دەرکەوتووە. ئەم کێشە کۆمەڵایەتییە، کاری کردوەتە سەر ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی کورد کە ژمارەیان ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوونە و لە ئەنجامی کارلێکردنی لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتییەکانی تر (وەکو: تەڵاق و خۆکوژی و لادانی سێکسی و هەڵاتن لە ماڵەوە و...) بۆتە هەڕەشەیەك کە بونیادی کۆمەڵگەکەمان هەڵدەتەکێنێت.

پێویستیی ناسینی ڕەهەندەکان و ئاستە جیاوازەکانی ئەم گرفتە کۆمەڵایەتییە کاتێك قووڵتر دەبێت، کە بزانین لەم سەردەمەی خۆماندا، دیاردەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و قاچاغی پێکردن، بە پاڵپشتی گەشەسەندنی تەکنەلۆژیای پەیوەندیی و ئینتەرنێت و دروستبوونی باندەکانی مافیا و دەستە نهێنییەکان، وای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە کە وەك تاوانێکی ڕێکخراو بیناسێنێت و چەندین پەیماننامە و پرۆتۆکۆلی هەمەجۆر دەربکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو جۆرە ماددانە.

تەنگژەی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان ئێستاکە بە یەکێك لە چوار تەنگژە و پرسە جیهانییەکان دەژمێردرێت: (تەنگژەی لەناوچوونی ژینگە، تەنگژەی هەڕەشەی ئەتۆمی، تەنگژەی هەژاری، تەنگژەی مادده هۆشبەرەکان). بەڵام بە هۆی ئەو سوودە بەردەوامەی وڵاتانی بەرهەمهێن و دابەشکەر کە لەم ماددانە دەستیان دەکەوێت، بۆتە جێگەی دڵدەدانی دەسەڵاتە جیهانگەراکان؛ بە جۆرێك کە بازرگانیکردن بە مادده هۆشبەرەکان، بۆتە سێیەمین بازرگانی لە دوای "چەك" و "نەوت" و، داهاتەکەی دەگاتە زیاتر لە (٧٠٠) ملیارد دۆلار ساڵانە؛ واتە (٨٪)ی گشت بازرگانیی جیهانی.[١] یان داهاتی ناپوختەی نەتەوەیی زیاتر لە سێ چارەکی وڵاتانی جیهان.[٢]

بەپێی دوایین ئامارەکانی (UNODC) نووسینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مادده هۆشبەرەکان و تاوان، لە ساڵی ٢٠٠٩، (١٧٥–٢٥٠) ملیۆن خووگرتوو لەسەرتاسەری جیهان هەن کە بە شێوەیەکی ڕێکخراو مادده هۆشبەرەکان بەکاردەهێنن.[٣]

کوردستانیش بە هۆی هەلومەرجی تایبەتی و دراوسێیەتی لەگەڵ ناوەندەکانی ترانزیتی مادده هۆشبەرەکان و سەرەڕێبوونی بۆتە باشترین و کورتترین ڕێگای گواستنەوەی، تووشی چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی وەك خووگرتن بەمادده

---

١. شبكة النبأ المعلوماتية؛ لە ژێر ناونیشانی: **اليوم الدولي لمكافحة المخدرات: دعوة عالمية لإيقاف تدمير الإنسانية**؛ لە سایتی ئینتەرنێتی: http://www.annabaa.org/nbanews/64/183.htm

٢. میری آشتیانی، الهام؛ **جامعه‌شناسی اعتیاد در ایران امروز**؛ چ١؛ تهران: نشر مهـاجر (٢٠٠٥)؛ ص ٣.

3.United Nations Office on Drugs and Crime (UNODC), **World Drug Report 2009**, UNITED NATIONS: New York, (2009), P.20.

هۆشبەرەکان بووە تا ڕادەیەك کە ئێستا بەپێی دوایین ئامارەکان، نزیکەی (٣٠٠٠–٥٠٠٠) خووگرتوو لە هەرێمی کوردستاندا هەیە. لەباربوونی زەمینەکانی گەشە و بڵاوبونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە هەرێمی کوردستاندا و قاچاغی پێوەکردنی، بۆتە بازرگانییەکی ژێرزەمینی و نادیار، ئالۆزی ئەم بارودۆخەی هێناوەتە ئاراوە و وردە وردە بۆتە تەنگژەیەکی بنەڕەتی. هەر چەندە چەندین دەستپێشخەری گیراوەتە بەر وەك توندکردنی یاسایی، سزادانی قاچاغچییەکانی مادده هۆشبەرەکان، بە تاوان ناساندنی تاکی خووگرتوو، کۆنتڕۆڵی سنوورەکان، دامەزراندنی ڕێکخراوی بەرەنگاربوونەوە و ڕێکخراوی رۆشنبیریی مادده هۆشبەرەکان، بەڵام ڕۆژ بە رۆژ دەبینین کە ژمارەی خووگرتووان و ئاماری بەندکراوەکانی مادده هۆشبەرەکان لە زیادبوون و، ناوەندی تەمەنی خووگرتن لە دابەزین دایە و، ئاسەوار و ئاکامە نێگەتیڤە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی لە بەرزبووندان! جگە لەوەش لەگەڵ نەبوونی پرۆگرامەکانی دەرمانی و چاکسازیی کۆمەڵایەتی، هەروەها پرۆگرامی کۆنتڕۆڵ و هۆشیارکردنەوەی خەڵك بە تایبەتی گەنجان، مەترسیی ئەم تەنگژەیە دوو ئەوەندە دەکات.

دیاردەی مادده هۆشبەرەکان پرۆسەیەك و سیستمێکی نەپچڕاوە کە خەریکبوون بە بەشێك و ڕەهەندێکی ئەو سیستمە و فەرامۆشکردنی ڕەهەندەکانی دیکە و هەروەها کاریگەرییەکانی، بێجگە لە شکست، ڕاستکردنەوە و گۆڕینی ناچاریی یاسا و ڕێوشوێنەکانی جێبەجی کردن، هیچ ئەنجامێکی تری لێناکەوێتەوە؛ بۆیە بۆ گەیشتن بە بارودۆخێکی هاوسەنگ و دروستکردنی سیستەمێکی لۆژیکی لە نێوان هەموو ڕەهەندەکانی ئەم دیاردەیە، پێویستی بە ڕوانگە و پرۆسەیەکی ستراتیژیی هەیە.

بۆیە، سەرەتا پێویستە بۆ لێکۆڵینەوە و ناسینی بارودۆخ و هەلومەرجی واقعی ئەم دیاردەیە لە ڕوانگە جیاوازەکانەوە بکۆڵینەوە و لەم بوارەشدا دەبێ زەمینە و شوێنگە کۆمەڵایەتییەکان، کاریگەریی کولتوور، بەهاکان و مێژوو و

پێشینەکانی کۆمەڵگا لەبەرچاو بگرین؛ چونکە تاکەکانی هەر کۆمەڵگایەك بەپێی ڕوانگە و کولتووره جیاوازەکان، تێروانینی هەمەجۆریان بۆ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان هەیە و، خووگرتن و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکانیش وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لەم بڕیارە نەوازە نین.

ئەگەر ئەوەمان قەبووڵ بێت ئاسایش و ئەمنییەتی "بوون" (واتە: ناسنامە، بەها و پێوەرەکانی کۆمەڵگایەك کە بوون و مانەوەی کۆمەڵگایەك دەسەلمێنێ) لە پێش ئاسایشی نەتەوەییەوە بێت، بێگومان دەبێ ئەوەشمان قەبووڵ بێت کە ماددە هۆشبەرەکان خێراترین و جیددی ترین هەڕەشەی نەتەوەیی ئەم کۆمەڵگایەن و یەکەمین هەنگاو بۆ ڕووبەڕوونەوە و کۆنترۆڵکردنی، پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وورد، زانستی، هەنووکەیی و کارامە لەسەر ماددە هۆشبەرەکان.

* * *

کێشەی ماددە هۆشبەرەکان، کێشەیەکی جیهانییە کە هەموو وڵاتانی دونیا لەم سەردەمەیەدا لێی دەناڵێنن.. ئێمە وەکو کۆمەڵناسێك توێژینەوەی ئەم بابەتەمان لە ئەستۆ گرتووە، چونکە خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان، دیاردە و پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتییە کە چەندین کار و کاردانەوەیەك دەگرێتەخۆ؛ بە واتایەکی تر کێشەی ماددە هۆشبەرەکان، تەنها کێشەی تاکێکی گوشەگیر نییە کە لە نێوان شەو و ڕۆژێك، یان تەنیا بۆ جارێك ڕوو بدات، بەڵکو کێشەیەکە کە لە ناوەندێکی کۆمەڵایەتی - کولتووریی دیاریکراودا ڕوودەدات و دووبارە دەبێتەوە کە ئەو ناوەندە یان هانی دەدات، یان بە جۆرێك چاوپۆشی و کەمتەرخەمی لێدەکات؛ جا لە گروپی هاوتەمەن و هاوڕێیەکان بگرە تا هاوڕێی خراپ و تێکەڵبوون لەگەڵ خووگرتووەکان و بەکارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەکان؛ کەواتە کێشەی خووگرتن، تەنها کێشەی ئەو تاکە نییە کە ماددە هۆشبەرەکان

بە کار دەهێنێت، بەڵکو کێشەیەکی چەند لایەنەیە کە پەیوەندی بە ((تاك)) و ((کۆمەڵگا))وە هەیە.

پێش هەموو شتێك، کێشەیەکی ((تەندروستی))یە کە پەیوەندی بە لایەنی ((سایکۆسۆماتیکی)) هەیە؛ واتە: کاریگەریی نێگەتیڤی هەیە بۆ سەر هەردوو لایەنی جەستەیی و دەروونی تاکی بەکارهێنەر کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر خێزان و کۆمەڵگاش بە گشتی.

هەروەها کێشەیەکی ((کۆمەڵایەتی)) بەهێزیشە و کار دەکاتە سەر پەیوندییە کۆمەڵایەتییەکان و جۆرەها کێشە و گرفتی تری لێدەکەوێتەوە؛ وەکو: تێکچوونی خێزان، تەڵاق، هەژاری، بێکاری، دزی، خۆکوژی، کوشتنی ژن و منداڵ، قاچاغکردن و تووشی بەندیخانە بوون و...

کێشەی ((ئابووری))، بەشێکی تری کێشەی ماددە هۆشبەرەکانە کە هەم لەسەر تاك و هەمیش کۆمەڵگا کاریگەریی خراپی هەیە.

هەروەها کێشەی ((دەوڵەت و کۆمەڵگا))شە؛ چونکە کۆمەڵگا ناچارە لە جیاتی سەرمایەگوزاری بۆ جۆرەها پرۆژە و پلانی گرنگ و پەرەپێدان و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی و سیاسی و... هتد (وەکو: فێرکردن، تەندروستی، خزمەتگوزاری، پیشەسازی، بازرگانی، گەشتوگوزار و...)، لەسەر نەهێشتن و بەرەنگاربوونەوە و گرتن و دادگایی کردن و بەندکردن و چاکسازی و چارەسەرییان خەرج بکات. ئەوەش بە ڕاستی زیانێکی نەتەوەییە کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەریی نێگەتیڤی هەیە بۆ سەر پرۆسەی پێشکەوتن و ئاستی داهاتی نەتەوەیی و ئاستی خوشگوزەرانی و بژێوی تاکەکان!

ماددە هۆشبەرەکان کێشەیەکی ((یاسایی))شە؛ چونکە یاسای زۆربەی وڵاتان وەکو تاوانێکی گەورە دژ بە کۆمەڵگاوە دەزانن؛ هەم ئەوانەی کە بەکاری دەهێنن، هەم بازرگانان و هەمیش بەرهەم هێنەرانی ئەم ماددانە؛ بۆیە تووشی

بەرەنگاری و ڕووبەڕووبوونەوەی یاسا و سزای توندی کۆمەڵگا دەبن؛ تەنانەت لە هەندێك وڵاتدا لە سێدارەدان و زیندانی هەتاهەتاییان بۆ دانراوە.

کەواتە خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان تەنها کێشەی تاك نییە، بەڵکو چەندین لایەنی هەیە کە هەموو پێکەوە گرێدراون و هەر یەك لەو لایەنانە مەترسی لەسەر ژیانی تاك (واتە لەسەر ورە و چوونیەتی خوگونجاندنی لەگەڵ دۆخی خۆی و خێزان و کۆمەڵگاکەی) و هەمیش لەسەر ژیانی کۆمەڵگا و دەوڵەت و پێشکەوتن و گەشەکردنی وڵات هەیە؛ بۆیە دەبێ تێڕوانینمان سەبارەت بەم کێشەیە، تێڕوانینێکی گشتگیر بێت، هەموو هۆکارەکان ڕەچاو بکەین، گرنگی بە هەموو لایەنەکانی ئەم کێشەیە بدەین؛ چونکە ئەم دیاردەیە زۆر مەترسیدارە، بە تایبەتی ئەگەر درێژە بکێشێ و چارەسەر نەکرێ، لەو کاتەدا زۆر زەحمەتە کونترۆڵی دۆخەکە بکرێ.



ئەم لێکۆڵینەوەیە بەم مەبەستە کە باسمان کرد، ئەنجامدراوە.. هەست بە بۆشایی و نەبوونی توێژینەوەی پێویست سەبارەت بەو کێشەیە کە پشت ببەستێت بە میتۆدی زانستی و ئاکادیمی کە ببنە هۆی تێگەیشتنی زانستییانە و ڕاڤەیەکی دروست و گونجاو لە هەموو لایەنەکانی ئەو کێشەیە لە ژێر ڕۆشنایی واقیع و ژینگەی کوردستان، بوە پاڵنەرێك بۆ خەریکبوونم بەو توێژینەوەیە.

بەم پێیە ئەم بابەتەمان هەڵبژارد و هەوڵمان ئەوە بوە کە سەرەتا لە دوای ناساندنی دیاردەی خووگرتن و مادده هۆشبەرەکان و تاکی خووگرتوو، هەروەها باسکردنی مێژووی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی لە هەموو دونیا بە گشتی و لە عێراق و هەرێمی کوردستانیش بە تایبەتی، هەروەها ناساندنی جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان، باس لەو تیۆرانە بکەین کە تا ئێستا بۆ شیکردنەوەی دیاردەی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان لە لایەن زانایانەوە ـ بە تایبەتی کۆمەڵناسان

ـ پێشکەش کراون و زیاتر جەخت بکەینە سەر ئەوانەی کە دەکرێ لەسەر ژینگەی کوردستان جێبەجێیان بکەین. پاشان باس لەو هۆکارە و زەمینە کۆمەڵایەتییە ـ دەروونییەکانی تووشبوون بەو ماددانەمان کردووە لە سێ ئاستی (ورد و ناوەند و قەبە) لە ژێر ڕۆشنایی ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دیکە، هەروەها ئاکامەکان و ئاسەوارە سلبییەکانی بخەینەڕوو لە هەموو ڕوویەکەوە. لە کۆتاییدا ئەو دەرەنجامانەی کە لە لێکۆڵینەوەکەم بە دەست کەوتوون، لەگەڵ هەندێ ڕاسپاردە و پێشنیاز وەکو ڕێگایەك بۆ چارەسەریی ئەم کێشەیە لە هەرێمی کوردستان لە پێناو ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوە و کۆنترۆڵکردنی، بە کورتی بخەینەڕوو.

هەموو ئەو دەرەنجامانەی کە لە لێکۆڵینەوەکەم بە دەست هاتوون، بە شێوەیەکی زانستییانە و ئاکادیمییانە بوە لە ڕێگای دروست بەکارهێنانی "میتۆدۆلۆژی" کە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خودی توێژەر هەروەها سروشتی ئەو بابەتەی کە لێی دەکۆڵێتەوە. بەم پێیە توێژەر ناچار بوە بە شێوەیەکی مەیدانی سەردانی ئەو خووگرتووانە بکات کە لە شاری هەولێر (زیندانی محەتتە) بەند کراون و یەك بە یەك دانیشتن و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکات و هەموو ئەو پرسیارانەی کە پێشتر ئامادە کرابوون، ئاراستەیان بکات و وەڵامیان لێی وەربگرێت. توێژەر بۆ ئەم مەبەستە سێ ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری (پرسیارنامە، تێبینی کردن و چاوپێکەتن)ی بەکارهێناوە؛ هەروەها ئەو میتۆدانەی کە بۆ لێکۆڵینەوە پشتی پێبەستوە بریتین لە: (ڕوپێوی کۆمەڵایەتیی گشتگیر و شامل) واتە هەموو کەسەکانی تووشبوو بە ماددە هۆشبەرەکانم وەرگرتوە (کە ژمارەی هەموویان تەنها ١٠ کەسی خووگرتوو بوو، کەسانی تریش هەر لەو زیندانە لەسەر ماددە هۆشبەرەکان بەند کرابوون، بەڵام ئەوان خووگرتوو نەبوون و بەڵکو قاچاغچیی ماددە هۆشبەرەکان بوون).. هەروەها سوودم لە میتۆدەکانی تری (لێکۆڵینەوەی بار، بەراووردکاری و مێژوویی)

وەرگرتوە کە سەردانەکانی توێژەر بە شێوەیەکی مەیدانی لە ڕێکەوتی (٢٠٠٩/١٠/١٣) دەست پێکرا و لە (٢٠٠٩/١٢/٢٨) کۆتایی پێهات.

ئومێدمان وایە کە ئەم لێکۆڵینەوەیە وەکو هەنگاوێکی سەرەتایی بێت بۆ هەندێ هەوڵەکان و توێژینەوەی بەرفراوانتر.

**فائیز ئیبراهیم محەمەد**
**مامۆستای کۆمەڵناسی/ کۆلێژی ئەدەبیات**
**زانکۆی سەلاحەددین**

## یەکەم: پێناسەی چەمکی خووگرتن (الإدمان/Addiction):

زانایان ـ هەر یەك بە پشت بەستن بە بواری پسپۆڕیی خۆی ـ پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ چەمکی ((خووگرتن)) کردووە؛ بۆ نموونە:

**١. *خووپێوەگرتن لە دەروونناسیدا:*** چەمکی خووگرتن لە لای دەروونناسان بریتییە لە: خووگرتن و وابەستەیی بە شتێك کە ئاسەواری بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

خووگرتن، پێویستی بە بەکارهێنانی ماددەیەکی هۆشبەرە کە ئەگەر بیەوێ بەکاری نەهینێ و وازبهێنێ، ئەوا هەندێ حاڵاتی تایبەتی بۆ دروست دەبێ کە ناتوانێ بەرگەی بگرێت.

- زیادکردنی ڕێژەی ماددەی بەکارهێنراو لە پێناو دروستکردنی هەمان حاڵەتی یەکەم، کە یەکەم جار بە کاری هێنا بوو.
- بەسترانەوە و وابەستەیی جەستەیی و دەروونی بەو ماددەیە کە دەبێتە هۆی هەوڵدانی بەردەوام بۆ بەدەست هێنانی ئەو ماددەیە.[٤]

**٢. *خووپێوەگرتن لە پزیشکیدا:*** پزیشکەکان لە جیاتی زاراوەی ((خووگرتن)) زیاتر وشەی ((وابەستەیی و بەسترانەوە بە ماددە هۆشبەرەکان)) (Drug dependence) بە کار دەهێنن.[٥] ((وابەستەیی جەستەیی)) بریتییە لە

---

٤. کریم پور، صادق؛ **روانشناسی اعتیاد**؛ چ ١؛ تهران: نشر اندیشه (١٩٩٦)؛ ص٣٦.

٥. العیسوی، د. عبدالرحمن محمد؛ **المخدرات و أخطارها**؛ الأسكندرية: دارالفكر الجامعي (٢٠٠٥)؛ ل٢١.

خوو پێوەگرتنی بەردەوام بە شێوەیەك ئەگەر بیەوێ وازبێنێ ناتوانێت و تووشی سڕبوونەوە و ئێش و ئازارێکی جەستەیی زۆر دەبێت.[٦]

**٣. *پێناسەی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی:*** ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، بەم شێوەیە پێناسەی ((خووگرتن)) دەکات: خووپێوەگرتن بریتییە لە حەز یان بەسترانەوە بە شێوەیەکی ناسروشتی و بەردەوام کە کەسانێك سەبارەت بەهەندێك لە مادە دەیانبێت.[٧]

کەواتە مەبەست لە خووگرتن بەکارهێنانی ناپزیشکییانە و بەردەوامی ئەو دەرمانەیە کە بە زیانی بەکارهێنەرەکە و خەڵکانی تر تەواو دەبێت.[٨]

لە ئەنجامی ئەم پێناسانەی سەرەوە دەتوانین پێناسەی خووگرتن بکەین، بەم شێوەیە: ((خووگرتن بریتییە لە دیاردەیەکی دەروونی – کۆمەڵایەتی کە تاکی بەکارهێنەر بە هۆی کۆمەڵێك پاڵنەری دەروونی و جەستەیی و ژینگەیی بە شێوەیەکی درێژخایەن تووشی دەبێت و دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە خۆی و کۆمەڵگا، هەروەها بەرز بوونەوی ڕێژەی تاوان و کێشەی جۆراوجۆری دەروونی و کۆمەڵایەتی)).

---

٦. فدایی، فربد و سجادیه، د. سید محمد علی؛ **شناخت و پیشگیری و درمان اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: نشر تایماز (١٩٨٦)؛ ل٩.

٧. احمدی، د.سید أحمد؛ **روانشناسی نوجوانان و جوانان**؛ چ ١١؛ اصفهان: انتشارات مشعل (٢٠٠٤)؛ ص١٨٧.

٨. گورین، کوزە؛ **تشخیص بیماریهای روانی**؛ ترجمە: رضا پورأفکاری؛ چ١؛ تهران: انتشارات گنجینە (٢٠٠٠)؛ ص٦.

## دووەم: پێناسەی مادده هۆشبەرەکان (المخدرات/Drugs):

لە دوای ئەوە کە زانیمان خووگرتن چییە، پێویستە بزانین کە ماددەی هۆشبەریش چییە کە دەبێتە هۆی خووگرتنی ئەو تاکانەی کە بەکاری دەهێنن.

بۆ چەمکی مادده هۆشبەرەکان چەندین پێناسەی جۆراوجۆر ـ لە ڕوانگەی جۆراوجۆرەوە ـ هەیە کە لێرە ئاماژە بە هەندێ لەوانە دەکەین:

١. ***مادده هۆشبەرەکان لە ڕووی زمانەوانییەوە:*** بریتین لەو مادانەی کە بە هۆیەوە هۆشی تاك دەڕوات، تووشی بێهۆشی و سڕبوونەوە و هەست نەکردن بە شتی دەوروبەری دەبێت.[٩]

٢. ***مادده هۆشبەرەکان لە ڕووی پزیشکییەوە:*** بریتیە لەو مادەیە کە کار دەکاتە سەر کۆئەندامی دەماری تاك کە دەبێتە هۆی گۆڕان بە سەر هەندی ئەندامی جەستەی مرۆڤـ کە ناتوانێ بە ئەرکی خۆی هەڵبستێ کە پێی دەگوترێ: ((کاریگەریی فیزیولۆژیی)). هەروەها دەبێتە هۆی گۆڕان لە هەندێ تواناکانی بە هۆی کارتێکردن لەسەر کۆئەندامی دەماری، وەکو: هەستکردن، قسەکردن، بیرکردنەوە، خەیاڵکردن و...[١٠]

---

٩. القرغولي، ثامر عبدالهادي؛ **المخدرات (دراسة عامة عن أنواعها و كيفية مكافحتها)**؛ بغداد: (مكان؟ تاريخ؟)؛ ص ٢.

١٠. أبو الروس، أحمد؛ **مشكلة المخدرات و الادمان**؛ ط١؛ الأسكندرية: المكتب الجامعي الحديث (٢٠٠٣)؛ ص١١.

***٣. مادده هۆشبەرەکان بەپێی بۆچونی لێژنەی مادده هۆشبەرەکان لە نەتەوە یەکگرتووەکان:*** لێژنەی مادده هۆشبەرەکان سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان بەم شێوەیە پێناسەی مادده هۆشبەرەکان دەکات: مادده هۆشبەرەکان بریتیە لە هەموو ئەو مادده خاوانە یان دروستکراوانە کە کاتێك بە کار ببردرێت، هەڵوەسە و خەیاڵ یاخود ئارامی و خەو دەهێنێ، نەك بۆ مەبەستی پزیشکی یان پیشەسازیی دیاریکراو، کە دەبێتە حاڵەتی گەڕانەوە و دووبارەکردنەوە و خووپێوەگرتن بە شێوەیەکی بەردەوام یان کاتی کە زیان دەگەیەنێتە تاك و کومەڵگا، هەم لە ڕووی جەستەیی و هەمیش دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە.[١١]

***٤. مادده هۆشبەرەکان لە ڕووی شەریعەتی ئیسلامەوە:*** هەروەك چۆن هەموو یاسا ڕەسمییەکانی جیهانی، مادده هۆشبەرەکان بە شتێکی نائاسایی و نایاسایی لە قەلەم و بە تاوان ژمار دەدەن، زانایانی شەریعەتی ئیسلامیش بە پشت بەستن بە بنەمای پێوانەکردن (واتە پێوانەکردن لەسەر مەی/ قیاس على الخمر) پێیان وایە کە مادده هۆشبەرەکان بە هەموو چەشن و پێکهاتەکانەوە حەرامێکی ئاشکرایە.

زۆر لە کتێبەکانی فیقه ((فقه)) چارەسەری ئەم بابەتەیان کردووە و بە تێروتەسەلی باسیان لە ئەحکامی مەی و ڕووەکەکانی مادده هۆشبەرەکان کردووە؛ لە هەر چوار مەزهەبی سوننە دا.[١٢]

ئەم فەتوا و پێوانەیەش لەسەر بنەمای چەند ئایەتی قورئانە؛ وەکو:

---

١١. الساري، د. سالم و زكريا، د. خضر؛ **مشكلات إجتماعية راهنة: العولمة.. و إنتاج مشكلات جديدة**؛ ط١؛ دمشق: الأهالي للطباعة و النشر و التوزيع (٢٠٠٤)؛ ص٩٨.

١٢. جامع، حامد؛ **المخدرات في رأي الإسلام**؛ ط ١؛ القاهرة: سلسلة البحوث الإسلامية، مجمع البحوث الإسلامية، الأزهر (١٩٧٩)؛ السنة العاشرة؛ الكتاب السابع؛ ص١٧.

• ﴿إنما الخمر و الميسر و الأنصاب و الأزلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون. إنما يريد الشيطان أن يوقع بينكم العداوة و البغضاء في الخمر و الميسر و يصدكم عن ذكر الله و عن الصلاة فهل أنتم منتهون﴾[١٣]

• ﴿يسئلونك عن الخمر و الميسر قل فيهما إثم كبير...﴾[١٤]

**هەروەها چەندین فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)؛ وەکو:**

• ﴿كل مسكر حرام، و ما أسكر كثيره، فقليله حرام﴾[١٥]؛ واتە: ((هەر شتێك كە سەرخۆش بكات، حەرامە و، هەر شتێك كە زۆرەكەی سەرخۆش بكات، ئەوا كەمەكەشی حرامە!)).

• ﴿كل مسكر خمر، و كل خمر حرام﴾[١٦]؛ واتە: ((هەموو سەرخۆشكەرێك مەی دەژمێردرێت و هەموو مەیەكیش حەرامە!)).

• ﴿لُعنت الخمر على عشرة أوجة: بعينها، و عاصرها، و معتصرها، و بائعها، و مبتاعها، و حاملها، و المحمولة إليه، و آكل ثمنها، و شاربها، و ساقيها﴾[١٧]؛ واتە: ((مەی لە دە ڕوویەوە لەعنەت و نەفرین كراوە: خودی مەی، ئەو كەسەی كە دروستی دەكات، ئەو كەسەی كە بە داوایەوە بۆی دروست دەكرێت، فرۆشیار، كڕیار، ئەوەی هەڵیدەگرێت و دەگوازێتەوە، ئەوەی كە بۆی دەگوازرێتەوە، ئەوەی كە پارەكەی دەخوت، ئەوەی كە خودی مەیەكەی دەخوتەوە و، ساقی و ئەوەی كە مەی تێدەكات)).

---

١٣. القرآن الكريم؛ سورة المائدة: الآيتان ٩٠-٩١.

١٤. القرآن الكريم؛ سورة البقرة: الآية ٢١٨.

١٥. بن بدوی، عبدالعظیم؛ **مختصر فقه از قرآن و سنت**؛ ترجمە: عبداللـە محمدی؛ چ١؛ تهران: نشر احسان (٢٠٠٤)؛ ص ٥٩٦.

١٦. جامع؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٧.

١٧. حديث صحيح، رواه إبن ماجه و الترمذي. بڕوانە: بن بدوی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٩٥.

- یاخود فەرموودەی بەناوبانگی: ﴿لا ضرر و لا ضرار فی الإسلام﴾؛ واتە: ((لە ئیسلامدا نە زیان هەیە و نە زیانگەیاندن بە خود و خەڵك هەیە!)).
- یان کاتێك کە لە پێغەمبەر (د.خ) دەپرسن کە ئایا دەکرێ وەکو دەرمان بەکار بهێنرێ، دەفەرموێ: ﴿إنه لیس بدواء ولکنه داء﴾[18]؛ واتە: ((بە راستی شەراب دەرمان نییە، بەڵکو خودی نەخۆشی و دەردە)). یان دەفەرموێ: ﴿لیشبرن أناس من أمتي الخمر یسمونها بغیر إسمها و تضرب علی رؤوسهم المعازف...﴾[19]؛ واتە: ((خەڵکانێك لە ئومەتی من شەراب دەخونەوە و ناوێکی تر لێدەنێن و لەسەریان ئامرازی لەهو و موسیقا لێدەدرێ)).
- بەپێی بڕیاری زانایانی ئیسلامی: ((کل ما یغیب العقل فإنه حرام))[20]؛ واتە: ((هەر شتێك کە ئەقڵ و هۆشی مرۆڤـ ببات، حەرامە)).

بەم پێیە زۆر لە زانایان جۆری ئەو ماددانەشیان دیار کردووە کە کاری نێگەتیڤی دەکەنە سەر لایەنی ((ئەقڵی و هەستی)) مرۆیی، وەکو: "الحطاب" کە زانایەکی مالکییە و دەڵێت: هەموو ئەو شتانە کە ئەقڵ و هۆشی مرۆڤـ دەبات، بەڵام هەستی نابات، حەرامە! وەکو: مەی و (نبیذ) شەراب. هەموو ئەو شتانە کە هەستی مرۆڤـ دەبات و ئەقڵ و هوشی نابات، حەرامە! وەکو: ئەفیون (تریاك و خەشخاش) و جەوزا (جۆرێك لە مادده هۆشبەرەکانە) و بنج (جۆرێك لە حەشیشە) و...[21]

---

١٨. عاشور، أحمد عیسی؛ **فقه آسان**؛ ترجمه: د. محمود ابراهیمی؛ چ١؛ تهران: نشر احسان (١٩٩٧)؛ ص٥٧٤.

١٩. هەمان سەرچاوە؛ ل٥٧٢.

٢٠. إبن تیمیة، تقي الدین؛ **الفتاوی الکبری**؛ ج٤؛ ط ٥؛ بیروت: دار القلم (١٩٩٨)؛ ص٢٦٦.

٢١. اداره کل مطالعات و پژوهشهای ستاد مبارزه با مواد مخدر؛ **بررسی مواد مخدر در متون اسلامی**؛ چ١؛ تهران: مرکز چاپ و نشر سازمان تبلیغات اسلامی (١٩٩٥)؛ ص١٤٩.

**"إبن تيميه" دەڵێت: حەشیش و هەموو ئەو ماددانەی کە وەکو حەشیشن، حەرامن جا سەرخۆش بکات یان نەکات و هەر کەس بە حەلالی بزانێ، کافرە ![22]**

**لەم دواییەدا، فەتوای ((دار الإفتاء المصرية)) سەبارەت بە مادده هۆشبەرەکان دەرکراوە، گوزارشت لە حەرامکردنی هەموو جۆرە ماددەی هۆشبەر دەکات، هەم بەکارهێنانی، هەم بازرگانیکردنی، هەمیش چاندن و بەرهەمهێنانی.[23]**

**کەواتە مادده هۆشبەرەکان ـ بە هەموو جۆر و پێکهاتەکانەوە ـ لە ڕووی یاسای ڕەسمی و ناڕەسمی بە شتێکی تاوان و گوناه و قەدەغەکراو دەناسرێت.**

---

٢٢. ابن تیمیه؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٦٠.

٢٣. جامع؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣.

## سێیەم: پێناسەی چەمکی خووگرتوو (المدمن/Addict):

((خووگرتوو)) ئەو کەسەیە کە لە ڕووی دەروونی و جەستەییەوە وابەستە بە یەکێك لە مادده هۆشبەرەکان دەبێت.[٢٤]

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، بەم شێوەیە پێناسەی ((خووگرتوو)) دەکات: ((خووگرتوو ئەو کەسەیە کە بە هۆی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان یا خود دەرمانێکی کیمیایی بە شێوەیەکی بەردەوام تووشی خووپێوەگرتن و وابەستەبوون دەبێت.[٢٥] هەروەها لەو پێناسەیە دا، بەکارهێنەرەکانی مادده هۆشبەرەکان (وەکو: توتن، مەشروباتی ئەلکهۆلی، تریاك، حەشیش، هرۆیین و ال. اس. دی و...) بە تاکەکانی ناسروشتی و لادەر ناو دەبات)).[٢٦]

---

٢٤. فدایی و سجادیە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٩.

٢٥. دانش، تاج زمان؛ **مجرم کیست؟ جرم شناسی چیست؟**؛ چ ١٠؛ تهران: انتشارات کیهان (١٣٨٤)؛ ص٢٦٧.

٢٦. ستوده، د. هدایت الله؛ **آسیب شناسی اجتماعی**؛ چ٢؛ تهران: انتشارات آوای نور (٢٠٠٥)؛ ل١٨٨.

## چوارەم: تاكی خووگرتوو چۆن دەناسرێتەوە؟:

هەندێ نیشانە و پێوەر هەن كە تاكی خوگرتوو لە تاكی ساغ و سروشتی جیادەكاتەوە. زۆر جار خودی خووگرتوو داندەنێت كە خووگرتووە و پێویستی بە ماددەی هۆشبەر هەیە، بەڵام بە هۆی هەندێ گۆڕانكاریی دەروونی و جەستەیی و كۆمەڵایەتی و ڕەفتاری تیایدا، دەتوانین بزانین كە ئەو تاكە خووگرتووە و تاكێكی ئاسایی نییە! كەواتە بۆ ناسینەوەی تاكی خووگرتوو بە تایبەت نەوجەوانان و لاوان، ڕێگای جۆراوجۆر هەیە كە ـ بە پشت بەستن بە زۆر لەسەرچاوەكان ـ بە كورتی پۆلێن و ریزبەندیان دەكەین:

### *أ. ناسینەوە لە ڕووی شڵەژانە دەروونی و ڕەفتارییەكان:*

شڵەژانە ڕەفتارییەكانی تاك، پێكهێنەری كەسایەتیی خوگرتووە. ناسینی كەسایەتی و تایبەتییەكانی ڕەفتاری خووگرتووان بۆ بەرەنگاربوونەوەی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەكان و پێشگیری لێكردنی، گرنگی خۆی هەیە. خووگرتن چەندین گۆڕانكاری لە ئاكار و خووی خووگرتوو بەدی دەهێنێت كە لە ڕواڵەتییەوە هەستی پێ دەكرێت:

**١. درۆكردن:**

زۆر قسەكردن، درۆكردن، وادەی زۆری بێ بنەما، یەكێك لە نیشانە هەرە گرنگەكانی خووگرتووانە؛ چونكە بەكارهێنانی ماددە هۆشبەرەكان لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە نەشیاو و لە ڕووی یاساییشەوە بە تاوان ناسراوە؛ بۆیە ئەو تاكانە ئامادە نین وەڵامی پرسیارە جۆراوجۆرەكان بدەنەوە؛ وەك: لە كوێ بووی؟ چیت خواردووە؟ پارەت هەیە؟... وەڵامی ڕاستت نادەنەوە.

**٢. نەبوونی ئاکار وخوی جێگیر:**

بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە کاتی دیاریکراوی شەو و ڕۆژ دەبێتە هۆی ئەوە کە تاك وەك کەسێکی ئاسایی نەتوانێت ڕەفتار بنوێنێت لە میوانداری و گەڕان لەگەڵ کەسانی تردا. هەوڵ دەدات بۆ بەکارهێنانی ئەو ماددانە شوێنێکی تەنیا ببینێتەوە؛ بۆیە مێوانداری و سەیرانەکانی بە نیوەچڵی بەجێ دێڵێت و، ئەگەر هاتوو تووشی ناکامی بوو لەم ڕێگەیەدا، تووشی هەڵەپاسی دەبێت؛ وەها حاڵەتێك کاتێك دەگاتە لوتکەی خۆی کە تاك بە دوای دابینکردنی ماددە هۆشبەرەکاندا بڕوات و بە دەستبەتاڵی بگەڕێتەوە.

**٣. گۆڕانی کاتی خەوتن و شەوخوونییە دووبارەبووەکان لەگەڵ کەسانی دیاریکراو:**

تاکی خووگرتوو شەوان درەنگ دەخەون و بەیانیان درەنگ لە خەو هەڵدەستن. ناسینی کەسانێك کە خۆی حەزیان لێدەکات و دانیشتن لەگەڵیان تا درەنگانێکی شەو تاکی خووگرتو تووشی سەرەئێشان، دڵتێکهەڵاتن، ڕشانەوە و بێهێزی یان هەندێك باری وەك پێکەنین و گریانی بێهۆ دەکات.

**٤. جوڵانی بێهۆ و پەنامەکی (شاراوە) لە ماڵ وشوێنی کار:**

تاکی خووگرتو بە شێوەیەکی ئاسایی حەزیان لەسەر دەرهێنان لە کاروباریان نییە لە لایەن خەڵکەوە و، هەمیشە هەوڵی دەدەن ئامراز و پێداویستییەکانیان لە خەڵکی بشارنەوە.

**٥. گۆشەگیری ودورەپەرێزی:**

حەز بە گۆشەگیری و دوورکەوتنەوە لە خزمان بە تایبەتی لە دایك و باوك، برا و خوشك و، بە پێچەوانەوە حەز لە نزیکبوونەوە و تێکەڵبوون لەگەڵ برادەری

نوێ و گوماناوی و نەناس دەکات. ئەو کەسەی خووگرتووە کەمتر حەزی لە پەیوەندی دروستکردنە لەگەڵ کەسانی تەندروست و دیاریکراو. هەر ئەو کارە بۆتە هۆی ئەوەی ئەوان حەزیان لە ژیانێکی تەندروست نەبێت. ئەو کەسانە لە مێواندارییە درێژخایەنەکانیش بەشداری ناکەن.

**٦. دەرچوون لە ماڵ بە تایبەتی دوای نیوەڕۆیان:**

بۆ دەرچوون لە ماڵەوە کەسە خووگرتووەکان بەڵگەی تایبەت دەخەنە ڕوو؛ چونکە بۆ بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر، پێویستیان بە شوێنێکە لە دەرەوەی ماڵ. نزیکەی (٦٠٪ تا ٧٠٪)ی خووگرتووان نۆرەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە کاتی دوا نیوەڕۆیان دادەنێن.

**٧. بەرز بوونەوەی خەرجی ڕۆژانە و خستنە ڕووی مەسرەفە خەیاڵییەکان:**

بەرزبوونەوەی خەرجی ڕۆژانە و داواکردنی پارە بە شێوەیەکی بەردەوام لە دایك و باوك و خەڵکانی تر، وا لە تاکی خووگرتوو دەکات کە بۆ دابینکردنی پارەی ماددە هۆشبەرەکان، ناچار بن هەندێ مەسرەفی زیادە بخەنە سەر لیستی مەسرەفە واقعییەکان، یان داوای پارە دەکەن بۆ مەسرەفی بە درۆ تاکو پارەی باخەڵیان بەشی ئەو ماددانە بکات.

**٨. هاوڕێیانی گومانلێکراو و کەسانی نەناسیاو:**

دۆستایەتی کردنی کەسانێك کە پێشینەی دزی یان بەندکردنیان هەیە و ڕوویەکی کۆمەڵایەتی باشیان نییە، لە نیشانەکانی ئەو کەسانەیە. ئەو نەوجەوانانەی کە هاتووچۆی کەسانێکی خووگرتوو دەکەن، بێگومان وەك ئەوانن.

**٩. دزی کردن:**

ئەو کەسانە لەبەر ئەوەی لە بارێکی ئابووریی خراپدان، لەسەرەتای خووگرتنیان پارەی ماڵەوە دەدزن، دراوسێکانی، دۆستان یان دزینی پارەی کەسانی نەناس.

**١٠. داخستنی دەرگا لەسەر خۆی بۆ ماوەیەکی درێژ:**

تاکی خووگرتوو بۆ ماوەیەکی درێژ دەرگا لەسەر خۆی دادەخێت بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە حاڵەتەکەی بشارێتەوە لە خەڵك.

**١١. حەزنەکردن لە سەفەری دوور:**

سەفەرکردنە دوورەکان سەنگی مەحەکە بۆ ناسینەوەی کەسانی خووگرتوو؛ چونکە هەڵگرتنی ماددەکان کارێکی گرانە و لە لایەکی ترەوە لە ڕێگاکان و شوێنی پشکنینەکان ڕەنگی دەموچاویان دەگۆڕێت و پۆلیس دەیانناسنەوە.

**١٢. لە ماڵەوە مانەوە :**

لە هەندێك شوێن کە پرۆژەی خڕکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە لایەنی هێزەکانی ئاسایشەوە لە ئارادایە، کەسانی خووگرتوو ناچارن لە ماڵەوە بمێننەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر نەهێنە دەرەوە.

**١٣. زۆربوونی هاتووچۆی گوماناوی و دەرچوون لە ماڵەوە بۆ سەردانی شوێنە تایبەتییەکانیان:**

کەسی خووگرتو زۆر هاتووچۆی گوماناوی و بێمانایان هەیە و بۆ دابین کردنی ماددە هۆشبەرەکان لە کاتی پێویست و یان لە کاتێك لە شوێنێك مێوانن، ڕوو دەکەنە شوێنە دیاریکراوەکان؛ بۆیە لاوانی خووگرتوو ئاگایان لەو شوێنانەیە

که مادده هۆشبەرەکانی تێدا دابیندەکرێت، لەم بارەیەوە ڕاوبۆچوونی پسپۆڕیان هەیە.

**١٤. هەستیاربوون بەو باسانەی کە دەکرێن لە بارەی خووگرتنەوە:**

کەسانی خووگرتوو لە باسەکانی مادده هۆشبەرەکان هەوڵ دەدەن بابەتی باسەکە بگۆڕن یان لەو باسانەی کە لەبارەی وازهێنانە لە مادده هۆشبەرەکان، ئەو وازهێنانە بە شێوەیەکی کاتی بخەنە ڕوو.

**١٥. بەشداری نەکردن لە ڕێوڕەسمە کۆمەڵایەتی وکولتوورییەکان:**

بە شێوەیەکی ئاسایی لاوانی خووگرتوو کەمتر لەو دانیشتنانەدا دەردەکەون و هیچ حەزیان لەو جۆرە باسانە نییە.

**١٦. بەقەرزوەرگرتنی پارە لەخەڵك:**

بۆ دابینکردنی ئەو ماددانە بە بیانوی جیاواز، پارە لە دۆستان و ناسیاوان قەرز دەکەن، یان کەرەستەکانی خۆیان بە کەمتر لە نرخی خۆیان دەفرۆشن.

**١٧. شڵەژانی دەروونی:**

خوگرتوو کەسێکی بێ ئارام، خۆپەرست، هەڵچوو، تووڕەیە و فشار و دڵەڕاوکێی پێوە دیارە، کە بە شێوەیەکی لەناکاو دەگۆڕێت بە سەرخۆشی و هێمنی و ئارامییەکی ئاشکرا. خەمۆکی لەگەڵ شادمانی و خۆشییەکی زۆر کاتی، لە لای خووگرتووان زۆر دەبینرێ.

**١٨. نەبوونی هەستی بەرپرسیاریەتی و پابەندبوون:**

تاکی خووگرتوو بە هۆی نەبوونی بەرپرسیارییەتی و چاوەڕوانیی زۆر لە خەڵك بە تایبەتی لە دەوروبەری خۆی، ژیانێکی نائەخلاقیی هەیە و گرنگی بە هیچ پابەندییەك نادەت؛ وەکو: گرنگی نەدان و فەرامۆشکردنی پیشە و کار و خۆدزینەوە لە ئەرکەکان، بە تایبەتی کارە جەستەییەکان، گرنگی نەدان بە یاساکانی کۆمەڵگا، گرنگی نەدان بە بنەما ئایینییەکان، گرنگی نەدان بە بنەما خێزانییەکان و...

**١٩. گازاندەی زۆر لە خەڵك:**

تاکی خووگرتوو بە شێوەیەکی بەردەوام گازاندە و ڕەخنە لە خەڵك و لە کۆمەڵگا و لە یاسا دەگرێت وەکو، میکانیزمێکی بەرگری و بەرهەڵستکاری بە شێوەیەك کە تاکەکانی کۆمەڵگا بە تاوانبار و بەرپرسیاری نەهامەتییەکەی دەزانێت.

***ب. ناسینەوە لە ڕووی شڵەژانە جەستەیی و فیزیۆلۆژییەکان:***

تاکی خووگرتو لە ڕووی شڵەژانی جەستەیی و فیزیۆلۆژییەوە خاوەن تایبەتمەندین کە ئەم بار و تایبەتمەندییە لە کەسانی تەندروستدا نابینرێت. ئەو جۆرە بارانە لە ڕواڵەت یان دەروونداا دەردەکەون؛ وەکو:

**١. ڕواڵەتی لاوی خووگرتوو:**

خوگرتوو خاوەن لەشێکی لاواز و ڕەنگێکی زەرد و بەساڵاچوو و ڕەشی هەیە و ددانەکانی ـ بەردەوام ـ ڕزیو و ڕەش و زەردە و، گرنگی بە ڕواڵەت و جوانی و خاوێنیی خۆی نادەت. هەروەها دەکرێ لە ڕووی هەبوونی پرچی تێکەل و پێکەڵ، جل و بەرگی پیس، ڕەشهەڵگەڕانی لێوەکانی، چرچ و لۆچبوونی

دەموچاوی و چاوی زەقبووی و ڕوومەتی قووپاو، دەکرێت لە نیشانەکانی ئەو کەسانە بێت.

**٢. خورانی جەستە:**

بە شێوەیەکی ئاسایی نیوکاتژمێر لە دوای بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، خورانی گشتی جەستە دەست پێدەکات، کە زیاتر لە لای پێیەکاندایە؛ بە تایبەتی ڕان و لووت کە لەوانەیە ئەم بارە ٣ـ٤ کاتژمێر بخایەنێت.

**٣. لاوازی سێکسی:**

کەسانی خووگرتوو بە تایبەتی پیاوان، تووشی لاوازی سێکسی دەبنەوە، ئەگەر هاتوو هاوسەریان هەبێت، هیچ حەزیان ناچێتە کاری سێکسی لەگەڵیان.

**٤. کەمبوونەوەی خواردن:**

خووگرتن خواردن کەم دەکاتەوە؛ بە تایبەتی خووگرتووان لە خواردنی نانی بەیانی، شیر، ئایس کریم، ترشییەکان خۆیان دەپارێزن؛ چونکە ئەم خواردنانە دەبنە هۆی لەناوچوونی باری بێهۆشی کە لە دوای بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دروست دەبێت.

**٥. دروستبوونی ئێش و ئازار لە گەدە:**

ئاڵوودەبوو بە مادده هۆشبەرەکان تووشی برینی گەدە و هەوکردنی دەبێ؛ بۆیە زۆربەیان حەبی ژانی گەدەیان پێیە بۆ لابردنی ئێش و ئازاری.

**٦. قەبزبوون و مانەوەی زۆر لە ئاودەست:**

بەکارهێنەرانی مادده هۆشبەرەکان تووشی قەبزی بەردەوام دەبن؛ بۆیە ماوەی مانەوەیان لە ئاودەست درێژە دەکێشێ.

**٧. دروستبوونی سستی و بێتاقەتی:**

خووگرتن بە ڕادەیەکی زۆر لە تواناکانی لاوان کەم دەکاتەوە؛ بە شێوەیەك ئەگەر وەرزشکار بێت، ئیتر حەزی لە یاری نامێنێت و ناچێتە یانەی وەرزشی.

**٨. ئاوچۆرکێ لە لووت، پژمین و باوێشك:**

ئەگەر ڕۆژانە خووگرتوو (١-٢) کاتژمێر لە وادەی خۆی دوابکەوێ، تووشی باوێشکی درێژدرێژ و ئاوهاتنەخوارەوە لە لووت و پژمین دەبێت.

**٩. لاوازی لاشەیی:**

خووگرتوو بە بێ ئەوەی یاری وەرزشی ئەنجام دابێت، لە ماوەی یەك یان چەند مانگێك (٥) کیلۆ کەم دەکاتەوە.

**١٠. هەبوونی حاڵەتی توڕەیی و پووچبوونەوە:**

لە بەر ئەوەی زۆربەی خووگرتووان بەیانیان درەنگ لەخەو هەڵدەستن، لە دوای بەخەبەرهاتنیان بارێکی پووکاوە و توڕەییان هەیە.

**١١. نەدانی خوێن بۆ تاقیکردنەوە و تێستکردن:**

بۆ ئەم کارە هەراسان دەبن و دوای دەخەن هەتاکو لە کاتی نەخۆشیشدا ئامادەی خوێن لێوەرگرتن نین.

**١٢. گۆڕانی گلێنەی چاو:**

گلێنەی چاوی مرۆڤی ساغ جێگیرە، بەڵام گلێنەی چاوی خووگرتوو لە دوای بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان بچووك دەبێتەوە؛ بۆیە گلێنەی چاویان دەگۆڕێت و خۆیان لە ڕووبەڕووبونەوەی ڕاستەوخۆ دەپارێزن.

**١٣. گۆڕانی دەنگ:**

گڕبوونی دەنگی خووگرتوو یەکێکە لە نیشانەکانی. ئەم گڕبوونە لە دوای بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەردەکەوێ.

**١٤. بوونی شوێنەواری دەرزی لێدان لەسەر جەستە:**

ئەو کەسانەی ئاڵوودەی مۆرفین و هیرۆیین و مادده هاوشێوەکانی بوون، بە گشتی لە دەستی چەپیان شوێنەواری دەرزی لێدانی ماددەکان دەبینرێت؛ چونکە ئەنجامی ئەم کارە بە دەستی ڕاست ئەنجام دەدرێت.

**١٥. ئارەقە کردن:**

بە شێوەیەکی ئاسایی لە دوای (٣) کاتژمێر لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان خووگرتوو هەست بە گەرما دەکات، ئەگەرلاچی هەوا ساردیش بێت.

***ج. ناسینەوەی لە ڕووی ئەو کەرەستانەی بەکاریان دەهێنن:***

لە ڕووی ئەو شت و کەرەستانەی گەنج سوودی لێوەردەگرێت و سەروکاری لەگەڵیاندا هەیە، دەتوانین هەست بە خووگرتن و تەنانەت جۆری ئەو ماددانەش کە بەکاری دەهێنێت، ببەین؛ وەك:

**١. خواردنەوە چای زۆر و پڕ لە ڕەنگ:**

لە دوای بەکارهێنانی ماددەکان خووگرتوو پێویستی بە پەرداخێکی پڕ ڕەنگ و داغ هەیە. هەندێکیشیان تریاك لە چایەکەدا شیدەکەنەوە دوای دەیخۆنەوە. چاخواردنەوەیان شێوەیەکی ئاسایی نییە.

**٢. هەبوونی شت و ئامرازی تایبەتی تریاککێشان:**

چەند شتێکی وەك کاغەزی ئەلمینیۆمیی پاکەتی جگەرە، لوولەی قەڵەم جاف، موس و سرنج لە ناو باخەڵیان یان شوێنی کاریان دەتوانێت بەڵگە بێت بۆ خووگرتن.

**٣. هەبوونی هەندێك دەرمانی تایبەت:**

کەسانی خووگرتوو ئەو دەرمانانەیان لایە کە هەڵگری بەشێکی کەم لە ماددەی هۆشبەرن؛ لەوانە شروبی ئیسپێکتورانت کودئین، حەبی دیفنوکسیلات و ئیستامینوفین کودئین و... تا لەکاتی پێویست بەکاری بێنن لە جیاتی ماددە هۆشبەرەکان.

**٤. بەکارهێنانی هەندێك لە دەرمانە خەوهێنەرەکان:**

خووگرتوان چەند حەبێکی دیازپام یان لورازپام لە لایە تاکو بتوانن بخەون.

**٥. نوێنەکردنەوەی بڕوانامە پێویستەکان وگرنگ لە لایەن خووگرتووان:**

چونکە نوێکردنەوەی بەڵگەکانی مۆڵەت پێویستی بە تاقیکردنەوەی خوێنە، ئەمەش کارێکی دژوارە بۆ خووگرتووەکان.

**٦. ئەو ئامرازانەی کە ماددەکانی تێدا دەشارنەوە:**

عەلاگەی نایلۆن و پلاستیکی موشەممایان لایە بۆ پاراستنی ماددەکان.

**٧. ئامادە کردنی سرەنجی (5) سی سی بۆ دەرزی لێدان:**

هەندێك لە ماددە هۆشبەرەکان پێویستیان بە سرنجی ٥ سی سی هەیە بۆ بەکارهێنانینان؛ وەکو هیرۆیین.

**٨. سوودوەرگرتن لە هەندێك عەتر و کولۆنیای توند لە کاتی دەرچوون لە دانیشتنەکانیان:**

بۆ لادانی ئەو بۆنەی کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان دروست دەبێت، پێویستییان بەو بۆنانە هەیە.

**٩. بەکارهێنانی قەترەکانی چاو وەك (فنیل ئەفرین، نەفتازۆلین):**

چونکە خووگرتووان ئەوانەی ماددەی حەشیش و بەنگ بەکاردەهێنن، بۆ لادانی سوورهەڵگەڕانی چاویان پێویستیان بەو جۆرە قەترانەیە.

**١٠. کڕینی هەندێك کەل وپەل:**

ئامادەکردنی ڕەژوو بە قەبارەو بڕی دیاریکراو یەکێکە لە پێداویستییەکانی تریاك کێشان. جۆرە تایبەتەکەشی ناوی (ڕەژووی جاکسۆن)ـە.

**١١. سوودوەرگرتن لە لاستیکە پلاستیکییەکان بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان:**

**ئەوان دەرکەی شوشەیی کون دەکەن بە هەڵکێشان بە لوولەی قەڵەم جاف و سوودی لێوەردەگرن، یان بۆ دەرزی لێدان لە جیرەکان یان گۆرەوییە تەنکەکان بۆ بەستنی شادەمار سوود وەردەگرن.**[٢٧]

---

٢٧. اکبری، د. ابوالقاسم؛ **مشکلات نوجوانی و جوانی**؛ چ ٣؛ تهران: نشر رشد و توسعه (٢٠٠٦)؛ صص ٢٤٢-٢٤٦ ــ گنجی، ایوب؛ **مواد مخدر، جوانان و اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: نشر احسان (٢٠٠٣)؛ صص ٣٥-٣٧ ــ ستوده، د. هدایت الله ـ بهاری، د. سیف الله؛ **آسیب شناسی خانواده**؛ چ١؛ تهران: انتشارات ندای آریانا (١٣٨٦)؛ ص ١٣٥ ــ فرجاد، د. محمد حسین؛ **آسیب شناسی اجتماعی و جامعه شناسی انحرافات**؛ چ ٣؛ تهران: دفتر تحقیقات و انتشارات بدر(١٣٨٣)؛ ص ١٤٧ ــ رعدی، منوچهر و دیگران؛ **راهنمای پیشگیری از اعتیاد (ویژه خانوادەها)**؛ چ٤؛ سنندج: معاونت امور فرهنگی و پیشگیری سازمان بهزیستی کردستان (٢٠٠٣)؛ صص ٢٥-٢٧ ــ رعدی، منوچهر و دیگران؛ **راهنمای پیشگیری از اعتیاد (ویژه دانش آموزان دبیرستان)**؛ چ٤؛ سنندج: معاونت امور فرهنگی و پیشگیری سازمان بهزیستی استان کردستان (٢٠٠٥)؛ صص ١٥-١٨ ــ ستوده؛ **آسیب شناسی اجتماعی**؛ ل١٩٠ و١٩١ ــ سید احمد أحمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٧٦.

## دەستپێك:

بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان مێژوویەکی قووڵی هەبوە لە نێوان کۆمەڵگاکان و بەپێی بەڵگەکان لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانییەتە کۆنەکان لەسەر زەوی هاوکات بوە. هەروەها بەپێی کۆمەڵگاکانیش جۆرەکان و شێوازی بەکارهێنانیش جیاواز بوە. دەبینین کە ماددە هۆشبەرەکان بە درێژایی مێژووی مرۆیی، هەندێ جار وەك ماددەیەکی خۆراکی و هەندێ جاریش وەك دەرمان و، هەندێ جاریش بۆ چێژوەرگرتن و بەسەربردنی کاتێکی خۆش، یاخود پشتکردنە خەم و خەفەت و لەناوبردنی ئێش و ئازارەکان و سارێژکردنی برینەکان بەکارهاتووە؛ بۆیە بە درێژایی مێژوو، کەمتر کۆمەڵگایەك دەبینرێ کە ئەم جۆرە ماددانە تێدا بەکار نەهێنرا بێ.

بەڵام مێژووی بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان و دیاردەی خووگرتن بۆ مەبەستی داگیرکاری و کۆلۆنیالیزم و لەناوبردنی وڵاتانی ڕۆژهەڵات، لە چەند سەدەی کۆتایی بەکارهێنراوە و ئەم ئاگرەش وایکردووە دواجار خۆیانیشیان بسوتێنێ و تیایدا هاوار بکەن.[٢٨]

لێرەدا هەوڵ دەدەین کە زۆر بە کورتی باس لە مێژووی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان یەکەمجار لە دونیا و دواتر لە هەرێمی کوردستانی خۆمان بکەین، کە چۆن و بە چ شێوەیەك بوو، کە گەنجەکانمان تووش کراون و وڵاتمان خستوەتە ناو ئەم مەترسییە دا:

---

٢٨. فتح الباب، حسن و عياد، سمير؛ **المخدرات سلاح الإستعمار و الرجعية**؛ ط ١؛ القاهرة: دارالكاتب العربي للطباعة و النشر (١٩٦٧)؛ ص ١٨.

## یەکەم: مێژووی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان و کێشەی خووگرتن لە دونیا:

لەوحە قوڕاوییەکانی (٧٠٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا (واتە ٥٠٠٠ ساڵ پێش زایین) پیشان دەدەن کە سومەرییەکان لە کۆنترین نەتەوەن کە ڕووەکی خەشخاشیان چاندووە و تریاکیان بەکار هێناوە وەکو دەرمانێك بۆ ئازارەکانیان؛ بە شێوەیەك کە ناوی "ڕووەکی شادیبەخش"یان لەسەر دانابوو کە تا ئێستاش بەو ناوە بە ناوبانگە.[٢٩]

هەروەها پزیشکە ئاشورییەکانیش (٧٠٠) ساڵ بەر لە دایکبوونی مەسیح (د.خ) ڕووەکی خەشخاشیان ناسیوە و وەکو دەرمان بەکاریان هێناوە. نووسینە شوێنەوارییەکانیش باس لەوە دەکەن کە خەشخاش لە (٤٠٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا لە بابل و میسر و ڕۆم و یۆنان بەکارهاتووە؛[٣٠] بۆ نموونە: هەندێ جەڕ کە هی (١٥٠٠) ساڵ پێش زایینە (واتە ٣٥٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا) لە قوبرس دروست کراون، کە بۆ ڕاگرتنی تریاك بەکار هاتوە و بۆ میسر دەیاننارد.[٣١]

ئەو دەستنووسانە کە لەسەر پاپیروسەکان لە میسر بەجێ ماون، ئەوە پیشان دەدەن کە میسرییەکانیش لە مێژە کە ئاشناییان لەگەڵ بەکارهێنانی تریاك هەبوە. لە کتێبی "سینوهە" ـ کە پزیشکی تایبەتی فیرعەونی میسر بووە

---

٢٩. کوهن، آلن؛ **فرهنگ مواد مخدر**؛ ترجمه: حسن حاج سید جوادی؛ چ١؛ تهران: نشر سعید محبی (١٩٩٤)؛ ص ١٨.

٣٠. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٢٣.

٣١. نیّر، حسین؛ **فرهنگ عمومی مواد مخدر**؛ چ١؛ تهران: ناشر: مؤلف (١٩٩٣)؛ ص٩.

له (١٣٥٠) ساڵ بەر له زایین ـ باس له بەکارهێنانی تریاکی کردووه له کاتێ کێشانی ددانی پاشای بابل به ناوی "بورابوریاش".[٣٢]

یونانیەکانیش لەسەردەمی "سوکرات" به گرنگییه پزیشکییەکانی تریاك ئاشنا بوونه و بۆ سارێژکردن و ئارامکردنەوەی ئێشەکان و دژه ژەهر و گەزەندی دەعبەکان به تایبەتی ژەهری مار، بەکاریان دەهێنا؛ تا ڕادەیەك که ناوی "ئەپیۆم" یان تریاك ببوو به یەکێك له خواکانی یونانییەکان که هێما و سەمبۆلی خوای خەو بوە.[٣٣]

هەروەها ڕووەکی شاهدانه که حەشیش یان کانابیز لێیوەردەگیرێ، نزیکەی (٢٧٠٠) ساڵ بەر له زایین (واته ٤٦٠٠ ساڵ لەمەوبەر) له لایەن پزیشکه چینییەکانەوه بەکار هاتووه بۆ دەرمان و چارەسەری نەخۆشییەکان. ئیمپراتوری چین به ناوی "شان نێنگ" له کتێبی دەرمانەکانی خۆی له ساڵی (٢٧٣٧ پ.ز) باسی لەو دەرمانه کردووه، بەڵام باس لەوەش دەکات که بەکارهێنانی ئەو دەرمانه به ڕادەیەکی زۆر، دەبێته هۆی خووپێوەگرتن و کاریگەریی خراپ لەسەر مێشك.[٣٤] له "شوسرونا" ـ کتێبی ئایینی هیندییەکانیش ـ پێش ١٠٠٠ ساڵ بەر له دایکبوونی مەسیح، باسی حەشیش کراوه وەکو دەرمانێکی پزیشکی.[٣٥] له کتێبی "ئەڤێستا"ش ـ کتێبی ئایینی زەردەشتییەکان ـ باس له کانبیز کراوه، وەکو ماددەیەکی بێهۆشکەر.[٣٦]

---

٣٢. والتاری، میکا؛ **سینوهه پزشك مخصوص فرعون**؛ ج ١؛ ترجمه: ذبیح الله منصوری؛ چ ٥٣؛ تهران: انتشارات زرین (٢٠٠٧)؛ ص٢٠٨.

٣٣. اورنگ، جمیله؛ **پژوهشی درباره اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی (١٩٩٩)؛ ص ٦.

٣٤. طه، احمد علي؛ **المخدرات بين الطب و الفقه**؛ ط ١؛ القاهره: دار الإعتصام (١٩٨٤)؛ ص ١٩.

٣٥. شاکرمی، عبدالحسین؛ **مواد مخدر و اعتیاد**؛ تهران: انتشارات میر (١٩٩١)؛ ص ٢٣.

٣٦. هەمان سەرچاوە؛ ل ٤٣.

ئەلکهۆل لە کۆنترین ماددە هۆشبەرەکانە کە مرۆڤ بە درێژایی مێژوو تا ئێستاش بەکاری هێناوە. "چین" یەکەم کۆمەڵگا بوە کە لە پرۆسەی تەخمیرکردنی جۆرەها خواردەمەنی ئاگادار بووە؛ وەکو: برنج و پەتاتا و گەنم و جۆ. دواتر مەشروباتی ئەلکهۆلی لە هەندێ بۆنە ئایینیە کۆمەڵایەتییەکانی چینی بەکارهاتووە وەکو: قوربانیکردن بۆ خواکان و جەژنی سەرکەوتن لە شەڕەکان.[٣٧] مێژوونوسان لەو باوەڕەدان کە ئەوەندە بەڵگە بەدەستەوەیە کە بیرە و شەراب، لانی کەم (٥٠٠٠) ساڵ پ.ز بەرهەم هاتوون. هەر لەو کاتەوە شوێنێکی دیاریکراویان هەبووە لە بۆنە و ئاهەنگە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکاندا و هەتا ئێستاش هەر هەیانە لە بۆنەی لەدایکبوون، مردن، زەماوەند، تاج لەسەرنانی پاشایان و جەژنەکاندا. بەڵگەی ئەوە بە دەستەوەیە کە (٥٠٠٠) ساڵ پ.ز لە میزۆپۆتامیا باڕ و مەیخانە هەبووە. بەڵگەکان دەسەلمێنن کە بیرە بەشێك بوە لە کرێی ڕۆژانەی ئەو کرێکارانەی کە لە پەرستگای "وەرکا" کاریانکردووە. هەر زوو شارستانییەتە کۆنەکان هەستیان بە لایەنە خراپەکانی خورادنەوەی ئەلکهۆل کردووە؛ حامورابی لە ساڵی (١٧٧٠)ی پ.ز لە بابل یاسایەکی دەرکرد بۆ سنوردانان بۆ خواردنەوەی ئەلکهۆل؛ ئەو یاسایە بە کۆنترین یاسای سنوردانان دادەنرێت بۆ خواردنەوە لە مێژوودا کە ئەم یاسایە هەروەك یاساکانی ئەمڕۆ کات و شوێنی فرۆشتن و خواردنەوەیان دیاریکردبوو.[٣٨]

مەجارستان (هەنگاریا) یەکەم وڵاتی ئەوروپی بووە لەگەڵ تریاك ئاشنا بووە، کە لەگەڵ تووی گەنم و کەتان و نوك لە ناو ئەو وڵاتە چاندراوە. پزیشکانی ئەوروپای سەدەی ناوەڕاست لەگەڵ تریاك و تایبەتمەندییە دەرمانییەکانی ئاشنا

---

٣٧. سويف، مصطفى؛ **المخدرات و المجتمع نظرة تكاملية**؛ الكويت: سلسلة عالم المعرفة، المجلس الوطني للثقافة و الفنون و الآداب (١٩٩٦)؛ ص٢٨.

٣٨. مەلا کەریم، عەتا؛ **دەرمان و ماددە سڕکەرەکان**؛ چ١؛ بریتانیا (٢٠٠٥)؛ ل ١٤.

بووه و بۆ سارێژکردنی ژان و برینەکان بەکاریان هێناوە.[39] لە مێژووی ئیسلامدا ئیبن سینا و زەکەریای ڕازیش لە سوودەکانی تریاك بۆ مەبەستی پزیشکی ئاشنا بوونە و زۆر بەکاریان هێناوە.[40] ئیبنی سینا لە کتێبی بەناوبانگی خۆی بە ناوی ((القانون فی الطب)) دەڵێت: تریاك ماددەیەکی هۆشبەر و کوشەندەیە. ئەبوریحان بیرونی یەکەم کەس بوە کە زانیویە تریاك وەکو ئەلکهۆل ماددەیەکی هۆشبەرە و خووگرتن دروست دەکات و هەروەها یەکەم کەس بوە کە باس لە دیاردەی (تەحەمول/ Tolerance) کردووە.[41] حەشیش و بەنگ و شاهدانە لە لایەن تاتار و مەگۆڵ (مەغۆل) لە دوای داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلامی لە لایەنیانەوە، بڵاو بووەوە تاکو دواتر هەندێ لە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە وەکو "حەسەن صەباح" ـ سەرۆکی شیعە ئیسماعیلیەکانی ئێران ـ بۆ مەبەستی سیاسی و شۆڕشگێری بەکاریان هێناوە کە لە مێژووی ئیسلامدا بە ناوی ((الحشاشون)) بەناوبانگن.[42] حەسەن سەباح لە ئێران ـ لە قەڵاتی ئەلەموتی نزیکی شاری قەزوێن ـ هەندێ موریدی هەبوە کە بۆ لەناوبردن و تیرۆرکردنی دوژمنەکانیان بە هۆی بەکارهێنانی حەشیش سەرخۆش دەبوون و هەر کارێك کە پێیان ڕاسپێردرابایە، بە شێوەیەکی سەرسوورهێنەر ئەنجامیان

٣٩. برقی، محمد؛ **از میکده تا ماتکده اعتیاد (جامعەشناسی ابعاد فقهی ـ اجتماعی اعتیاد)**؛ چ ٢؛ تهران: نشر احسان (٢٠٠٥)؛ ص ٥٩-٦٠.

٤٠. مورتەزەوی، عەلی؛ **قاچاغی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان و یاسای نێونەتەوەیی**؛ وەرگێڕانی: ب. مانی؛ چ١؛ هەولێر: بنکەی توێژینەوە (٢٠٠٧)؛ ل١٩.

٤١. رزاقی، عمران محمد و دیگران؛ **ارزیابی سریع وضعیت سوء مصرف مواد در ایران**؛ ج١؛ چ١؛ تهران: سازمان بهزیستی کشور، معاونت امور فرهنگی و پیشگیری (٢٠٠٣)؛ ص ٦ ــ کاوشی، علی؛ **تاریخچە اعتیاد در ایران و جهان**؛ مەقالەی ئینتەرنێتی لە سایتی آفتاب: http://www.aftab.ir

٤٢. بڕوانە: لویس، برنارد؛ **الحشاشون فرقة ثورية في تاريخ الإسلام**؛ ترجمة: محمد العزب موسى؛ ط ٢؛ القاهرة: مكتبة مدبولي (٢٠٠٦).

دەدا.[43] لەسەردەمی "سەفەویدا" ـ کە شیعەی ئیمامی بوون ـ کێشانی ماددە هۆشبەرکان زیادی کرد و لە ماوەی ٢٢ ساڵ فەرمانڕەوایی شاکانی سەفەویدا، کێشانی تریاك، حەشیش و خواردنەوەی شەراب لە ئێراندا بە شێوەیەك پەرەی سەند، کە بەرهەمی ناوخۆیی نەیتوانی پێویستی داخوازیکارەکان دابین بکات.[44]

"کۆلۆمبۆس" لە گەشتەیەکدا بۆ ئەمریکا لە ساڵی (١٤٩٢) دا توتنی هێنایەوە کە دواتر لە ساڵی (١٥٨٦)دا لە لایەن "والتەر رالێی" گەیەندرایە بەریتانیا و لەوێشەوە بۆ سەرتاسەری جیهان بڵاو بوەوە.[45]

هەر وەکو دیتمان بەکارهێنانی تریاك و ماددە هۆشبەرەکان لە کۆمەڵگانی پێشوودا بۆ مەبەستی پزیشکی و بە هۆی پزیشکانەوە سوودی لێ وەردەگیرا، بەڵام لە دوای سەدەی (١٦)ی زاییندا لە دوای زانینی ئاسەوار و تایبەتمەندییەکانی ئەو ماددانە، هەندێ وڵاتانی ئەوروپی کە مێژوویان پڕە لە سیاسەتی داگیرکارانە، بە شێوەیەکی ڕەسمی دەستیان بە چاندنی ماددە هۆشبەرەکانیان کرد،[46] تاکو پاشای بەریتانی لە سەدەی ١٦ دا (واتە هێنری هەشتەم) سزای ئەو جووتیارانە داوە کە گیای کانبیز ناچێنن![47] بەم شێوازە بوو کە سیاسەتی وێرانکەرانەی بەریتانیاییەکان لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات دەستپێکرا کە یەکەم پێشەهەنگی ئەم بڵاوکردنەوە کۆمپانیایەکی بەریتانی بوو بە ناوی "کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات" کە لە ساڵی (١٧٧٥)دا بە شێوەیەکی تایبەت و ئینحصاری، بازرگانی دەرەکیی تریاکی لە نێوان هیند و بەریتانیا بەدەستەوە گرت. ئەم کۆمپانیایە بە سەرمایەیەکی زۆر پەرەی دا بە چاندنی ڕووەکی

---

٤٣. بڕوانە: آمیر، پول؛ **خداوند الموت**؛ ترجمە ذبیح الله منصوری؛ چ ١٥؛ تهران: سازمان انتشارات جاویدان (١٩٩٠).

٤٤. مورتەزەوی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٠.

٤٥. عەتا مەلا کەریم؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٥.

٤٦. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٦٠-٦١.

٤٧. عەتا مەلا کەریم؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٥.

خەشخاش لە سەواحلی ڕووباری گەنگ، دۆلی ناوەندی بەنگال، وولایەتی پەنجاب و دواتر لەسەرتاسەری هیندستان و سەواحلی ڕۆژئاوای هیندوچین.

هاوکات لەگەڵ ئەم پرۆسەیە، نووسەران و پزیشکەکان و سیاسەتمەدارانی بەریتانی و فەرەنسی بۆ بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی مادده هۆشبەرەکان لە نێوان خەڵکی ڕۆژهەڵاتدا پرۆپاگەندەی هەمەلایەنەیان بڵاوکردەوە. بۆ نمونە: "سێر جان مۆر" ژنەراڵێکی بەریتانی لە هیندستان دەڵێت: تریاك بۆ خەڵکی برسی و هەژاری هیندی زۆر باش و بەکەڵکە؛ چونکە بە هۆیەوە برسێتی و هەژاری لە بیر دەکەن و بە سەریدا زاڵ دەبن! "توماس کوێن سی" نووسەری بەریتانی دەڵێت: تریاك سفرەیەکی ئاسمانییە! تاکو دەگاتە ئەو ئاستە کە پزیشکێکی فەرەنسی بە ناوی "د. کورتێری" نامەی دوکتورای خۆی لە وەسفکردنی تریاك دەنووسێ و زۆر لایەنگیری لێی دەکات![٤٨]

لە دوای زۆربوونی بەرهەمەکانی تریاك لە لایەن ئەو کۆمپانیایەوە، کۆمپانیاکە بازاڕێکی پڕ لە سوود کە ئەویش وڵاتی چین بوو دۆزییەوە. تریاك وەکو لافاوێك لە نێو خەڵکی چین بڵاو بووەوە بە شێوەیەك کە لە ساڵی (١٧٩٦)، (٦٥٦٤) سندۆقی تریاك هاتە ناو وڵاتی چین. تەنها نرخی سوودەکانی ئەو کۆمپانیایە لە ساڵی (١٨٢١) دا بریتی بوو لە ١٥,٥٣٨,١٦٠ دولار![٤٩] لە ئەنجامی ئەو بڵاوبوونەوە، دوو جەنگی مێژوویی لە نێوان چین و بریتانیا لە ساڵانی (١٨٣٩–١٨٤٢) کەوتەوە کە بە ناوی "جەنگی تریاك" بە ناوبانگە.[٥٠]

لە ساڵی (١٧٥٩) مافیا لە ئیتالیا دروست بوو کە لەسەرەتادا بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بوو و لایەنگیری و پشتگیری لە خەڵك و جەماوەر کردووە، بەڵام لە

---

٤٨. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦١.

٤٩. هەمان سەرچاوە؛ ل٦٢.

٥٠. هەمان سەرچاوە؛ ل٦٣.

دوای ساڵی (١٨٦٠) مافیا لە ڕێبازی خۆی لایداوە و بووەتە ڕێکخراوێکی تیرۆریست و دژ بە مرۆڤایەتی و تالانکەر،[٥١] تاکو ئەم ڕێکخراوە لەلایەن "موسولینی"ەوە لە ناو بردراوە و زۆربەی کاربەدەستانی ئەم ڕێکخراوە پەنا دەبەنە ئەمریکا و لە ساڵی (١٩٢٨) بە سەرۆکایەتی "ئالن کاپۆن" جارێکی دیکە لە شاری شیکاگو دەست بەکار بوونەوە و لە ساڵی (١٩٥٢) دەسەڵاتی وڵاتی کوبای بە سەرۆکایەتی "باتیستا" وەرگرتووە.* بەڵام لە ساڵی (١٩٥٩) بە شۆڕشگێری "ڤیدل کاسترو" ڕێکخراوی مافیا و دەسەڵاتی باتیستا لەناو چوو و ڤیدل کاسترو خۆی بووە سەرۆکی کوبا. لەو کاتەوە تا ئێستا بەڵگەکان دەڵێن کە مافیا لەگەڵ دەزگای CIA (سی ئای ئێی) ئەمریکا هاوکار بووە و لە جیاتی تریاك لە دوای دۆزینەوەی "هرۆیین" ــ کە لە وەرگیراوەکانی تریاکە و زۆر لە تریاك مەترسیدارترە ــ دەستیان بە بڵاوکردنەوەی "هرۆیین" کردووە. تاکو وڵاتانی دونیا ناچار بوون بەرامبەر بە ڕێکخراوی مافیا و بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان حەساسییەت پیشان بدەن و چەندین کونفرانسی جیهانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان و قاچاغچییە مافییەکان، پەیماننامەی هاوبەش ئیمزا بکەن.[٥٢]

لە دوای دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان چەندین کۆبۆنەوە لەسەر ماددە هۆشبەرەکان ئەنجامدرا کە لە ساڵی (١٩٦١) بە ئامادە بوونی زۆر لە وڵاتانی دونیا پەیماننامەیەکی تایبەت بە ماددە هۆشبەرەکانی لێکەوتەوە و بۆ ئەم مەبەستە لێژنەیەکیان پێکهێنا بە ناوی "لێژنەی نێونەتەوەیی ماددە

---

٥١. البریزات، جهاد محمد؛ **الجریمة المنظمة (دراسة تحلیلیة)**؛ ط١؛ عمان: دار الثقافة (٢٠٠٨)؛ ص ١٠٧.

* نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە لە دوای شۆڕشی پیشەسازی و هەر دوو شەڕی جیهانی یەکەم و دووەم کە جگە لە وێرانی و زیانی مرۆیی و ماددی، زۆر لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی نوێ سەر هەڵدان کە زەمینەی پەنابردن بە ماددە هۆشبەرەکان زۆر خۆشتر و بازاڕی مافیاکانیش پڕسوودتر بوو.

٥٢. هەمان سەرچاوە؛ ل ٦٤-٦٥.

هۆشبەرەکان". لە ساڵی (١٩٨٨) پەیماننامەیەکی دیکە دژی قاچاغی نایاسایی مادده هۆشبەرەکان و تاوانی نیشتمانی و هاوکاری و بەشداریی نێونەتەوەیی ئیمزا کرا کە بە دوایین پەیماننامە لە قەڵەم دەدرێ.[٥٣]

ئێستاش چەندین دامەزراوەی سەرەکی و لاوەکی تایبەت بە مادده هۆشبەرەکان هەین کە سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانن وەکو:

١. **کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان:** کە دەزگایەکی یاسادانەرە و بڕیارنامەکان و پرۆتۆکۆلەکان و پەیماننامەکان و دیاریکردنی بودجەی پێویستی لە ئەستۆیە.[٥٤]

٢. **ڕێکخراوی کۆنتڕۆڵی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان (UNDCP):** ڕێنوێنیکردن و کۆنتڕۆڵی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان و چاودێری ڕەوتی بەرهەمهێنان، قاچاغکردن و بەکارهێنانیان دەکا.[٥٥]

٣. **کۆمیسیۆنی مادده هۆشبەرەکان:** کە دیار دەکات چ دەرمان و ماددەیەك بخرێتە پێڕستی مادده هۆشبەرەکان یان پێڕستێکی دیکە.[٥٦]

ئەمڕۆکە سەرجەمی وڵاتانی جیهان بە کێشەی مادده هۆشبەرەکانەوە سەرقاڵن و ئەنجام و کاریگەرییە خراپەکانی ئەم دیاردە مەترسیدارە کارێکی وای کردووە کە دەوڵەتان بەپێی هەلومەرج و بارودۆخی خۆیان، لەگەڵ پەیماننامە نێونەتەوەییەکاندا هاوهەنگاو بن و بەرنامەی کۆنتڕۆڵکردنی بڵاوکردنەوە و داخوازی مادده هۆشبەرەکان، خووگرتن و خراپ بەکارهێنان و خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان بخەنە بەرنامەی کاری خۆیانەوە و هەر وڵاتێك بونیاد و ڕێکخراوی خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان دابمەزرێنن و کار و بارە

٥٣. مورتەزەوی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٦.

٥٤. هەمان سەرچاوە؛ ل ٢٩.

٥٥. هەمان سەرچاوە؛ ل ٣٠.

٥٦. هەمان سەرچاوە؛ هەمان لاپەڕە.

پەیوەندیدارەکان بخرێتە چوارچێوەی پەیماننامەکان و بە سەرنجدان بە یاسای ناوخۆیی و سێنترالْ جێبەجێ بکرێ.[٥٧]

بەلاّم سەرباری ئەو هەولاّنەی دراون، گرنگترین کێشەی ولاّتانی جیهان لە ئاستی نیشتمانیدا، زیادبوون و چوونە سەری ئامارەکانی خووگرتووەکانە! با لێرە سەیری ئەو ئامارانەی خوارەوە بکەین کە لە لایەن ڕێکخراوی "نووسینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مادده هۆشبەرەکان و تاوان"* لە ڕێکەوتی (٢٠٠٩/٦/٢٦) بلاّوکرایەوە و بە دوایین ڕاپۆرتی جیهانی سەبارەت بە مادده هۆشبەرەکانەوە دەژمێردرێت کە لە (٣١٤) لاپەڕە پێکدێت:

- ئێستا (٢١١) ملیۆن کەس لەسەرتاسەری جیهان بەشێوەیەکی ڕێکخراو مادده هۆشبەرەکان بەکاردێنن؛ واتە: (٣.٤٪) لە سەدی دانیشتوانی جیهان یان (٤,٧٪) دانیشتوان لەسەرووی تەمەنی (١٥) سالْی.
- لە نێوان ئەمانەشدا زیاتر لە (٢٨) ملیۆن کەس بە بەردەوامی کێشەیان هەیە و تووشی جۆرەها نەخۆشی بوونە و پێویستیان بە چاودێری پزیشکی و تەندروستی بەردەوام هەن.
- (١٦٦.٥) ملیۆن کەس لە بەرهەمەکانی حەشیش و ماریجوانا بەکاردەهێنن کە زۆرترین ڕێژەی مادده هۆشبەرەکان دەگرێتەخۆ.
- (٣٣,٥) ملیۆن کەس ماددەی خەیالْساز و کۆمەلْی ئامفتامینەکان (کە تەنیا نزیکەی ١١ ملیۆن کەس بەکارهێنەری حەبی ئۆکستاسی).
- (١٨) ملیۆن کەس ماددەکانی کۆمەلْی ئەفیونی (کە تەنیا نزیکەی ١٠ ملیۆن کەس بەکارهێنەری هیرۆیین).

---

٥٧. هەمان سەرچاوە؛ ل ٣٧.

* (UNODC / المكتب الأمم المتحدة المعني بالمخدرات و الجريمة) کە سەرۆکی تەنفیزی ئەم نووسینگەیە "أنطونيو ماريا كوستا" یە.

- (١٨) ملیۆن کەسیش ماددەی بزوێنەر و چالاککەرەوە بە کار دەهێنن (کە تەنیا زیاتر ١٤ ملیۆن کەس بەکارهێنەری کۆکایین).
- نزیکەی (٢١) ملیۆن کەس لە (١٤٨) دەوڵەتەوە لە ڕێگای لێدانی دەرزی ماددەی هۆشبەر وەردەگرن کە زیاتر لە (٦) ملیۆن کەس لەوان تووشی ڤایروسی ئایدز (HIV) بوونە.[٥٨]

58. United Nations Office on Drugs and Crime (UNODC), op.itc, PP.20-25.

هەروەها بڕوانە: المكتب الأمم المتحدة المعني بالمخدرات و الجريمة؛ **التقرير العالمي عن المخدرات**، خلاصة وافية؛ نيويورك (٢٠٠٩)؛ ص ١١-١٧.

**ئەم خشتەیە ئاماری بەکارهێنەرانی مادده هۆشبەرەکان لەسەرتاسەری دونیا بەپێی ئاماری ڕەسمی UNODC* نیشان دەدات:**

| جۆری ماددەی هۆشبەری بەکارهێنراو | کەمترین ڕێژە | بەرزترین ڕێژە | ڕێژەی ناوەندی |
|---|---|---|---|
| هەموو مادده هۆشبەرەکان | ١٧٢,٠٠٠,٠٠٠ | ٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠ | ٢١١,٠٠٠,٠٠٠ |
| ماریجوانا یان حەشیش | ١٤٣,٠٠٠,٠٠٠ | ١٩٠,٠٠٠,٠٠٠ | ١٦٦,٥٠٠,٠٠٠ |
| ئامفیتامینەکان و دەرمانە کیمیاوییەکانی | ١٦,٠٠٠,٠٠٠ | ٥١,٠٠٠.٠٠٠ | ٣٣,٥٠٠,٠٠٠ |
| کۆمەڵی چالاککەرەوەکان | ١٦,٠٠٠,٠٠٠ | ٢٠,٠٠٠,٠٠٠ | ١٨,٠٠٠,٠٠٠ |
| کۆمەڵی تریاک | ١٥,٠٠٠,٠٠٠ | ٢١,٠٠٠,٠٠٠ | ١٨,٠٠٠,٠٠٠ |

---

* ئەم ژمارانە لەگەڵ یەکتر کۆ ناکرێنەوە؛ چونکە لەوانەیە هەندێ لەو خووگرتووانە، چەند ماددەیەك هاوکات لەگەڵ ماددەی تر بەکار ببات.

## دووەم: مێژووی سەرهەڵدان و بڵاوبونەوەی مادده هۆشبەرەکان و ڕەوشی کێشەی خووگرتن لە عێراق و هەرێمی کوردستان:

### ١. ڕەوشی مادده هۆشبەرەکان لە عێراق (مێژووی سەرهەڵدان، چۆنیەتی بڵاوبوونەوە، ئامارەکان):

دوایین ڕاپۆرتی نووسینگەی بەرەنگاربوونەی مادده هۆشبەرەکان سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان (مكتب مكافحة المخدرات التابع للأمم المتحدة) باسی لەوە کردووە کە وڵاتی عێراق ئێستا بۆتە یەکێك لە وڵاتانی بەرهەمهێنەر و هەناردوو (مصدِّر)ی مادده هۆشبەرەکان، کەچی پێش لە ساڵی (٢٠٠٣) بەپێی ڕاپۆرتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان عێراق یەکێك لە پاکترین وڵاتانی جیهان بووە لە ڕووی مادده هۆشبەرەکانەوە. ئەم ڕاپۆرتە کە لە (٢٠٠٩/٦/٢٣) لە دوای کۆبۆنەوەی جیهانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی مادده هۆشبەرەکان دەرکراوە، ئاماژەی بەوە کردووە کە عێراق لە دوای ساڵی (٢٠٠٣) بۆتە وڵاتێکی بەکاربەر (المستهلك) و هەناردوو (المصدر)ی مادده هۆشبەرەکان بە شێوەیەك کە ژمارەی خووگرتووەکان گەیشتوە بە نزیکەی ٢ ملیۆن کەس. ئەم ڕاپۆرتە درێژەی بەوە داوە کە عێراق وەکو: ١) وێستگەیەك هەروەها ٢) ترانزیت دەژمێردرێت بۆ ناردنەدەرەوەی مادده هۆشبەرەکان بۆ وڵاتانی دەوروبەری خۆی بە تایبەتی وڵاتانی کەنداو (خليج)؛ ئەویش لە دوو ڕێگای سەرەکی: ١) لە ڕێگای سنووری ڕۆژهەڵات لەگەڵ ئێران، کە باندە قاچاغچییەکانی عێراقی و ئێرانی بەکاری دەهێنن ٢) لە ڕێگای ئاسیای ناوەندییەوە بۆ کوردستان، کە

باندە قاچاغچییەکانی ئاسیای ناوەندی و کوردستانی بەکار دەهێنن. ئەم ڕاپۆرتە باسی لەوەش کردووە کە وڵاتی ئێران بە بنکەی سەرەکی دەژمێردرێت بۆ هەموو وڵاتانی دەوروبەر بە تایبەتی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.[٥٩]

نەخشەی خوارەوە نیشاندەری ڕێگای هاتوچوو و ترازیت و ترافیکی ماددە هۆشبەرەکانە (بە تایبەتی حەبی "کپتاگون" کە یەکێك لە ماددەکانی کۆمەڵی ئەمفیتامینەکانە) کە عێراق و هەرێمی کوردستانیشی دیارکردووە:

59.Ibid. (p130).

هەروەها بڕوانە:

- ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط)؛ **مكتب مكافحة المخدرات التابع للأمم المتحدة: العراق أصبح محطة رئيسية لتهريب المخدرات إلى دول الخليج وأوروبا الشرقية**؛ لە سایتی الشرق الأوسط: http://www.aawsat.com.

ـ گۆڤاری (صحف)؛ **العراق يصدر المخدرات للمنطقة كلها**؛ لە سایتی مجلة صحف: http://so7f.com/

ـ سایتی (عراق الغد)؛ لە ژێر ناونیشانی : **الأمم المتحدة: العراق أصبح الممر الرئيس لتجارة المخدرات عبر العالم**: http://www.iraqoftomorrow.org

ـ گۆڤاری (الأسبوعية)؛ **خريطة المخدرات في العراق**؛ لە سایتی المنتدى العراقي: http://www.iraqiforum.net/vb

ئەم وێنەیە *ڕێگای ترافیك و ترانزیتی مادده هۆشبەرەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

1. Trends in the world drug markets Amphetamine-type stimulants market

**Map 19: Notable Near and Middle East Trafficking Routes of Amphetamines-group Substances**

Sources: Lebanon Drug Enforcement Central Bureau, presentation at the Working Group Meeting on Captagon Smuggling to the Middle East Region, Beirut, Lebanon (December 2008); Turkish National Police, Department Of Anti-Smuggling and Organized Crime (KOM), presentation at the Working Group Meeting on Captagon Smuggling to the Middle East Region, Beirut, Lebanon (December 2008); Policies Achievements Ongoing programs and Future Plans. Drug Control Headquarters Islamic Republic of Iran (Tehran, 2008); World Customs Organization (WCO), Customs and Drugs Report 2007 (June 2008).




**Fig. 88: Captagon (amphetamine) tablets reported in the Near and Middle East, with selected countries[12]: 1998-2007**

Source: UNODC, Annual Report Questionnaire Data/DELTA; Government reports.




**European amphetamine seizures continue to grow**

Historically, global amphetamine manufacture and trafficking have been concentrated in Europe. Considering amphetamine and non-specified amphetamines together,[13] since 1990, there has been an increase in combined amphetamine and non-specified amphetamines seized in Europe, with a total of 8.9 mt for 2007.

Over the last decade, 10 European countries have accounted for more than 90% of seized amphetamine and non-specified amphetamines in Europe, and 38% of global seizures. The United Kingdom intercepts the most amphetamine in Europe. Since 1998, the UK has seized a total of 17.8 mt. The Netherlands in 2007 reported the largest single year seizure total (2.9 mt) of any European country in the last decade.

12 Although seized, not all countries provide seized tablet data in units, therefore this should be viewed as the minimum number of tablets seized. In some cases Member States report seized tablets already converted in kilograms, often using unknown transformation ratios (if any). When tablets/ pills/ doses are reported to UNODC, a standard transformation ratios of 30 mg per dose of psychoactive ingredient for amphetamine of methamphetamine is used.

13 Very little methamphetamine is reported in Europe, and it can be assumed that "non-specified amphetamines" are amphetamine. Tableted ATS with an imprinted logo without forensic confirmation is likely reported as "ecstasy" by law enforcement.

---

* United Nations Office on Drugs and Crime (UNODC), op.cit., (p131).

هۆكار و چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەكان لە عێراق بە گشتی دەتوانین لەو خاڵانەی خوارەوە كورت بكەینەوە:

**أ. هەڵوەشانەوەی بونیادی كۆمەڵگای عێراقی لە دوای رووخانی ڕژێمی بەعس:**

ئێمە وەكو كۆمەڵناسێك باش لە ئەنجامەكانی شەڕ و تێكچوونی دەوڵەت و بێسەروبەریی كۆمەڵایەتی و هەڵوەشانەوەی یاسا ڕەسمییەكان و پێوەرە كۆمەڵایەتییەكان و سەرهەڵدانی كێشە كۆمەڵایەتییەكان و... ئاگادارین. كاتێك وڵاتێكی وەكو عێراق چەندین ساڵ تووشی شەڕی چەكداری ببوو، هەشت ساڵ لەگەڵ ئێران، دواتر لە ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ كوێت، ئەوجا تووشی ئابلۆقەی ئابووری بوو، پاشان لە ساڵی ٢٠٠٣ شەڕی ئەمریكا و هاوپەیمانان بۆ جاری دووەم دەستی پێكردەوە و رژێمی بەعس رووخا و دەوڵەت نەما و ئەمریكا دەستی بە سەر ئەو وڵاتەدا گرت. لەو كاتەوە عێراق، لە هەموو ڕوویەكەوە تووشی جۆرەها كێشەی سیاسی و ئەمنی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و كولتووری و تەندروستی بووەتەوە كە زۆر زەحمەتە كۆنترۆڵ و چارەسەر بكرێن. هەموو ئەو كێشانە، بە پاڵپشتی یەكتر هەندێ كێشەی نوێتر بەرهەم دەهێنن كە ڕێژەی كێشەكان و نەخۆشییەكان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەكات و بۆ خەڵكی كۆمەڵگا بارێكی قورس و گران بەجێ دەهێڵێت كە دەوڵەتی داگیركەر و ئەو دەوڵەتە نوێیەش ناتوانن برێك لە باریان سووك بكەنەوە؛ بۆیە خەڵك بە تایبەتی گەنجان تووشی جۆرەها نەهامەتی و بەدبەختی و نەخۆشی دەروونی بوون كە زەمینەی تاكەكەسی بۆ تووشبوون و وێلبوون بە دوای شتێك یان دەرمانێك دەرەخسێنێ كە لەم واقیعە تاڵە دووریان بكاتەوە و ڕزگاریان بكات، كە ئێمە بە درێژایی ئەم توێژینەوەیەمان لەسەر ئەم بابەتە دەدوێین، بەڵام پێویستە كەمێك لەو ئامارە فەرمییە ترسناكانەی خوارەوە ورد بینەوە:

١) یەك ملیۆن بێوەژن لە عێراق هەیە. (ئاماری ڕەسمی دەرکراو لە وەزارەتی ئافرەتان لە ساڵی ٢٠٠٨).

٢) ٤ ملیۆن منداڵی بێباوك هەن. (بەپێی ئاماری وەزارەتی پلان دانان).

٣) ٢,٥٠٠,٠٠٠ شەهیدی عێراقی هەیە. (بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی تەندروستی و پزیشکی یاسایی-**الطب العدلي**- تا مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨).

٤) ٨٠٠,٠٠٠ کەسی عێراقی بزر و بێ سەروشوێن کراون. (بەپێی ئاماری وەزارەتی ناوخۆ تا کانونی یەکەمی ٢٠٠٨).

٥) ٣٤٠,٠٠٠ بەندکراوی عێراقی هەن لە زیندانەکانی عێراق و کوردستان. (بەپێی ئامارەکانی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی عێراقی و عەرەبی و جیهانی و نەتەوە یەکگرتووەکان)، کە تەنها ١٢٠,٠٠٠ بەندکراو لە زیندانەکانی ئەمریکی هەن بەپێی وتەی خۆیان.

٦) ٤,٥٠٠,٠٠٠ کۆچکەر و پەنابەری عێراقی لە دەرەوەی عێراق هەیە. (بەپێی ئامارەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پاسپۆرتەکان کە داوای پاسپۆرتی "ج"یان کردووە).

٧) ٢,٥٠٠,٠٠٠ کەسی بیانی لە عێراقدا دەژین. (بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی پانابەران).

٨) ٧٦,٠٠٠ کەسی تووشبووی بە نەخۆشی ترسناکی ئایدز لە عێراق هەیە، کەچی پێش داگیرکاری ئەمریکی ١١٤ حاڵەت هەبوون. (بەپێی ئامارە ڕەسمییەکانی وەزارەتی تەندروستی).

٩) ڕێژەی تەلاق لە ناو خێزانی عێراقی ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندان. (بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی تەندروستی).

١٠) ٤٠٪ی خەڵکی عێراق لە ژێر هێڵی هەژاری دەژی. (بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی مافی مرۆڤ).

١١) لەناوچوونی هەمەلایەنەی ژێرخانی ئابووری لە عێراق. (بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی پلان دانان).

١٢) دابەزینی ئاستی خوێندن لای قوتابیانی بنەڕەتی و زانکۆ. (بەپێی ئامارەکانی ڕێکخراوی یۆنسکۆ).

١٣) هەبوونی نزیکەی ٥٥٠ حیزب و کیان و لایەنی سیاسی لە عێراق. (بەپێی ئامارەکانی "مفوضية الإنتخابات العامة المستقلة".

١٤) هەبوونی ١١,٤٠٠ ڕێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی لە عێراقدا کە زۆربەیان نەناسراون و کەس لە چۆنیەتی تەمویلکردن و ئامانجە ئاشکرا و نهێنییەکانیان نازانێ. (بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی).

١٥) ٤٣ میلیشیای چەکداری سەر بە پارتە سیاسیەکانی عێراقی هەن. (بەپێی ئامارە تۆمارکراوەکانی وەزارەتی ناوخۆ، بەشی لیژنەی دەمجی میلیشیاکان).

١٦) ٢٢٠ ڕۆژنامە هەن کە لە لایەن دەزگا موخابراتییەکانی بێگانە تەمویل دەکرێن. (بەپێی ئاماری سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقی).

١٧) ٤٥ کاناڵی تەلەفزیونی ئاسمانی هەن کە لە لایەن دەزگا موخابراتییەکانی بێگانە تەمویل دەکرێن. (بەپێی وتەی ئیدارەی قەمەر سناعی نایلسات و عەرەبسات).

١٨) ٦٧ وێستگەی ڕادیۆ هەن کە لە لایەن دەزگا موخابراتییەکانی بێگانە تەمویل دەکرێن. (بەپێی وتەی دەستەی ڕاگەیاندن و تەرەددوداتی عێراقی).

١٩) دەیان هەزار شەهادەی ساختەی خوێندنی باڵا هەن کە لە لایەن بەرپرسان و زوبات و کارگێڕان و کادرە حیزبییەکان هەن کە پۆستی سیاسی و قیادیان وەرگرتووە. (بەپێی ئامارەکانی دەستەی نەزاهە).

٢٠) گەندەڵی سەرتاپاگیری ئیداری وماڵی و ئەخلاقی و سیاسی. (بەپێی ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی شەفافییەتی نێودەوڵەتی).[٦٠]

٢١) ڕێژەی (٤٠,١٪)ی گەنجانی عێراقی حەزیان لە کۆچکردنە بۆ دەرەوە لەو ڕێژەیەش (٩٠٪)ی ئەوان زۆر بە متمانەوە داوا دەکەن و لەپێناو گەیشتن بۆ ئەم ئامانجەیان هەوڵ دەدەن. (بەپێی دەرەنجامەکانی ڕوپێوی کۆمەڵایەتی کە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هەولێر و وەزارەتی پلان دانانی عێراق لە بەغدا و سندوقی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ نیشتەجێبوون (UNFPA) و پرۆژەی عەرەبی بۆ تەندروستی خێزان لە کۆمەڵی نێودەوڵەتی عەرەبی لە ١٥ نیسان تاکو ١٠ أیاری ٢٠٠٩، ئەنجامدراوە کە تیایدا دەردەخات ڕێژەی سەدی کۆی گەنجانی عێراقی بریتیە لە (٤٠٪) و لە هەرێمی کوردستان بریتییە لە ٣٧٪).

٢٢) ڕێژەی بێکاری لە عێراق بریتییە لە (٤٦,٢٪)، لەنێو ئەمانەدا (٣٠,٢٪) پیاوانی سەرووی ١٥ ساڵ بێکارن و، (١٦٪) کچی سەرووی ١٥ ساڵ بێکارن؛ لە کۆی ئەم ڕێژەیەش کە زۆربەی هەرە زۆریان توێژی گەنجان و ئەوانەی کە تازە خوێندنیان تەواو کردووە. (بەپێی ئەنجامەکانی ئەو ڕوپێوە کۆمەڵایەتییەی کە لە لایەن وەزارەتی پلان دانان بە هاوکاری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی عێراقی ئەنجامدراوە).[٦١]

**هەموو ئەم ئامارانە گوزارشت لە "ئانۆمیی کۆمەڵایەتی" هەمەلایەنە لە هەر سێ ئاستی: تاك (ورد) و خێزان (ناوەندی) و کۆمەڵگا (قەبە) دەکەن کە دەبێتە**

---

٦٠. نشرة كنعان الإلكترونية، لە ژێر ناونیشانی: **"إحصائيات رسمية مخيفة و مفجعة"**؛ السنة التاسعة، العدد ١٩٧٣" عن الموقع: http://kanaanonline.org ـــ هەروەها سایتی المحيط شبكة الإعلام العربية: http://www.moheet.com/.

٦١. بڕوانە: موقع العراق للجميع، لە ژێر ناونیشانی: **"الأمم المتحدة : الشباب العراقي لا يهتم بالسياسة ويطمح للهجرة"** لە سایتی: http://www.iraq4all.org ـــ هەروەها شبكة أخبار العراق، لە سایتی: http://www.aliraqnews.com.

هۆی بەرزبوونەوەی کێشە و لادانە کۆمەڵایەتییەکان لە ناو کۆمەڵگادا کە دواتر لە بەشەکانی دیکەی ئەم لێکۆڵینەوەیەمان، بە پشت بەستن بە تیۆرەکانی کۆمەڵناسی بە تایبەتی تیۆری "ئانۆمیی کۆمەڵایەتی" بە تێروتەسەڵی باسی لێ دەکەین.

**ب. بازرگانە ئێرانییەکان:**

لە دوای دروستبوونی ئەو فەوزا و بارودۆخە نائەمنییەی کە لە دوای شەڕی عێراق، هەر وەك "د. فلاح المحنة" ـ ئەندامی دەستەی نیشتمانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە عێراق ـ بۆ ڕۆژنامەی "الشرق الأوسط" باسی کردووە، زەمینە و هەلێکی زێڕین بۆ بازرگانە ناوەکی و دەرەکییەکانی ڕەخساند تاکو هەندێ باند و گروپی چەکداریش، بزاڤی مافیای ماددە هۆشبەرەکان لە عێراقدا چالاك بکات و وا لە عێراق بکات کە ببێتە وێستگەیەکی ترانزیتکردنی ماددە هۆشبەرەکان بۆ وڵاتانی ناوچەکە و دەوروبەر.[٦٢] یەکەم تریلێ کە هەڵگری ٢ تەن (٢٠٠٠ کیلۆگرام) تریاك بوو، لە دوای ڕووخانی رژێمی بەعس لە ڕێکەوتی (٢٥/ئەیلول/٢٠٠٣) لە بازاڕی (سوق باب الشرقی) لە بەغدا گیرا کە بازرگانە ئێرانییەکان توانیبویان بە ناوی "تەمەر هیندی" لە ڕێگای سنوری هاوبەشی ئێران لەگەڵ هەرێمی کوردستان بێننە ناو خاکی عێراقەوە.[٦٣]

---

٦٢. جريدة الشرق الأوسط؛ هەمان بابەت؛ سەرچاوەی پێشوو.

٦٣. لە سایتی المنتدى العراقي؛ سەرچاوەی پێشوو؛ لە ژێر ناونیشانی: **"إنتشار زراعة الآفيون في مناطق عراقية"**.

**ج. سەردانی گەشتیار و زائیرە ئێرانییەکان بۆ شارە ئایینیەکانی عێراق:**

ڕۆژنامەی "الشرق الأوسط" لە زاری دەستەی نیشتمانی عێراقی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان دەڵێت: نیگەرانی ئەم دەستەیە لە زیادبوونی بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە عێراقدا زۆر بووە، بە تایبەتی لە دوای ڕاگەیاندنی حکومەتی عێراقی سەبارەت بە ڕەزامەندی لە هاتنی زائیرەکانی ئێرانی بۆ خاکی عێراق کە ڕۆژانە ١٥٠٠ کەس دێن![٦٤] کە ئەوەش کاری پشکنینی لە لایەن هێزە ئاسایشەکانەوە زۆر سەخت کردووە؛ چونکە ناکرێ هەموو کەل و پەلەکانیان بپشکنن بەتایبەتی ژنانی ئێرانی. بۆیە دەبینین زۆر جار ژنانی ئێرانی لەبەر ئاسانکاری لە پشکنینەکان، ماددە هۆشبەرەکان دەهێننە ئەو دیو.[٦٥]

**د. چاندنی ماددە هۆشبەرەکان لە خاکی عێراقدا:**

ڕادیوی "سەوا" و "بی بی سی"ی عەرەبی لە زاری ڕۆژنامەی "ئیندپێندێنتی" بەریتانی ڕادەگەینن کە چاندنی خەشخاش کە ماددەی تریاکی لێی وەردەگیرێت لە هەندێ زەوی کشتوکاڵی عێراقی دەستپێکراوە، لە جیاتی برنجی عەنبەر بە هۆی کەمیی داهاتی پێشتریان ڕوویان لە چاندنی ئەو ڕووەکە کردووە، ڕۆژنامەنووس "پاتریك کۆکبێرن" جەخت لەوە دەکاتەوە کە هەندێ جووتیاری شارەزا لە ئەفغانستان هاتوون بۆ یارمەتیدانی جووتیارانی عێراقی لە چاندنی گیای خەشخاش و چۆنیەتی بەرهەمهێنانی تریاك لە هەندێ ناوچەکانی سەر بە پارێزگای دیالی کە بە داروبار و باغەکانی پرتەقاڵ و هەنار بەناوبانگن.

---

٦٤. جریده الشرق الأوسط؛ سەرچاوەی پێشوو؛ لە ژێر ناونیشانی: **"تزايد عدد المدمنين العراقيين وتقارير تشير إلى انتساس مهربين بين زوار العتبات المقدسة القادمين من إيران"**.

٦٥. بڕوانە: أصوات العراق؛ **"السجن ثلاث سنوات لإمرأة إيرانية أدينت بتجارة المخدرات بواسط"**؛ لە سایتی المنتدى العراقي؛ سەرچاوەی پێشوو.

بەپێی ئەم ڕاپۆرتە لە ناوچەی "بهریز" کە دەکەوێتە باکووری "بعقوبە" بۆتە شوێنی چاندنی خەشخاش لە ژێر چاودێری و پاسەوانی زۆر توند لە نێوان دارەکانی پرتەقاڵ کە زۆر شاراوەیە و بە ئاسایی نابینرێ. هەروەها باس لە هاوپەیمانی هەندێ بەرپرسە سیاسییەکانی ناوچەیی دەکات لەگەڵ سەرۆکەکانی ئەم جۆرە باندانە. هەروەها بەم شێوەیە درێژە بە ڕاپۆرتی خۆی دەدات کە کاری دزینی نەوت بە هۆی دامودەزگاکانی حکومی، نیشاندەری ئەوەیە کە ئەم باندانە زۆر دەوڵەمەندن![٦٦]

هەموو ئەو هۆکارانە بوونەتە هۆی بڵاوبوونەوەی هەموو جۆرەکانی ماددە هۆشبەرەکان لە وڵاتی عێراقدا کە سەرەڕای ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکان ــ پێشتر ئاماژەمان پێکرد ــ گشت خووگرتووانی عێراقی نزیکەی ٢ ملیۆن کەس دەخەملێنیّ، دەستەی نیشتمانی بەرەنگاربوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ڕاپۆرتی خۆیان لە ساڵی (٢٠٠٦)دا باس لە هەبوونی (٢٨٠٠٠) خووگرتوو دەکات کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندان؛ بۆ نموونە بەپێی ڕاپۆرتی هەمان ڕێکخراو ئاماری خووگرتووانی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٤) دەگەیشتە (٧٠٠٠) کەس؛[٦٧] واتە ساڵانە نزیکەی (١٠٥٠٠) کەس زیاد دەبن؛ کەواتە بەم پێیە دەکرێ مەزەندە بکرێ کە ئەم ڕێژەیە بۆ کۆتایی ساڵی (٢٠١٠) بگاتە زیاتر لە (٧٠٠٠٠) خووگرتوو! تەنها لە نەخۆشخانەی "ئیبن روشد" لە بەغدا (٣٠٠٠) حاڵەتی خووگرتن بە ماددە

---

٦٦. هەمان سارچاوە؛ لە ژێر ناونیشانی: **"صحيفة بريطانية: إنتشار زراعة الأفيون في محافظة ديالى بمساعدة خبراء أفغان"**.

٦٧. وكالـة الملف برس؛ لە ژێر ناونیشانی: **"الأمم المتحدة: العراق أصبح الممر الرئيس لتجارة المخدرات عبر العالم"**؛ لـە سـایتی: http://almalafpress.net ـــــ هـەروەها سـایتی عـراق الغـد: http://www.iraqoftomorrow.org ـــ هـەروەها ڕۆژنامـەی ئاوێنـە؛ ژمـارەی (٢٢٨)؛ سێشـەمە ٢٠١٠/٦/١٥؛ ل٧.

هۆشبەرەکان لەساڵی (٢٠٠٧) تۆمار کراوە، کە لە ژێر چاودێری پزیشکی و تەندروستی دان.[٦٨]

## ٢. ڕەوشی ماددە هۆشبەرەکان لە هەرێمی کوردستان (مێژووی سەرهەڵدان، چونیەتی بڵاوبوونەوە، ئامارەکان):

بە داخەوە گەنجانی کوردستانی خۆمانیش لەو نەخۆشییەماڵوێرانکەرە دوور نەبوون و بە حوکمی دراوسێبوونی وڵاتی ئێران و هەبوونی سنورێکی بەرفراوان و کۆنترۆڵنەکراو، ئێستاکە هەرێمی کوردستان بۆتە ڕێگایەکی ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان و هەروەها بازاڕی مەسەرەف و کڕینی ئەم ماددانە لە لایەن گەنجانەوە. بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژ بە ڕۆژ بازرگانیکردن و بڵاوبوونەوە و ژمارەی تووشبوان بەم ماددانە پەرەدەسێنێت. دەتوانین هۆکارەکانی بڵابوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

**أ. تێکچوونی بونیادی کۆمەڵگای کوردستان لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١:**

لە دوای ڕاپەرینی گەورەی ساڵی (١٩٩١)ی کوردستان لە دژی ڕژێمی بەعس، هەرێمی کوردستان نیمچە سەربەخۆیەکی بینی و کە دواتر تووشی کۆمەڵێك تەنگەژەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بوو کە دەستی دوژمنانی نەتەوەکەمان نابێ لەو بارەوە وەکو هۆکارێکی بەهێزی دەرەکی لە دروست بوونی ئەم تەنگژانە لە بیر بکەین. حکومەتی کوردستان دەستی بە کار کرد و بوە میراتگری وڵاتێك کە زیاتر لە (٤٠٠٠) گوندی وێران کرابوو، دەیان هەزار کەس ئەنفال کرابوو، هیچ ئاوەدانییەکی بۆ نەکرابوو و هیچ دڵخۆشی و ئۆمێدەوارییەکی

---

٦٨. وکالة المستقلة للأنباء (أصوات العراق)؛ لە سایتی منتدی العراقي؛ سەرچاوەی پێشوو.

بۆ خەڵك بە جێ نەهێشتبوو و... تاكو خۆی تووشی شەڕی ناوخۆییش بوو كە كۆمەڵێك كێشەی كۆمەڵایەتی بەدواوە هات؛ وەكو: تێكچوونی باری دەروونیی هاوڵاتیان لەبەر براكوژی، تێكچوونی پەیوەندییە كۆمەڵایەییەكان لەبەر جیاوازیی ئینتیمایی بۆ حیزب و لایەنە سیاسییە جۆراوجۆرەكان، كۆچكردنی گەنجان بۆ دەرەوەی وڵات، دروستبوونی تەنگژەی ئابووری و بەرزبوونی ڕێژەی هەژاری، گۆڕینی پێوەرە كۆمەڵایەتییەكان لە نەریتی و سوننەتییەوە بۆ نوێ و ماددییەوە؛ بە تایبەتی لە دوای ساڵی (٢٠٠٣) كە ڕژێمی بەعس ڕووخا و بارودۆخی ئابووریی زۆر لە خەڵك بەرەو باشتر چوو، تا ڕادەیەكی زۆر سەقامگیری و ئاسایش و ئارامی دروست بوو كە دواتر بە دەستپێكردنی تێروریزم ئەم سەقامگیرییە كەوتە هەڕەشەوە و زۆر لە خەڵكی بێ گوناهی كوردستان كوژران. بە هەر حاڵ ئێستا ماددە بۆتە تەوەر و ئامانجی سەرەكی. هەموو شتێك تەنانەت شتە مەعنەوییەكانش وەكو: پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی نێو ئەندامانی خێزانیش بە چاوێكی ماددی سەیر دەكرێن و بە ماددە دەپێورێن!

بە كورتی دەتوانین بڵێین: هەموو كێشەكانی سەرەوە كە سەبارەت بە تێكچوونی بونیادی كۆمەڵگای عێراقی ئاماژەمان پێكرد، هەرێمی كوردستانیش دەگرێتەوە، بەڵام بە پشتبەستن بە هەندێ ئاماری تایبەت كە لە هەرێمی كوردستان بە شێوەیەكی فەرمی ئەنجامدراوە، باس لە هەندێ كێشەی كۆمەڵایەتی دەكەین كە دەرەنجامی ئەو ئانۆمیا كۆمەڵایەتییەیە كە هەموو سیستەمە كۆمەڵایەتییەكانی كۆمەڵگای كوردیشی گرتۆتەوە. ئامارەكان بەم شێوەیە بۆمان قسە دەكەن:

گەنجانی كوردستان لە دەست ((كێشەی بێكاری)) دەناڵێنن! دوایین ئامار كە لە لایەن "پەیمانگای كوردی بۆ دۆزە سیاسییەكان" ئەنجام دراوە، نیشاندەری ئەوەیە كە سەرەڕای بزاڤی ئاوەدانكردنەوە، (٤١٪)ی گەنجانی

کوردستان هیچ کارێکیان نییە. هەروەها (٢٦٪)ی گەنجان بێخانوون و ((کێشەی نیشتەجێبوونیان)) هەیە.[٦٩] بەپێی ئامارێك (٣٢٪)ی دانیشتوانی سلێمانی کرێنشینن.[٧٠]

نزیکەی (٤٠٠٠) گەنجی کورد لە ساڵی ٢٠٠٩ کە دەیانەویست لە کوردستانەوە بۆ دەرەوە کۆچ بکەن، سنووورداش کراونەتەوە.[٧١]

بەپێی ئامارەکانی "پەیمانگای کوردستان بۆ دۆزە سیاسییەکان" نزیکەی (٢٨,٢٢٪)ی گەنجان هیچ متمانەیەکیان بە دەسەڵاتی کوردی نەماوە![٧٢]

رێژەی ((تەڵاق)) رۆژ بە رۆژ بە شێوەیەکی مەترسیدار لە زیادبووندایە. بەپێی ئامارەکان لە ساڵی (٢٠٠٨) لە هەر سێ پارێزگای دهۆك* و هەولێر** و سلێمانی*** (١٧٠٧٨) حاڵەتی هاوسەرگیری تۆمار کراوە، لە بەرامبەریشدا (٣٣٢٩) حاڵەتی تەڵاق هەبوە؛[٧٣] واتە لە هەر (١٠٠) حاڵەتی هاوسەرگیری (٢٠) حاڵەتی تەڵاق هەبوە! ئامارەکان لە ساڵی (٢٠٠٩) لە شاری سلێمانی (٧٣٩٦) گرێبەستی هاوسەرگیری ئەنجام دراوە، کەچی (١٧٢٨) خێزان لە یەکتر جیا

---

٦٩. إذاعة العراق الحر؛ لە ژێر ناونیشانی: **"٤١٪ من الشباب الکرد عاطلون عن العمل حسب استطلاع لمعهد کردستان للقضایا السیاسیة"**؛ لە سایتی: http://www.iraqhurr.org

٧٠. بڕوانە: سایتی کوردیو: http://www.kurdiu.org

٧١. رۆژنامەی هاوڵاتی؛ ژمارە (٥١٤)؛ چوارشەممە ٨/٤/٢٠٠٩؛ ل١١.

٧٢. ڕادیو سەوا؛ لە ژێر ناونیشانی: **"تراجع تأیید الأحزاب السیاسیة الکردیة بین أوساط الشباب وفقا لاستطلاع الرأي"**؛ لە سایتی: http://www.radiosawa.com/iraq/arabic_news

* لە پارێزگای دهۆك: (٣٠٩٩) حاڵەتی هاوسەرگیری تۆمار کراوە، لە بەرامبەریشدا (٢٣٨) حاڵەتی تەڵاق.

** لە پارێزگای هەولێر (٨٦٧٣) حاڵەتی هاوسەرگیری، (١٠٨٣) حاڵەتی تەڵاق.

*** لە پارێزگای سلێمانی (٥٠٣٦) حاڵەتی هاوسەرگیری، (٢٠٠٨) حاڵەتی تەڵاق.

٧٣. رۆژنامەی هاوڵاتی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ هەمان لاپەڕە.

بوەنەتەوە.[74] یان لە شاری هەولێر (بەبێ قەزا و ناحیە و گوندەکانی) لە (٥) مانگی یەکەمی ساڵی (٢٠١٠) (واتە: لە ٢٠١٠/١/١ تا ٢٠١٠/٥/٣١)، (٥٤٣) حاڵەتی تەڵاق تۆمار کراوە؛[75] واتە مانگانە (١٠٨,٦) حاڵەت!

ڕێژەی گەنجانی —سەڵت— کە بۆ ژنهێنان پێگەیشتوون، بەڵام ناتوانن لەبەر کێشەی ئابووری ژیانی هاوسەرگیری پێك بهێنن، ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەرزبوونەوە دایە: لە شاری سلێمانی (٤٤,٤٪)، شارەزوور (٥٣٪)، هەڵەبجە (٤٧,٣٪)، پشدەر (٤٥,١٪)، دوکان (٥٠,٧٪)، دەربەندیخان (٥٢,٥٪)، چەمچەماڵ (٤١,٣٪)، کۆیە (٤٢٪). هەروەها ڕێژەی ((بیوەپیاو)) لە شاری سلێمانی (٤٪)ی پیاوان پێکدەهێنێت![76]

هەروەها ڕێژەی —خۆکوشتن—ی گەنجان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە بەرزبووندایە؛ بە تایبەتی خۆسووتاندنی ژنان. تەنها لە ماوەی ساڵی ٢٠٠٨ لە هەردوو پارێزگای هەولێر و دهۆك بەپێی ئاماری "بەڕێوەبەرایەتی بەدواداچوونی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان" کە سەر بە وەزارەتی هەرێم بۆ کاروباری ناوخۆیە، لە ڕاپۆرتێك بە ناوی (باردۆخی کۆمەڵایەتی ئافرەتانی کوردستان) باس لە خۆسووتاندنی (٢٩٦) کەس لە هەردوو سنووری هەولێر و دهۆك کردووە، هەروەها باسی لە (٧٥) حاڵەتی خۆکوشتن و خۆخنکاندن و کوشتنی بە ئەنقەست کردووە! هاوکات نزیکەی (٥٠٠) تۆمەتبار بە تۆمەتی ئەنجامدانی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان بەند کراون![77] لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٩

---

٧٤. ڕۆژنامەی ئاسو؛ ژمارە (١٢٤١)؛ سێشەممە (٢٠١٠/٦/١٥).

٧٥. ڕۆژنامەی هەولێر؛ ژمارە (٨٠٣)؛ سێشەممە (٢٠١٠/٦/١٥).

٧٦. بڕوانە: ڕۆژنامەی ڕۆژنامە؛ ژمارە (٤٦١)؛ سێشەممە (٢٠٠٩/٥/٥)؛ ل٧.

٧٧. ڕۆژنامەی هاوڵاتی؛ ژمارە (٤٩٨)؛ چوارشەممە (٢٠٠٩/٢/١١)؛ ل١٠.

تەنها ٨٥ حاڵەتی خۆسوتاندن هەبوە و (١٢) ئافرەتیش کوژراون و (٢٣٣١) سکاڵای لێدانیش تۆمار کراوە ![٧٨]

با لێرە سەیری هەندێ ئاماری وردی "وەزارەتی وەرزش و لاوانی حکومەتی هەرێمی کوردستان" بکەین کە بە یارمەتی وەزارەتی پلان دانان، وەزارەتی رۆشنبیری، دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان سەر بە وەزارەتی پلان دانان، سندوقی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ نێشتەجێبوون، لە ماوەی (٢٥/٣/٢٠٠٩) تاکو (١٣/٤/٢٠٠٩) ئەنجامیان داوە کە لە (٢٣٦) خشتە پێکهاتووە. ئەم ئامارە بۆمان دەردەخات کە:

ڕێژەی (٣٧٪)ی دانیشتوانی کوردستان گەنجن؛ واتە: نزیکەی **(١,٨١٦,٩٧٥)** کەس، کە ڕێژەی (٦,٢٪)یان نەخوێندەوارن (واتە: نزیکەی ١١٥,٠٠٠ کەس)، کە ڕێژەی (٣٩,٢٪) دایك و باوکیان ڕێگریی خوێندنیان بوونە ! (واتە: ٤٥,٠٠٠ کەس) و ڕێژەی (١٣,٩٪)یش خوێندنیان بەجێ هێشتووە کە هۆی ئەوەش دەگەڕێننەوە بۆ نەبوونی حەز و ویستیان لەسەر درێژەدان بە خوێندن! هەروەها ئەم لێکۆڵینەوەیە دیاری دەکات کە ڕێژەی (١٣٪)ی گەنجان ئینتەرنێت بەکاردەهێنن کە (٥١٪)ی ئەوان بۆ چاتکردن، سێ لە چواریان واتە (١٧٧,٠٠٠ کەس یان ٧٥٪) بۆ سایتە خراپ و ئیباحییەکان بەکاردەهێنن! ڕێژەی (٥١,٢٪) موبایل بەکار دەهێنن! ڕێژەی (٤٥,٨٪)ی گەنجان وەرزش ناکەن کە زۆربەیان بەهانەی نەبوونی وەرزشگا لە نزیك ماڵیان هێناوەتەوە ! نزیکەی (٧٠,٤٪)ی گەنجان لە هەڵبژاردنەکان بەشدارییان کردووە. (٣٩,٣٪) لە ژێر فشاری دەروونی و دڵەراوکێ دان و هەست بە ئاسایش و ئارامیی دەروونی ناکەن. سەبارەت بە تێکەڵبوون لەگەڵ برادەری خراپ، ئامارەکان دەڵێن کە: (٥٢,٢٪)ی گەنجان

---

٧٨. بڕوانە: ماڵپەڕی دەزگای وارڤین لە سایتی: http://www.warvin.org

هاتوچوو لەگەڵ برادەری جگەرەکێش دەکەن، هەروەها (٨٪) برادەری مەشروبخۆریان هەیە، (٣٣,٨٪) برادەریان هەیە کە نێرگەلە بەکار دەهێنن![٧٩]

هەموو ئەوانە نیشانەکانی ئانۆمی و بەرەڵایی و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتین لە کۆمەڵگای کوردستانی کە زیاتر ڕۆڵی هۆکارە ناوخۆیی و زاتییەکان بەرچاو کەوتوون، بەڵام هەر وەك وتمان هۆکارە دەرەکی و بابەتییەکانیش نابێ لە بیر بکەین کە ڕۆڵ و کاریگەرییان لەو بوارەوە زۆر بەهێز بوە. هەموو ئەوانە وەکو زەمینەیەکی ڕێکخۆشکەرن کە ڕێژەی لادانە کۆمەڵایەتییەکان وەکو ماددە هۆشبەرەکان لە ناو کۆمەڵگادا بەرز بکاتەوە و نەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێن. ئەم تەنگژانە وەك بێسەروبەرییەکی کۆمەڵایەتی هاوسەنگی کۆمەڵگای کوردی و بۆتە هۆی بێ پێوەری و بەرزیی پاڵەپەستۆ و دابەزینی بەرگری کۆمەڵایەتی کە لە کۆتاییدا مایەی ئاسانبوونی زۆر لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانە کە خووگرتن و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان یەکێکە لەوان.

سەبارەت بەم هۆکارە گرنگە واتە هەڵوەشانەوەی بونیادی کۆمەڵگا و پەیوەندی بە بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستاندا لە بەشەکانی تری ئەم توێژینەوەیە بە تێروتەسەلی باسی لێ دەکەین.

**ب. باندەکانی قاچاغچی:**

لە دوای جیابوونەوەی هەرێمی کوردستان و نەمانی هەیمەنە و دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی لەسەر سنوورەکانی کوردستان و پەراوێزبوونی هێزە یاساییەکانی، ئەو ترسەی کە خەڵك بە گشتی لە یاسای توندی عێراقی هەیبوو،

٧٩. **المسح الوطني للفتوة والشباب (٢٠٠٩) التقرير الموجز**؛ وزارة الرياضة والشباب/ إقليم كردستان، هيئة إحصاء إقليم كردستان بالتعاون مع صندوق الأمم المتحدة للسكان (UNFPA) مكتب العراق، المشروع العربي لصحة الأسرة في جامعة الدول العربية (PAPFAM)، وزارة الشباب والرياضة، الجهاز المركزي للإحصاء وتكنولوجيا المعلومات؛ ص ٥٠-١.

نەما یاخود کەمتر بوو. لە لایەکی ترەوە بە هۆی ئابلۆقەی ئابووری لەسەر عێراق لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، خەڵکی کوردستان و عێراق تووشی هەژاری و نەهامەتی بوونەوە و وای کرد هەندێك لە هاوڵاتیان پەنا ببەن بۆ بازرگانیکردن بەم ماددانە و بڵاوی بکەنەوە.

**ج. گەڕانەوەی پەنابەرەکانی کورد لە ئێران:**

هەر لەسەرەتای ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو ئەم ماددانە هاتە ناو کوردستان، بەڵام بە ڕێژەیەکی کەم. دەکرێ بڵێین هەرێمی کوردستان لەو کاتە زیاتر دەروازەیەك بوو بۆ گواستنەوە بۆ وڵاتانی تر؛ واتە تەنها وێستگەیەکی ترانزێتی بوو، بەڵام هەر لەگەڵ گەڕانەوەی ئاوارەکانی کورد لە ئێران بۆ خاکی کوردستان، ئەم ماددانە زیاتر پەرەیان سەند، بە تایبەتی ئەو ئاوارانەی کە درەنگتر گەڕانەوە؛ واتە ئەوانەی کە لە دوای ساڵی (٢٠٠٠) گەڕانەوە. لە بەشەکانی دیکەی توێژینەوەکەماندا بە تێروتەسەلی باسی لێوە دەکەین.

**د. هەڵگرتنی بازگەکانی پشکنین لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس و ئازادیی عێراقی فیدڕاڵ لە ساڵی (٢٠٠٣):**

بە هۆی سیاسەتی وڵاتی ئەمەریکا لە عێراق لە کاتی حوکمی "پۆل بریمەر" دەرگاکانی عێراق بە گشتی و هەرێمی کوردستان بە تایبەتی زیاتر کرانەوە و جۆرە گوێنەدانێك لە ڕووی ئاسایش و ئەمنییەتەوە دروست بوو، کە بوە هۆی ئاسانکاری بۆ باندە قاچاغچییەکان و بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی ئەم ماددانە لە کوردستان. تەنانەت لە ڕووی تیرۆریزمیش، عێراق و هەرێمی کوردستان زۆر زیان و خەسارەتی بینی.

**هـ. هاتنی کرێکاران و پیشەکارانی ئێرانی:**

لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس، خەڵکی کوردستان ئەوجارە هەست بە ئاسایش و جێگیرییەکی ئەوتۆیان کرد کە دەست بە ئاوەدانی و دروستکردنی خانووبەرە بکەن، لە لایەکی ترەوە باری ماددی و ئابوورییان باشتر بوو، زۆربەیان لە حکومەت دامەزران و بوون بە خاوەن مووچە و زەوی و... ئەم خۆشگوزەرانییە وایان لێکرد کە هێزی کار لە دەرەوە بێنن؛ چونکە زۆربەی خەڵکی کوردستان لەبەر هەبوونی مووچە و بەشکردنیان، کەمتر کرێکارییان دەکرد! تاکو ڕێگا خۆش بوو بۆ هاتنی کرێکاران و پیشەکاران و وەستای ئێرانی کە ماوەیەکی زۆر دەمانەوە و پارەیەکی باشیان وەردەگرت. لە ناو ئەم کرێکارانە هەندێ کەسی خووگرتوو هەبوو و تەنانەت بازرگانیشیان بەو ماددانەوە دەکرد؛ چونکە هەندێ ماددەی هۆشبەر هەن، کە هێزیان زیاتر دەکات و کەمتر دەخەون و هەست بە ئازاری جەستە بە تایبەتی ژانی پشت ناکەن و لە ڕووی دەروونیشەوە لەپێناو نەهێشتنی خەمۆکی و خەم و خەفەتی دووری لە ماڵ و خێزانەوە، ماددەی هۆشبەریان لەگەڵ خۆیان دەهێنا!

**ی. کەمتەر خەمیی دەسەڵات و بەهەند وەرنەگرتنی ئەم دیاردەیە:**

دیاردەی خووگرتن لە کوردستان تائێستا لە قۆناغی سەرەتا دایە و هێشتا خۆشبەختانە وەك وڵاتانی ئێران و هۆڵەندا و کۆلۆمبیا و ئەمریکا و... لێنەهاتوە، دەسەڵات زوو بەرەنگاری ئەم دیاردەیە نەبوویەوە و لەبەر قەبارەی کێشە سیاسی و ئەمنی و ئابوورییەکانی دیکە کە بۆ هەر حکومەتێك لە ئەولەوییەت دان، هەست بە مەترسییەکی ئەوتۆی نەکرا، دواتر هەست دەکرێت کە هێشتا بە شێوەیەکی زانستی و سەردەمیانە لەگەڵ ئەم دیاردەیە ڕووبەڕوو

نەبۆتەوە، تاکو ئەم دیاردەیە ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی سەند و وای لێهاتووە کە کۆمەڵگای کوردی ئەمڕۆ بەدەست ئەم دیاردەیەوە بناڵێت.

* * *

هەموو ئەوانەی سەرەوە بە هۆکاری بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان لە هەرێمی کوردستان دەزانین، کە پێمان وایە ئەمڕۆ ئەگەر سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە بێت، ئەوە لە داهاتوودا زیاتر دەردەکەوێت، ئەمڕۆ زیاتر چینی لاوان گرفتاری بوون، دواتر نەوجەوان و هەرزەکارانیش تووش دەبن و ئاستی تەمەنیش ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبێت.

خۆشبەختانە ماوەیەکە (لە ڕێکەوتی ٥/٤/٢٠٠٩) کە "کۆمەڵی بەرەنگاربوونەی مادده هۆشبەرەکان" بە شێوەیەکی ڕەسمی لە هەرێمی کوردستان دامەزراوە و سەنتەری سەرەکییەکەی لە پارێزگای سلێمانییە و دوو لقی لە هەولێر و کەرکوک هەیە و هەندێ نوێنەری هەیە لە پارێزگاکانی دهوك و نەینەوا و هەروەها لە بەغداش.[٨٠]

پێشتر لەوە، "بەڕێوەبەرایەتی نەهێشتنی مادده هۆشبەرەکان" (لە ڕێکەوتی ٢٦/٦/٢٠٠٦ لە ڕۆژی قەڵاچۆکردنی مادده هۆشبەرەکان) کراوەتەوە کە هەندێ بنکە و هۆبەی تایبەتی هەیە کە سەر بەو بەڕێوەبەرایەتییەن لە سنوورەکانی هەرێم و فرۆکەخانەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی هاتنەژوورەوەی ئەو ماددانە.[٨١]

---

٨٠. الوكالة المستقلة للأنباء؛ لە ژێر ناونیشانی: **"عشر توصيات لمؤتمر المخدرات أبرزها افتتاح مركز لمساعدة المتعاطين"**؛ لە سایتی أصوات العراق: http://ar.aswataliraq.info/

٨١. ڕۆژنامەی ستاندەر؛ ژمارەی ٣٤؛ دووشەممە ٢٣/٦/٢٠٠٨؛ ل٦؛ لە ژێرناونیشانی: **"مادده هۆشبەرەکان تیرۆرێکی لەسەرخۆیە"**؛ لە زاری عەمیدی ئاسایش کاك "فرسەت دۆڵەمەری" بەڕێوەبەری ئەم بەڕێوەبەرایەتییە.

**هەروەها کردنەوە و دەستبەکاربوونی "ڕێکخراوی رۆشنبیری هۆشیاری دژی ماددە هۆشبەرەکان لە هەرێمی کوردستان" کە توێژەر لە کاتێ نووسینی لێکۆڵینەوەکەی خۆی سەردانی هەر سێ شوێنی کردووە بۆ دەستکەوتنی ئاماری ڕەسمی خووگرتووانی هەرێمی کوردستان، کە لە ئەنجامی دانیشتن و چاوپێکەوتن* لەگەڵ سەرۆکی ڕێکخراوی ڕۆشنبیریی هۆشیاری دژی ماددە هۆشبەرەکان،** بەپشتبەستن بە ئامارەکانی ئەو ڕێکخراوە، زانیمان کە تا کۆتاییی مانگی (٤/٢٠١٠) ڕێژەی (٣٠٠٠ ـ ٥٠٠٠) کەس خووگرتوو بە هەموو جۆرە ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستان هەیە؛ بە تایبەتی تریاك و حەشیش و هرۆیین و کراك و ئەمفیتامینەکان.**

**جێگای باسە کە ڕێژەی (٦١٪)ی گەنجانی کوردستان بە گوێرەی ئامارێك "نێرگەلە" بەکار دەهێنن کە زیانەکەی هەندەی (٦٠) جگەرەی ئێکسپایەرە و هۆکارێکیشە بۆ راکێشانی گەنجان بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان.[٨٢] زۆر جار دیتراوە کە هەندێ گەنجەکان ماددەی حەشیش لە ناو نێرگەلە دەکەن و دەکێشن.**

**هەروەها سەبارەت بە "جگەرەکێشان"، بەپێی ئەنجامەکانی ڕاپرسییەك لە ژێر ناونیشانی "گەنج و جگەرەکێشان" کە لە لایەن "سەنتەری پەرەپێدانی لاوان" لە نێوان (٨٩٩) کەس لە چوار ناوچەی جیا (هەولێر، سلێمانی، دهۆك و گەرمیان) ئەنجامی داوە، ڕێژەی (٤٣.٢٪)ی گەنجان جگەرە دەکێشن.[٨٣] بە داخەوە سەبارەت بە مەشروباتی ئەلکهۆلی هیچ ئامارێکمان نییە، کە لێرە ئاماژەی پێبکەین!**

---

* چاوپێکەوتن لە ڕێکەوتی (٢٠١٠/٥/١٢) ئەنجامدرا.

** بەڕێز ماموستا "ئیبراهیم رەمەزان ئیبراهیم".

٨٢. هەمان سەرچاوە؛ هەمان لاپەڕە؛ لە زاری "یوسف عوسمان" پسپۆڕی پەروەردەیی.

٨٣. سەنتەری پەرەپێدانی لاوان YDC؛ بەشی لێکۆڵینەوە و ڕاپرسی؛ ژمارەی ٥: **گەنج و جگەرەکێشان**.

دوایین چالاکی لە کوردستان کە پەیوەندی بە مادده هۆشبەرکانەوە هەبوو، بریتیی بوو لە بەرپاکردنی کونفرانسێك بە ناونیشانی "بەرەو کۆمەڵگایەکی بێ مادده هۆشبەرەکان" لە شاری سلێمانی لە لایەن "کۆمەڵی بەرەنگاربوونەوەی مادده هۆشبەرەکان" لە ڕێکەوتی (٢٠١٠/١/٢٩) کە لە کۆتاییدا، ١٠ ڕاسپاردەی هەبووە کە گرنگترینیان بریتی بووە لە:

- پێویستبوونی کردنەوەی سەنتەرێکی چاکسازی بۆ یارمەتیدانی خووگرتووان لە شاری سلێمانی دواتر لە هەموو ناوچەکانی عێراق.
- هەروەها هەبوونی ئامارێکی ڕەسمی لە خووگرتووەکان کە لە دوای ساڵی (٢٠٠٣)ەوە سەری هەڵداوە.
- هەروەها خۆپاراستنی خەڵك لە مەشروباتی ئەلکهۆلی لەبەر زیانە گەورەکانی. ئەوەش ئەنجامی نابێ مەگەر بە هاوکاری هەندێ وەزارەت وەکو: پەروەردە، خوێندنی باڵا، ناوخۆ، تەندروستی، کاروباری کۆمەڵایەتی، جگە لە ڕێکخراوەکانی خۆبەخش.
- هۆشیارکردنەوەی گەنجان لە مەترسییەکانی مادده هۆشبەرەکان لەسەرتاسەری کوردستان.
- چاپکردنی کتێب و گۆڤاری تایبەت بەم دیاردەیە و بڵاوکردنەوەی لەسەرتاسەری کوردستان.
- کردنەوەی سەنتەرەکانی ڕەسمی دیکە بۆ کۆمەڵەکەیان لە پارێزگاکانی دیکە.
- کردنەوەی سەنتەرە پزیشکییەکانی تایبەت بە خووگرتووەکان و...[٨٤]

٨٤. الوكالة المستقلة للأنباء؛ سەرچاوەی پێشوو؛ هەمان بابەت.

## دەستپێك:

مادده هۆشبەرەکان چەندین جۆرن و هەر جۆرێك چەندین وەرگێراوی هەیە کە تا ئێستا نزیکەی (١٠٥) جۆری ناسراوە کە هەندێکیان خاوەنی تایبەتمەندی وەکو یەکن، هەندێکیتریان زۆر لە یەك جیاوازن.[٨٥] بۆیە زانایان هەر یەك بە پێی پێوەری تایبەت دابەشیان دەکات.. بۆ نموونە هەندێ بەپێی جۆری خووپێوەگرتن بە دوو لق دابەشیان دەکەن:

١. ئەو ماددانەی کە تەنها خووگرتنی دەروونی دروست دەکەن؛ وەکو: حەشیش و LSD و ...

٢. ئەو ماددانەی کە خووگرتنی دەروونی و جەستەیی پێکەوە دروست دەکەن؛ وەکو: تریاك و وەرگێراوەکانی، ئەلکهۆل، جگەرە و...[٨٦]

گرنگترین جۆری دابەشکردنی مادده هۆشبەرەکان بەپێی سەرچاوەکان دەگەڕێتەوە بۆ دابەشکردن بەپێی جۆری سروشت و بەرهەمهێنانیان، هەروەها دابەشکردن بەپێی کاریگەرییان، کە لێرە هەوڵ دەدەین باسیان بکەین؛ چونکە لە کوردستان بە حوکمی ئەوەی دراوسێی ئێرانە، هەموو جۆرەکانی ئەم ماددانە بە دەست دەکەوێت و بە کار دێت:

ئەو خووگرتووانەی کە لە "زیندانی محەتتە" بینیومان، زۆربەیان لە دوای جگەرە و ئەلکهۆل، تریاك بەکار دەهێنن، بەڵام تووشبووی هیرۆیین و حەشیش و ئەمفیتامینەکان و کراك و ئەلکهۆل و جگەرەشی تێدابوو؛ جگەرە (١٠٠٪)، ئەلکهۆل (٦٠٪)، تریاك (٥٠٪)، حەشیش (٢٢,٢٢٪)، هیرۆیین (١٦,٦٧٪)، حەبی ئامفیتامینەکان (١١,١١)٪.

---

٨٥. الحجار، د.محمد حمدي؛ **الإدمان على المخدرات**؛ ط١؛ دمشق: داراليقظة الفكرية (٢٠٠٧)؛ ص ٨.

٨٦. شاکرمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٨٦.

## یەکەم: پۆلینکردنی مادده هۆشبەرەکان بەپێی سروشتیان:

مادده هۆشبەرەکان بەپێی سروشت و سەرچاوەیان دەکرێنە سێ بەش، ئەمانەن:

**أ. مادده هۆشبەرە سروشتییەکان:** ئەو ماددانەن کە ڕاستەوخۆ لەو ڕووەکانە وەردەگیرێن کە ماددەی هۆشبەریان تێدایە، جا چ ڕووەکی خۆرسك بێت، واتە بە بێ چاندن بڕوێت، یاخود چێنراو بێت؛ لەوانەش حەشیش و ئەفیۆن و کۆکا و قات.[87]

**ب. مادده هۆشبەرە پاڵفتەکراوەکان:** ئەو مادده هۆشبەرانەن کە لە مادده و درەختە سروشتییەکان وەردەگیرێت، بەڵام چڕییەکەیان زیاترە و کاریگەرترن لەسەر مرۆڤـ؛ لەوانە: "مۆرفین" کە لە ماددەی ئەفیۆن وەردەگیرێت، بەڵام لەو بەهێزترە. "هیرۆیین" کە لە مۆرفین وەردەگیرێت و لە مۆرفینەکە بەهێزترە. ئەو مادده وەرگیراوانە کاریگەریی تەندروستی زۆر ترسناکیان هەیە، وەك: نەمانی ئارەزووی خواردن و زیادکردنی لێدانی دڵ و لەرزین و فراوانبوونی گلێنەی چاو و ناتەواوی لە کاری گورچیلە و ڕەنگە خراپترین نەخۆشی، نەخۆشی (ئایدز) بێت کە لە ئەنجامی پیسبوونی ئەو دەرزییەی خووگرتووەکان بە کاری دێنن لە یەکێك بۆ یەکێکی دی دەگوازرێتەوە.[88]

---

٨٧. کلمن، ورنان؛ **اعتیاد چیست؟ معتاد کیست؟**؛ ترجمە: علیرضا میرفخرایی؛ چ٤؛ تهران: نشر اوحدی (٢٠٠٤)؛ ص٢٩.

٨٨. هەمان سەرچاوە؛ ل ٢٩-٣٠.

**ج. مادده هۆشبەره دروستکراوه کیمیایی یەکان:** ئەو ماددانەن که به هۆی کارلێکی کیمیاییەوه بەرهەم دەهێنرێت و هەموو قۆناغەکانی دروستکردنیان له کارگەدا بڕیوه، هیچ جۆرێك له جۆرەکانی مادده هۆشبەره سروشتییەکانیان تێدا نییه؛ ئەگەر چی کاریگەرییان هەروەك مادده هۆشبەره سروشتییەکان وایه؛ به تایبەتی له کاتێ خووگرتن، لەوانه: هەڵوەسکارەکان، ئەمفیتامینەکان، باربیتۆرەکان، کپتاگۆن.[٨٩]

٨٩. هەمان سەرچاوه؛ ص٣٠.

## دووەم: پۆلینکردنی مادده هۆشبەرەکان بەپێی کاریگەرییان:

مادده هۆشبەرەکان بەپێی کاریگەرییان دەکرێ بۆ چەند کۆمەڵێك پۆلین بکرێن، کە هەر کۆمەڵێکیان هەمان کاریگەرییان لەسەر کەسی خووگرتوو و بەکارهێنەر هەیە، دەشبێتە هۆی گرفتی جۆراوجۆر، کە گرفتی جەستەیی و گرفتی دەروونی و گرفتی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە؛ ئەمەش راڤەیەکی کورتە بۆ هەر بەشێك لە بەشە سەرەکییەکانی مادده هۆشبەرەکان لەگەڵ جەختکردن لەسەر نموونەیەك یان هەندێ نموونە لە هەر کۆمەڵێك بەپێی گرنگی و باوبوونیان:

### *أ. هێمنکەرەوەکان (Depressant substances)*:

ئەم کۆمەڵە، ئەم جۆرە هۆشبەرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

- ئەلکهۆل (Alcohol)
- باربیتۆرەکان (Barbiturates)
- خەوهێنەرەکان (Hypnotics)
- ئازار شکێنەری پاڵفتەکراو (Synthetic Sedative)

ئەو کۆمەڵە توانای ئەوەی هەیە ببێتە هۆی خاوبوونەوە و تەمبەڵی و شەکەتی و خەواڵووبون. دەشبێتە هۆی لە دەستدانی خۆکونترۆڵکردن.[٩٠] ناشتوانێت ڕەفتاری نوێ فێر بێت؛ لەبەر ئەوەی کار دەکاتە سەر سەنتەرەکانی

---

90. Vaillant, G. **The alcohol-dependent and drug-dependent person**, In J.nicholi (Ed.) The new harvaed guide to psychiatry, London (2001), p107.

مێشك. ئەم كۆمەڵە هۆشبەرە دەبێتە هۆی گۆڕانكاری لە سیستەمی دەمار و ئەویش دەبێتە هۆی دەركەوتنی نیشانەی خۆكێشانەوە لە لایەن كەسی خووگرتوو. ڕاگرتن و بەكارنەهێنانی ئەو ماددانە بە شێوەیەكی كتوپڕ، لەوانەیە هەڕەشە لە ژیانی بكات.[91]

**ئەلكهۆل** بە دەرمانێكی هێمنكەرەوە دادەنرێت؛ چونكە توانای مێشك بۆ زاڵبوون بە سەر كاری ئەندامەكانی جەستە هێواش دەكات. هەروەها بەسەر بیركردنەوە و بڕیاردان، جا سەرچاوەی ئەلكهۆلەكە هەر چییەك بێت؛ بیرە یاخود مەی یان هەر جۆرێكی دی سەرخۆشكردن بێت. بۆیە كاریگەریی مەی لەسەر مرۆڤـ لەسەر جۆری مەیەكە ناوەستێت، بەڵكو لەسەر بڕی ئەو ئەلكهۆلە دەوەستێت كە لە ناو ئەو جۆرە دایە.[92]

ئەلكهۆل وەكو دەرمانی دژی خەمۆكی (دژە دامركان و دڵساردی) كار دەكات و هەروەها وەكو دەرمانە خەوهێنەرەكان دەبێتە هۆی ناكۆكی لە شوێنی دۆزینەوە و گێژی، بێهێزی زەین، كەمكردنەوەی هێزی دادوەری و نەبوونی كەسایەتییەكی نەگۆڕ. زۆر كەس پێیان وایە ئەلكهۆل دەبێتە هۆی جموجۆڵ و جووڵەی مرۆڤـ، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە، بەڵكو دەبێـتە هۆی سستی مرۆڤـ.[93] سەرەتا ئەلكهۆل لەسەر ((كرتێكسی)) مێشك كاریگەری دەبێـت و كۆت و بەندە ئەخلاقییەكان لا دەبات و حاڵەتێكی خۆش دروست دەكات و وردە وردە لەگەڵ زۆری ژەهراویبوون، ڕەفتار و قسەكان لە دەست كەسەكە دەچنەدەر.

91. Ibid, (p108).

٩٢. مشاقبة؛ الدكتور محمد أحمد؛ **الإدمان على المخدرات الإرشاد والعلاج النفسي**؛ ط١؛ عمان: دار الشـروق للنشـر و التوزيع (٢٠٠٧)؛ ص ٦١.

٩٣. میربیگی، شبنم و مرادی، فاطمه؛ **راهنمای درمان اعتیاد ویژه خانواده**؛ چ١؛ تهران: سازمان بهزیستی كشور، معاونت امور فرهنگی و پیشگیری (٢٠٠٩)؛ ص١١-١٢.

توێژینەوەکان نیشانی دەدەن کە کەسی ئەلکهۆلی بەرپرسیاریەتی ژیانی ڕۆژانەی بۆ قبولْ ناکرێت.[٩٤]

سەرخۆشی حاڵەتێکی نەخۆشییە بە ڕەفتارێکی ناسروشتی جیادەکرێتەوە. خواردنەوەی مەی بە شێوەیەکی زیادەڕۆی دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانی دەست بە سەر ئەمانەدا بگرێ:

أ. ژمارەی ئەو جارانەی کە مەی تێدا دەخورێتەوە.

ب. بڕی ئەو مەیەی کە لە هەرجارێکدا بەکاردەهێنرێت.

ئەوەش دەبێتە شلەژانی تەندروستی کەسی خووگرتوو، جگە لە شێوانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، بێگومان ژیانی ڕوحیش دەشلەژێ.[٩٥]

## کاریگەرییە کورتخایەنەکان:

١. سووربوونەوەی چاوەکان و ڕوومەت، هەستکردن بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش.

٢. بۆنێکی ناخۆش لە ناو دەم و هەناسەدا.

٣. دڵتێکهەڵاتن و ڕشانەوە.

٤. لێك تێنەگەیشتنی ئەو کەسەی کە ئەو جۆرە ماددانە وەردەگرێت لەگەڵ کەسانی دەوروبەری؛ جا چ خێزانی بێت یان ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژێت.

٥. شێوازی هەستەکانی جەستە وەکو بینین و بیستن، هەروەها شێوازی بیرکردنەوە و هەستی بەرامبەر، بە کەسانی دی و لە دەستدانی خۆکۆنترۆڵ کردن.

٦. بورانەوە (إغما).[٩٦]

---

٩٤. عظیمی، د.محمد؛ **مباحث اساسی روانشناسی**؛ چ١؛ تهران: انتشارات کیهان (٢٠٠٢)؛ ص ٣٠٣.

95.Denzin, N. **The alcohol self. London**: SAGE publications (1997), p 76.

**کاریگەرییە درێژخایەنەکان:**

١. هەروەك پێشتر باسمان کرد ئەلکهۆل بە دەرمانە هێمنکەرەوەکان دادەنرێت؛ بۆیە بەکارهێنانی دەرمانە هێمنکەرەوەکانی دیکە وەکو خەوێنەر و هێورکەرەوەکان لەگەڵ خواردنەوەی مەی زۆر مەترسیدارە؛ چونکە ئەوە کاریگەریی ئەو ماددانە دوو هێندە دەکات لەسەر کۆئەندامەکانی لەش. کەسی وەرگری ئەو ماددانە خۆیان لە حاڵەتێکی زۆر خراپدا دەبینن؛ چونکە توانای مێشك بە سەر زاڵبوون لەسەر کرداری هەناسەدان و جوولەی دڵ کەم دەبێتەوە، ڕەنگە ئەوەش ببێتە هۆی مردن.

٢. زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە مەی وا لە جەستە دەکات، ئەو ماددە کیمیاییانەی کە لە ناو جگەرە و حەشیشدا هەن و دەبنە هۆی شێرپەنجە، بە شێوەیەکی خێراتر بمژێت؛ بۆیە کێشانی جگەرە لەگەڵ خواردنەوەی مەی، یان وەرگرتنی حەشیش یان بانجۆ لەگەڵ مەی دا مەترسییەکی زۆری لەسەر تەندروستی وەرگرەکەدا هەیە؛ چونکە بەشێوەیەکی خێراتر خۆی تووشی شێرپەنجەی دەم و بەشی سەرەوەی سینگ و جگەر دەکات.

٣. وەرگرتنی هەندێ دەرمان لەگەڵ خواردنەوەی مەی زۆر نیشانەی خراپی لێدەکەوێتەوە؛ لەوانە: ژانە سکێکی زۆر، ڕشانەوەو، ژانەسەر. لێرە پێویستە ئەو ئامۆژگارییانە بدرێت، لەگەڵ بەکارهێنانی دەرمان نابێت مەی بخورێتەوە ئەویش بۆ دوورکەوتنەوە لەو نیشانە خراپانە.

---

96. Velleman, R. **Alcohol and problems**, In: R. Rentuol, R. (Ed.), London: Routledg (1995), (p 138).

٤.	وا له ژیانی ئافرەتی سکپڕ و کۆرپەکەی دەکات له مەترسییەکی زۆر دابێت، دەبێتە هۆی له بارچوون، یاخود منداڵەکه به ناکامی له دایك دەبێت، یان گەشەی ناتەواو دەبێت یاخود شێت دەبێت.[٩٧]

### ب. ئەفیۆنەکان (Opiates/ Opiods):

- مۆرفین (Morphine)
- کۆدائین (Codeine)
- هیرۆیین (Heroein)
- دیپیپانون (Dipipanone)
- پتداین (Pithidine)

**ئەفیۆن** یان تریاك یەکێك له کۆنترین ماددەی هۆشبەره که مرۆڤ له (٧٠٠٠) ساڵ بەر له ئێستا ناسیویەتی.[٩٨] ناوی ئەفیۆن له (ئەپیۆن/Apiyin) ـەوە وەرگیراوە که ناوێکی یونانییە.[٩٩] تریاك له داری خەشخاش دەردەهێنرێت. به هەزارەها ساڵ پێش زایین ڕووەکی خەشخاش ناسراوە. له نەخش و نیگارەکانی فیرعەونەکان ڕووەکی ئەفیۆن لەسەر دیواری پەرستگاکان دۆزراوەتەوە. لەو کاتیش بۆ چارەسەری هەندێ نەخۆشی بەکارهێنراوە؛ وەکو چارەسەری ژانه سکی منداڵان، له سەدەکانی ناوەڕاستیش بۆ چارەسەری هەندێ نەخۆشی بەکارهێنراوە؛ وەکو: ئارەقی جەستەو ئازاری جومگەکان، ئازار شکاندن دوای نەشتەرگەرییەکان. له کاتێ ئێستاشدا ڕووەکی خەشخاشی ئەفیۆن به شێوەیەکی بێ بەرنامه دەچیندرێت. زۆر مەترسیداره و زۆر زیانی لەسەر ژیانی

---

97. Ibid, (pp 138-140).

٩٨. دانش، تاج زمان؛ **معتاد کیست؟ مواد مخدر چیست؟**؛ چ٢؛ تهران: انتشارات کیهان (٢٠٠٦)؛ ص ٧٥.

٩٩. مورتەزەوی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٢.

تاك و کۆمەڵ هەیە ئەویش لەبەر خێرا خووپێوەگرتن لەسەری؛ جا چ لە لایەنی دەروونی بێت یان جەستەیی.[100]

**خەشخاش** گیایەکی ساڵانەیە، گوڵێکی زۆر جوانی هەیە، دوای پێگەیشتنی، گوڵەکان بەرێکی، وەك کەپسولی هێلکەیی یان بازنەیی دێنیتە بەرهەم. قەبارەی لە نێوان بوندوقێك بۆ پرتوقالێکی بچووك دایە. ئەفیۆن لەو دەردراوانە دەردەهێنرێت کە لە ئەنجامی تاڵ تاڵ کردنی کەپسولە پێنەگەیشتوەکان پەیدا دەبێت، لەسەرەتادا ڕەنگی سپییە، پاشان بە کاریگەریی هەوا ڕەنگی بۆ قاوەیی دەگۆرێت، پاشان بۆ رەشێکی تێر. ئەفیۆنی خام زۆر تاڵە، بۆنێکی زۆر بەهێزی هەیە، زیاتر لە ماددەیەکی کیمیایی لێدەردەهێنرێت کە گرنگترینیان مۆرفینە کە دوای هەندێ کرداری کیمیایی تر بۆ هێرۆیین دەگۆرێت، هەروەها کۆدائین کە بۆ شکاندنی ئازار بەکاردەهێندرێت.[101]

**مۆرفین** لە ساڵی (١٨٠٥) لە تریاك وەرگیرا؛ لە هەر (١٠) کیلۆ تریاك، یەك کیلۆ مۆرفین دروست دەبێت؛ بۆیە زۆر بەهێزترە. مۆرفین لە چەمکی "مۆرفینۆس" کە خوای خەوتنی یونانییەکان بووە وەرگیراوە.[102] زۆربەی خووگرتووەکانی ماددە هۆشبەرەکان، ماددەی مۆرفین لە ڕێگەی شرینقە لێدان لە ژێر پێست، یاخود ماسولکە وەردەگرن. کەم وا دەبێت کە لە ڕێگەی قووتدانەوە وەربگرن؛ چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بەکاربهێنرێت، پێویست دەکات بڕێکی زۆری لێ بەکاربهێنرێت؛ ئەوەش پێویستی بە پارەیەکی زۆر هەیە. لە حاڵەتەکانی

---

١٠٠. قربان حسینی، علی اصغر؛ **پژوهشی نو در مواد مخدر و اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: امیر کبیر (١٩٩٩)؛ ص ٥٤.

١٠١. کوهن، سیدنی؛ **معمای داروها و مواد مخدر**؛ ترجمە: حسینی و جواندوست؛ چ١؛ تهران: مؤسسە مطبوعات علمی (١٩٩٢)؛ ص ٣٣و ٣٤.

١٠٢. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٧.

خووگرتنی پێشکەوتوو، کەسی خووگرتوو یەکسەر شرینقەکە لە دەماری خوێن دەدات، چونکە کاریگەرییەکەی خێراترە وەك لە ژێر پێست بدرێت.[١٠٣]

**هیرۆیین** یەکێکە لە ترسناکترین وەرگیراوەکانی مۆرفین کە لە ساڵی (١٨٧٤) دروستکرا، لەسەرەتادا بە ناوی (دای ئەسیتایل مۆرفین) ناسرا تا ساڵی (١٨٩٨) کۆمپانیای (بایر) بۆ دەرمان ناوی (هیرۆیین)ی لێنا کە ناوێکی یونانییە بە مانای هێما و سەمبۆلی هێز و توانایی. لە هەر یەك کیلۆگرام مورفین، (٩٠٠) گرام هیرۆیین دروست دەبێت.[١٠٤] بازرگانانی ماددە هۆشبەرەکان بە جۆرەها رێگەی کیمیایی، هیرۆیین لە مۆرفین دەردەهێنن، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ماددە ئامادەکراوەیە چەندین خڵتی تێدا بێت، کە لە ئەنجامدا چەند جۆرێکی جیاوازی لێ دروست دەبێت.[١٠٥]

پێکهاتەکانی تریاك زۆرتر بۆ هێورکردنەوەی ئازار کەڵکی لێ وەردەگیرێت و زیاتر کاریگەری بەسەر دەمارەکان (بەتایبەتی دەماری هەستی) هەیە و لە لایەك دەبێتە هۆی نەمانی پاڵەپەستۆ و ڕەقبوونی دەمارەکان و ماسولکەیی و لە لایەکی تر کەسەکە لە ژێر قورسایی هەستە بە ئازارەکان رزگار دەکات. هاوکات لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانە، ناوەندە دەمارەکان دەجولێنێ و هەستێکی خۆشی بۆ دروست دەبێت، بە شێوەیەك کە کەسەکە لە کاتێ نەشەبووندا* گەشبینییەکی بێ هۆ و لە ڕادەبەدەری هەیە کە هەر کارێکی سەخت ئاسان دەبینێ و تەنانەت

---

١٠٣. سجادیە و فدایی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٨٨.

١٠٤. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٧.

١٠٥. آلن کوهن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٣.

* ئەو بارەیە کە کەسی بەکارهێنەری ماددەی هۆشبەر، لە باری ئاگایی دەوروبەر بۆ باری نائاگایی دەگوازرێتەوە.

**هەرکارێکی نامومکین بە مومکین دەبینێت؛ هەر ئەوەشە دەبێتە هۆی دووبارە بەکارهێنانەوەی ماددەکە![106]**

**کۆمەڵی تریاك یان ئەفیۆنەکان بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردەهێنرێت: رزگاربوون لە ئازار، هەستکردن بە ئاسوودەبوون و خۆشی و قوتاربوون، هەستکردن بە چالاکی و شادی، کە هەناسەوەرگرتن زەحمەت دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی خاوبوونەوە و هێوربوونەوە، هەندێ جار هەستکردن بە سەرگەرمی و هەندێ جاریش هەستکردن بە خەمۆکی، هەروەك دەبێتە هۆی خەواڵووبوون و نووستن.[107] ئەوانەی مۆرفین وەردەگرن تووشی هەڵچوون و وروژانێکی زۆری دەمارەکان دەبن، لە نیشانەکانی: دڵ تێکهەڵاتن، ڕشانەوە، بچووکبوون و چوونەناویەکی بیلبیلەی چاو، زیادبوونی هێزی هەڵگەڕانەوەی دڕکە پەتك و گرژبوونی ماسوولکە و دەبێتە هۆی چوونەوەیەکی ماسولکەکانی گەدە و ڕیخۆڵەکان، ئەوەش وادەکات کە خواردن بە هێواشی بڕوات و ببێتە هۆی قەبزی. لە کاریگەرە بێزارکەرەکانی مۆرفین: ڕشانەوە، زۆر ئارەقەکردن، خورانی پێست و خووپێوەگرتن و هەروەها لێدانی دڵ هێواش دەکات و پەستانی خوێن دادەبەزێنێت. ئەم کۆمەڵە دەبێتە هۆی خووپێوەگرتنێکی خێرا و بەهێز. دەستهەڵگرتن لە تریاك و کۆمەڵەکەی و وەرنەگرتنی، بێزارییەکی زۆر دروست دەکات، بەڵام نابێتە هۆی مردن، بەڵکو دەبێتە هۆی نەحەوانەوە و ماندووبوون و بێهێزی.[108]**

---

١٠٦. أردوبای، احمد صبور؛ **جوانان و مواد توهم زا**؛ چ١؛ تهران: چاپخانه خورشید (١٩٨٦)؛ ل١٣.

١٠٧. اسعدی، حسن؛ **پژوهشی بنیادی درباره مواد مخدر**؛ بی جا؟ ناشر: مؤلف (٢٠٠٣)؛ ص٦١.

١٠٨. هەمان سەرچاوە؛ ل٦٢.

***ج. چالاککەرەوەکان (Stimulants):***

- کۆکایین (Cocaine)
- کراك (Crack)
- ئەمفیتامینەکان (Amfetamines)
- میثلیفە ندیت (Methlphenidete)
- فێنمێترزین (Phenmetrazine)
- کافیین (Caffeine)

ئەم جۆرە ماددە هۆشبەرەش دەبێتە هۆی هەست کردن بە دڵخۆشی و بوژانەوە و هەستی ماندوویەتی و بێتاقەتیش کەم دەکاتەوە. ئەم ماددانە دەبنە هۆی وروژاندنی بەهێز و توند، بۆ ماوەیەکی کورتیش تێکچوون و شلۆقی بیر و هۆش نزم دەکاتەوە. ئەم کۆمەڵەیە ئەگەری خووپێوەگرتنی زۆرە، لەگەڵ ئەوەی وازهێنانی دیاریکراوە کە بریتیە لە هەستکردنێکی کاتی، بە ماندووبوون و بێتاقەتی و خەمۆکی و دابەزینی میزاج.[١٠٩]

**کۆکایین** لە رێگەی بۆنکردن، قوتدان، لێدانی شرینقە لە دەماری خوێن بەکاردەهێنرێت، کە بەم شێوەیە ماددە هۆشبەرەکە یەکسەر دەچیتە سووڕی خوێن؛ بۆیە کاریگەریی خێراترە، بەڵام ماوەی کاریگرییەکەی کورتترە. بۆیە هەندێ جار، لە ماوەی چەند خولەکێك کرداری شرینقە لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە بە هیوای ئەوەی ئەو هەستەی لێی چاوەڕوان دەکرێت بەردەوام بێت.[١١٠] کاریگەرییەکانی کۆکایین لە دوای نیوکاتژمێر دیار دەکەوێ. کاتی خۆی

---

١٠٩. مشاقبة؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٢.

١١٠. داجن، چارلز ای؛ **روانشناسی اعتیاد (سنجش و درمان)**؛ ترجمە: بایرامعلی رنجگر؛ چ١؛ تهران: نشر روان (٢٠٠٤)؛ ص ٣١.

له سەدەی ١٦ زایینی دا ئیسپانییەکان بۆ کەمکردنەوەی هەستی برسێیەتی و تێنۆیەتی کرێکارانی کانی و خەڵوز، بەکاریان دەبرد.[١١١]

**کراك** کە لە کۆکایین وەردەگیرێت، لە ڕووی خووگرتن لە کۆکایین زۆر بەهێزتر و مەترسیدارترە. کۆکایین لە دوای هەڵمژین تەنیا ٨ خولەکی پێدەچێ تاکو دەگاتە مێشك و کاریگەرییەکانی دەست پێدەکات، کەچی کراك تەنیا چەند چرکەیەك ناخایەنێ کە لە ڕێگەی سیستەمی هەناسەوە خۆی دەگەیەنێتە مێشك[١١٢] و بە شێوەیەکی زۆر مەترسیدار کار دەکاتە سەر سیستەمی دەماری و دەروونی تا ڕادەیەك کە تاکی بەکارهێنەر خۆی بەزردەکاتەوە و زۆر جار دەبێتە هۆی مردن.[١١٣]

**کاریگەرییەکانی کۆکایین:** کاتێك کۆکایین بەر پێست یان ڕیشاڵە لینجەکان دەکەویت، دەبێتە هۆی سڕکردنی شوێنەکە، کە لە لایەن پێست یان ڕیشاڵە لینجەکە بە خێرایی دەمژرێت، کۆکایین دەبێتە وەستانی نیشانە کارەباییەکانی پەلە دەمارەکان، ئەوەش فراوانبوونی گلێنەی چاو و بچوکبوونی مولوولە خوێنەکان و خێرابوونی لێدانی دڵی لێدەکەوێتەوە، هەروەك دەبێتە هۆی بێدارکردنی ناوەندە کۆئەندامی دەمار، ئەمەش هۆکارە بۆ زۆر جوڵانەوە و قسە کردن و جێگیر نەبوون، پاشان لەرزینی هەردوو دەست و پێیەکان، پاشان هەڵچوونی دەمار و ڕەنگ زەرد بوون، وا دەکات ئارەقەی سارد بکات و

---

١١١. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٨٤.

١١٢. صديق سروستانی، د. رحمت الله؛ **آسیب شناسی اجتماعی: جامعەشناسی انحرافات**؛ چ١؛ تهران: انتشارات سمت (٢٠٠٧)؛ ص١٨٨.

١١٣. نیك صالحی، جواد؛ **کراك تابوی سیاه**؛ مەقالەی ئینتەرنێتی لە سایتی:
www.farsnews.com/

هەناسەدانی خێرا و شین هەڵگەرانی پێست، پاشان نۆرەکانی گەشکە، ژەهراوی بوون بە کۆکایین دەبێتە هۆی ناڕێکی لێدانی دڵ.[١١٤]

**ئەمفیتامینەکان** (کە زۆر جار بە شیشە یان کریستاڵ یان حەبی ئێکستاسی ناودەبرێت)[١١٥] یەکەمجار لە ساڵی (١٨٨٧) دروستکرا، دواتر لە ساڵی (١٩٢٨) بە خێرایی دوو کۆمپانیای گەورەی دەرمان (سمیث دکلاین) و (فرنس)، بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی هەوکردنی پەردەی لینجی لووت دەبون وەکو دەرمانی بەخخاخی هەڵمژین خستیانە بازاڕ و ناوێکی بازرگانیان لێنا ئەویش (بەنزۆرین) بوو. لە ساڵی (١٩٣٥) ماددەکە لەسەر شێوەی (حەب) دروستکرا بۆ حاڵەتەکانی نووستنی بە ناچاری. لە چلەکان بەکارهێنانی ئەمفیتامینەکان لە نێوان قوتابیان بڵاوبووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی نووستن و زیاتر بە بیرهاتنەوەی وانەکان لە کاتیٛ تاقیکردنەوە. پاشان ئەو جۆرە دەرمانانە لە دەرەوەی سنووری ئەکادیمی، ناوبانگیان بڵابووە، بە تایبەتی لە نێوان یاریزانان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. دواتر لە ڕێگەی شرینقە لە دەماری خوێنهەر دەستپێکرا و ئەم زیادبوونە هەر خێراتر دەبوو تا لە ساڵی (١٩٧٢) گەیشتە لووتکەی، پاشان دوای ئەوە بە شێوەیەکی بەرچاو کەم بووە، ئەویش بە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی وەسفە پزیشکییانەی ئەو دەرمانە. هەروەها بە هۆی سەرهەڵدانی ئەو بڕیارە توندانەی کە بۆ سزای وەرگر و بەکارهێنەرانی ئەو دەرمانە دەرچوو.[١١٦]

**کاریگەریی ئەمفیتامینەکان:** کاریگەریی ئەم ماددەیە لە کەسێك بۆ کەسێکی دی و بەپێی بڕی وەرگرتنی دەگۆڕێت، کە گرنگترین کاریگەرییە ڕاستەوخۆکانی ئەمانەن:

---

١١٤. چارلز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤.

١١٥. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٨٥.

١١٦. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٣.

١.  کەمکردنەوەی هەستکردن بە برسێتی و ماندوێتی.
٢.  زۆربوونی جووڵە و چالاکی.
٣.  فراوانبوونی گلێنەی چاو.
٤.  خێرا بوونی لێدانی دڵ.
٥.  تێکچوونی کەم لە هاوسەنگی ماسولکەیی و قسەکردنی پچڕ پچڕ.
٦.  دڵ تێکهەلاتن و ژانە سەر.[١١٧]

بەڵام کاریگەرییە دەروونییەکان دەتوانین گرنگترینیان لەمانە کورت بکەینەوە:

١. متمانە بەخۆبوون.
٢. زۆر قسە کردن و هۆشیاربوونەوەی زیاد.
٣. توانا و وزەیەکی زۆر بۆ وردبوونەوەی فیکری.
٤. زیادبوونی وروژاندنی دەمارەکان.
٥. دوایی بە خەم و دڵەراوکێ و ترس دێنێ.
٦. لەبیرچوونەوە.
٧. دژواری دەروونی لەگەڵ هەوڵی خۆکوشتن.[١١٨]

**کافیین:** لەو چالاککەرەوەکانە کە لە ناو قاوە و چای و کۆکاکۆلا دا هەیە. هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە کافیین مرۆڤـ ئالودە و خووگرتوو دەکات، وەکو کۆکایین و ئەمفیتامین کاری خۆی دەکات، بەڵام بە شێوەیەکی هێواشتر و کەمتر؛ واتە ڕێژەی دۆپامین زیاد دەکات بە هەمان شێوەی کۆکایین و

---

١١٧. چارلز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٨و١٩.

١١٨. هەمان سەرچاوە؛ ل ١٩.

ئەمفیتامین.[119] ثیرومین ئاوێتەیەکی تاڵە کە لە ناو ناوکی کاکاو و قاوە و چای دا هەیە و لە کافیین پێك دێت. ماددەی (کافیین)یش دەبێتە هۆی هەستکردن بە خروشاندن، هەروەها بە شێوەیەکی مام ناوەندی و ئەندازەیەکی کەم هەستی ماندوویەتی و هیلاکی کەم دەکاتەوە. چای و قاوە ئاستێکی نزمی دەست پێوەگرتن دروست دەکەن. نیشانەکانی وازلێهێنانی دیاریکراوە؛ وەکو هەستکردن بە ماندووێتی و شەکەتی و ژانە سەر.[120]

### د. هەڵوەسکارەکان (*Hallucinogenic Drags*):

- حەشیش (Cannabis)
- دای ئەثیل ترشی سیرجیل (LSD)
- مسکالین (Mescaline)
- پیۆت (Peyote)

هەڵوەسکارەکان یاخود خەیاڵسازەکان کۆمەلێك ماددەی دەروونین کاتێك کەسێك وەریان دەگرێ، تووشی هەڵوەسە و خەیاڵ دەبێت کە بینینی ڕاستەقینەی شتەکان لێی دەشێوێنێ، فێڵ لە هەستکردن دروست دەکات، جیاکردنەوەی ڕاستی و خەیاڵ زەحمەت دەبێت. ئەگەر کەسێك بڕێکی زۆری لێوەرگرێت، دەیگەیەنێتە باری هەڵوەسە، پاشان بۆ هەڵوەسەی بینین (واتە بینینی شتێك کە نییە) و هەڵوەسەی دەست لێدان، هەڵوەسەی بۆنکردن و بیستن. ئەم کۆمەڵە هۆشبەرە کاریگەریی دەروونیی بەرزی هەیە، پلەیەکی بەرزی هەڵوەسە دروست دەکات و جگە لە شڵەژان و تێکچوونی پەیبردنی

---

١١٩. هادی، هێمن؛ **خراپ بەکارهێنانی ماددەکان، هۆشبەر چییە؟**؛ چ ١؛ هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (٢٠٠٩)؛ ل ٥٦.

١٢٠. الحجار؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٦.

هەستی، هەندێ جاریش دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەستی سەیر، هەندێ جاری دیش هەست بە ترس.[121]

**ماریجوانا:** مەعجونێکە لە لق و گەڵای گیای شادانە یان قەنەبی هیندی دەردەهێنرێت. **حەشیش** لە شیرەی گیای شادانەیە کە چەند بەرامبەر لە ماریجوانا بەهێزترە.[122] لە ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا دەروێشەکان کەڵکیان لە **بەنگ** یان بنج کە جۆریك لە حەشیشە وەردەگرت و لە ناو جیهانی خەیاڵ و ماخوولیادا نوقم دەبوون! جیهانی واقعی بۆ مرۆڤەکان سەختە، وەکو ئەوە وایە کە حەزێك لە مرۆڤ دایە کە لە ئەقڵی خۆی ڕادەکات و پەنا بۆ جیهانی خەیاڵ دەبات.[123] ڕووەکی شاهدانە لە کەش و هەوای گەرم و مام ناوەند گەشە دەکات، قەبارەکەی بەپێی گۆڕانی ئەو خوڵەی تێدا دەچێندرێت دەگۆڕێت. ماددە کاریگەرەکەی پێی دەگووترێت (کانابیتین). بەکارهێنانی حەشیش وەکو ماددەیەکی هۆشبەر بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە. کاتێك میسرییە کۆنەکان لەسەردەمی (ڕەمسیس)پاشا وەکو چارەسەری هەندێ نەخۆشی بەکاریان دەهێنا. لەسەردەمی ئێستاشماندا بەکارهێنانی حەشیش لە هەموو دونیا بڵاوبووەتەوە و زۆربەی وڵاتان بە دەستیەوە دەناڵێنن. ئەوەی بارەکە خراپتر دەکات ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کەسانەی وەری دەگرن و بەکاری دێنن، گەنج و منداڵەکانن. حەشیش ڕووەکێکی ساڵانەیە درێژی درەختەکانی لە نێوان ١ تا ٥ مەتر دەبێت، پێی دەگوترێ قەنەبی هیندی یان حەشیش یان ماریجوانا یان بەنگ. هەر گەڵایەك لە چەند گەڵایەکی لاوەکی پێك دێت و ژمارەیان لە نێوان ٣ تا ١٥ گەڵا دەبێت، لەسەرەوەی هەر یەکێك لەو گەڵا لاوەکییانە دەزوولەی وردی

١٢١. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٨.

١٢٢. گورین؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٩٨.

١٢٣. سید أحمد أحمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٩٠.

هەیە، ئەوەش وای لێدەکات زبر بێت لە کاتێ دەست لێدانی. مادده کاریگەرەکەش لە لووتکە پەرئەستێنەکان کۆبۆتەوە؛ واتە ئەو لایەنانەی ڕووەکەکە کە گوڵ دەگرێت، تێبینی ئەوە دەکرێت کە مێروو خۆی لەو جۆرە ڕووەکە بە دوور دەگرێت.[١٢٤]

ئەو کەسەی حەشیش وەردەگرێت دوو ئارەزووی هەیە ئەوانیش:

١. ئارەزووی ئەوەی هۆشبەرەکە ماوەیەکی زۆرتر بەردەوام بێت، لەگەڵ زیادبوونی کاری هۆشبەرەکە.

٢. ئارەزووی زیادبوونی توانای سێکسی.[١٢٥]

**کاریگەرییەکانی حەشیش:** کاریگەرییەکانی حەشیش دوای (٥) خولەك لە دوای بەکارهێنانی دەست پێدەکات و لە نیو تا دوو کاتژمێر درێژە دەکێشێ.[١٢٦] ئەگەر بە ڕێژەیەکی کەم حەشیش بەکاربهێنرێت، دەبێتە هۆی ڕوودانی بوژانەوەیەکی کەم، بەڵام ئەگەر بە ڕێژەیەکی زیاد بەکاربهێنرێت، ئەوا دەبێتە هۆی هەڵوەسە و خەیاڵ و داڵغەیەکی وا کە بە ڕادەیەکی زۆر بە حەبەکانی هەڵوەسە وەکو LSD و ئیستاسی (Ecstasy drug) دەچێت،[١٢٧] لە نێوان کاریگەرییە ئاشکرا و گرنگەکانی زۆر پێکەنینە بە دەنگێکی گەورە، گرنگی نەدان و تێکچوونی ئاڵۆزی هەست و پەیبردن و هۆش، جێگرنەبوونی وەڵامدانەوەی سۆزداری و دەشبێتە هۆی ئاڵۆزی پەیبردنی هەست بۆ کات و شوێن، گۆڕانی میزاج و تێکدانی توانای زاڵبوون بە سەر شتەکان.[١٢٨]

---

١٢٤. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٥.

١٢٥. رعدی و دیگران؛ **راهنمای پیشگیری از اعتیاد (ویژه خانوادەها)**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٦٢.

١٢٦. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٨.

١٢٧. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٦.

١٢٨. چارلز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٨.

بەڵام کاریگەرییە جەستەییەکانی بەکارهێنانی حەشیش ئەمانەن: لێدانی خێرای دڵ و ناڕێککردنی، کەمیی پەستانی خوێن، سەرسووڕان، هەوکردنی گلێنەی چاو، هەستکردن بە وشکی دەم و گەرو، هەندێ جار دڵ تێکهەلاتن و ڕشانەوە، مژینی بڕێکی زۆری حەشیش دەبێتە هۆی هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە.[١٢٩]

### *و. توێنەرە هەڵمژراوەکان (Volatile Inhalant)؛*

ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ کۆمەڵی نیکۆتین لەبەر ئەوەی لە هەموو وڵاتانی دونیا بە مەوادی نایاسایی دانانرێت، بە ئاسانی لە هەموو بازاڕەکاندا بە دەست دەکەون؛ کەچی ئاسەوارەکانی تا ڕادەیەکی زۆر بە مەوادە هۆشبەرە نایاساییەکانی دی دەچێ.

کۆمەڵی توێنەرە هەڵمژراوەکان یان کەلوپەلی هەڵچوو (المذيبات الطيارة) بریتین لە: چەسب و غەررە، بۆیاغی پێڵاو و سەیارە، سیکۆتین، پترۆڵ بە تایبەتی بەنزین و تینەر، ئیثر، وارنیش، ئەسیتون (کە بۆ پاککردنی ڕەنگی جوانکاری لە نینۆکی ژنان بەکار دێت).[١٣٠] کاتێ تاکی بەکارهێنەر لە ڕێگای لووت یان دەمەوە ئەم مەوادانە بۆن دەکات یان هەڵدەمژێ، تووشی نیشانەکانی وەك ئەلکهۆل و باربیتورەکان و تریاك و وەگێراوەکانی دەبێت کە دەبێتە هۆی سەرخۆشی و نەشەبوون، خەواڵووبون، زمانگرتن (لكنة الكلام)، دڵەڕاوکێ، وروژاندن و شادی و خۆشی، هەڵوەسە و قسەی نادیار و هەزیان گووتن و... کە ماوەکەی لەوانەیە لە چەند خولەکێك بۆ چەند ساتێك بەردەوام بێت و لە تاکێك

---

١٢٩. هێمن هادی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٦.

١٣٠. الحجار؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٠.

بۆ تاكێكی تر دەگۆڕێت.[131] دوای هەفتەیەك بەكارهێنانی ئەم جۆرە ماددانە تووشی خووپێوەگرتن دەبن و دوای ماوەیەك ڕۆژ بە ڕۆژ بۆ ئەوەی چێژ و لەززەتی ڕۆژی یەكەم وەربگرن، بڕی بەكارهێنانیان زیاتر دەكەن.[132]

ئەم كۆمەڵەیە زیاتر لە لایەن گەنجەكان و نەوجەوانان بەكار دێت؛ بە تایبەتی ئەوانەی كە تریاك و ماددەهۆشبەرە نایاساییەكانی دیكە بەكار دەهێنن و ناتوانن بە بەردەوامی بۆ خۆیان دابین بكەن.[133] بەپێی ئەو لێكۆلینەوانە كە لە لایەن دەزگای پشتگیری دادگاییكردنی گەنجان لە ساڵی ١٩٩٧ ئەنجام دراون، گروپی تەمەنی خووگرتووان بەم ماددانە زیاتر لە نێوان ١٤ تا ١٧ ساڵە كە بە تەنیایی یان گروپی بەكار دەهێنن.[134]

جگە لە كاریگەرییە دەروونییە سلبییەكانی ئەم كۆمەڵەیە، زۆر كاریگەریی سلبی جەستەیی هەیە كە لەوانە: زیانی جیددی و مەترسیدار لەسەر گورچیلەكان و جگەر و مێشك و ئێسكەكان بەشێوەك كە بۆ حاڵەتی ئاسایی و پێشوو ناگەڕێتەوە و زۆر جاریش دەبێتە هۆی وەستانی سەنتەری هەناسە و تێكچوونی لێدانی دڵ و خنكان لەبەر قەپاتبوونی ڕێگەكانی هەناسە وەرگرتن.[135]

### هـ. نیكۆتین (Nicotine):

---

131 .Macdonald,D.I., Newton, M. **The clinical syndrome of adolescent drug abuse**. Washington, DC: American psychological Association (1995), pp.149-150.

١٣٢. الحجار؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣١.

١٣٣. كلمن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٩٠.

١٣٤. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٩٩.

١٣٥. كلمن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٩١-٩٢.

ئەم کۆمەڵەیە وەکو کۆمەڵەی پێشوو لە هەموو بازاڕەکانی دونیا دا بە ئاسانی بەدەست دەکەوێ. نیکۆتین ماددەیەی ژەهراوی و هۆشبەرە کە لە جگەرە و تەبغ و نێرگەلە و توباکو دا هەیە. زۆر جار ئەم کۆمەڵەیە بە مەوادە دوکەڵییەوەکان ناودەبەن؛ چونکە هەموویان لە ڕێگای کێشان بەکاردەهێنرێن. زۆر کەم بوە کە توتن و توباکو بخورێ.[١٣٦] بەڵگەی خووپێوەگرتن بە نیکۆتین ئەوەیە کە بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (٧٠٪) جگەرەکێشەکان خوازیاری ئەوەن واز لە جگەرەکێشان بهێنن، بەڵام ناتوانن.[١٣٧]

**کاریگەرییەکانی نیکوتین:** کەمخواردن، نەخەوتن بە تایبەتی ئەوانەی بە شەو زۆر بەکاردەبەن، تێکچوونی سیستەمی گەڕانی خوێن، پەستانی خوێن، سەکتە و وەستانی دڵ لە ڕێگەی قەپاتبوونی دەمارەکانی خوێن بە تایبەتی بوڕییەکانی دڵ، سەکتەی مێشك، نەخۆشی و تێکچونی سیستەمی گەدە و ڕیخۆڵەکان، نەخۆشی درێژخایەنی سیستەمی هەناسە، جۆرەها سەرەتان و شێرپەنجە کە بە شێوەیەکی ڕەسمی و ئاشکرا باسکراوە و سەلمێنراوە.[١٣٨] بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) جگەرەکێشان، لە هەر چرکە و نیوێك لە جیهاندا یەك کەس دەکوژێت.[١٣٩]

---

١٣٦. صرامی، رضا؛ **انواع مواد مخدر، پیشگیری و درمان به زبان ساده**؛ چ١؛ تهران: نشر پرشکوه (٢٠٠٣)؛ ص٤٣.

١٣٧. دزەیی، ڤیان ئەحمەد خدر؛ **جگەرەکێشان وجگەرەکێشانی خۆنەویست**؛ چ١؛ هەولێر: پەرلەمانی کوردستانی عێراق (٢٠٠٩)؛ ل١٦.

١٣٨. العيسوي، د. عبدالرحمن محمد؛ **سيكولوجية الأمراض الخطيرة**؛ ط١؛ بيروت: منشورات الحلبي الحقوقية (٢٠٠٨)؛ ص ١٢٩.

١٣٩. دزەیی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٩.

ئەو دایکانەی کە سکیان هەیە و جگەرە دەکێشن، کار دەکاتە سەر منداڵیان و زۆر جار بوەتە هۆی مردنی منداڵەکەیان بەر لەوەی بێتە دونیا.[١٤٠] هەروەها ئەو مندالانەی کە لە ماڵەوە لەگەڵ دایك و باوکی خووگرتوو بە جگەرە دەژێن، زیاتر تووشی نەخۆشی دەبن؛ بە تایبەتی نەخۆشییەکانی پەیوەندی بە سیستەمی هەناسە.[١٤١]

١٤٠. العيسوي، د. عبدالرحمن محمد؛ **جنوح الشباب المعاصر و مشكلاته**؛ ط١؛ بيروت: منشورات الحلبي الحقوقية (٢٠٠٤)؛ ص ٤٢٣.

١٤١. ايزدی، علی؛ **هشدار به خانوادەها**؛ مەقالەی ئینتەرنێتی لە سایتی آفتاب: www.aftab.ir/

## خشتەی خوارەوە* جۆری مادده هۆشبەر و نموونە و کاریگەرییان ڕوون دەکاتەوە[142]

| جۆری هۆشبەرەکە | نموونە | کاریگەری | ڕێژەی خووگرتنی جەستەیی | ڕێژەی خووگرتنی دەروونی | ڕێژەی تحمل (پێویستی بە ژەمی زیاتر) |
|---|---|---|---|---|---|
| هێمنکەرەوەکان | مەی، باربیتیۆرەکان، ئازار شکێنەرەکان، خەوێنەرەکان | سستی، هەست کردن بە خۆشی و خاوبوونەوە | زۆر | زۆر | ناوەند |
| ئەفیۆنەکان | مۆرفین، هیرۆیین، میثادون | ئازار شکاندن، هەست کردن بە خۆشی و شادی و بوژانەوە و سەربەخۆیی | زۆر | زۆر | زۆر |
| چالاککەرەوەکان | کۆکاین، ئەمفیتامینەکان | کەمکردنەوەی هەستی ماندوویەتی و برسێتی، دڵخۆش و شاد بوون، بوژانەوە | نییە | زۆر | زۆر |
| هەلوەسکارەکان | حەشیش، ماریجوانا، دای ئە ثیل ترشی سیرجیل مسکالین، پیوت | هەلوەسە کردن، تێکچوونی پەی بردنی هەستی، گرنگی نەدان بە کەسانی دی | نییە | ناوەند | کەم |
| نیکۆتین | تۆباکۆ | ئازار شکێنە، وریاکەرەوەیە | کەم | ناوەند | کەم |
| ماددەی هەڵمیو | چەسب و غەررە، بۆیەی شل کە تێکەڵی چەورین، وارنیش | سستی ، خاو بوونەوە، ئالۆزیپەی بردنی هەستی. | کەم | ناوەند | ناوەند |

* ئەم خشتەیە تێکەڵێکە لە دوو خشتەی جیا کە بە کەمێك دەستکارییەوە لە دوو سەرچاوەم وەرگرتووە.

142. Macdonald, op.cit, p 174. & Carl, G. **Drug abuse prevention**. New York (2000), P 93.

## دەستپێك:

تاکو ئێستا دەروونناسان، کۆمەڵناسان و بە گشتی توێژەران، چەندین تیۆریان داناوە لە بواری: بۆچی مرۆڤ خوو بە ماددەی هۆشبەر دەگرێ؟ هۆکاری ڕەفتاری ـ کۆمەڵایەتی خووگرتن کامانەن؟ بۆ نموونە گروپێکیان باوەڕیان وایە، چونکە ئەم ماددانە لەبەر دەستی تاکەکانن، بۆیە بەکاری دەهێنن! بە واتایەکی تر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان پێویستە ئەم ماددانە لەناو ببەیین و دژی ئەو کەسانە بوەستین کە خەریکی مامەڵەکردنن بە ماددە هۆشبەرەکان.[١٤٣]

گریمانەی تر پشت بە کەسایەتی تاکەکان دەبەستێت و ئامادەگی دەروونی و شلەژانی کەسایەتی بەڵگەی تووشبوون بەو نەخۆشییە دەزانن. لایەنگرانی ئەم تیۆرە بە تایبەتی دەروونناسان بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئەوانەی لە ڕووی دەروونی و کەسایەتییەوە خاوەن پەرێشانین و ناتوانن لە بەرامبەر گرفتەکانی ژیان و شکست و ناکامییەکانی خۆڕاگر بن، بۆ هەڵاتن لەم گرفتانە ڕوو دەکەنە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان.[١٤٤]

بەڵام گریمانەی تر بە پێچەوانەوە پشت بە کاریگەریی کۆمەڵگا دەبەستێت. لایەنگرانی ئەم تیۆرە باوەڕیان وایە سوود وەرگرتن لە ماددە هۆشبەرەکان ڕفتارێکی کۆمەڵایەتییە و تاك لە ژیانی گروپیدا لەگەڵ ئەو کەسانە هەڵسوکەوت دەکات، کە ئەم ماددانە بەکاردێنن یان دەیخەنە بەر دەستی خەڵك، بەم شێوەیە

١٤٣. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٤.

١٤٤. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٨٦.

لە ژێر کاریگەریی کۆمەڵگا، بۆ لای ماددە هۆشبەرەکان هان دەدرێت و قەبوڵی دەکات.[145]

هەڵبەتە نابێ ئەومان لە بیر بچێت کە بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەی خووگرتن، ئەوەی لە هەموویان گرنگترە، بریتییە لە پرسەکانی تایبەت بە کێشەناسی، کە تاکی خووگرتوو لە ڕووی تایبەتمەندییەکانی کەسی و دەروونی، خێزانی و کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری دەخاتە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە.[146]

بەپێی سەرچاوەکان، دەتوانین ئاماژە بە سێ ڕوانگەی تیۆری بکەین (تیۆرە بایۆلۆژی و فیزیۆلۆژییەکان، تیۆرە دەروونییەکان و تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان)، کە کاریان بریتییە لە شیتەڵکردن و شیکردنەوەی هۆکارەکان لە لێکۆڵینەوەی تووشبون بە ماددە هۆشبەرەکان، کە هەر یەك لەو ڕوانگانە چەند تیۆری دیکە دەگرێتەخۆ کە لێرە هەوڵ دەدەین بە پشت بەستن بە سەرچاوە جۆراوجۆرەکان بە کورتی لەسەریان بدوێین:

---

١٤٥. هەمان سەرچاوە؛ ل ٨٧.

١٤٦. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٥.

## یەکەم: ڕوانگەی بایۆلۆژی و فیزیۆلۆژی

ئەم ڕوانگەیە کۆنترین ڕوانگەکانی تاوانناسی و کێشەناسیی کۆمەڵایەتی (Social Pathology) دەژمێردرێت تا ئەوەی کەسانێکی وەك لۆمبرۆزۆ ــ کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئەم لقە زانستییە ــ جۆری ئەندام و تایبەتمەندییە دەرەکییەکانی تاکەکانی بەکارهێناوە بۆ پۆلینکردنی تاوانبارانی زگماك.[١٤٧] بەڵام توێژینەوەکانی دواتر، بێبنەمابوونی ئەم ڕوانگەیەیان ئاشکرا کرد. ئەگەرچی ناتوانین نکۆڵی لە بوونی هەندێك لە تایبەتمەندیی بایۆلۆژی لە تاکە لادەر و تاوانبارەکان بکرێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت ببێتە بناغەی هەڵێنجانی تیۆری سەرتاپاگیریی تاوان و گرفتی کۆمەڵایەتی و زیاتر بە شتێکی ناوازە دادەنرێت و یاسا نییە.[١٤٨]

### أ. تیۆرە بایۆلۆژییەکان (Biological Theories):

ئەم تیۆرییانە گرنگی بە لایەنی بایۆلۆژیی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان دەدەن کە سێ تیۆری وردتر دەگرێتەخۆ ئەمانەن:

- تیۆری بایۆلۆژیی دەماری (Neurobiological theory/ النظرية العصبية البيولوجية)

---

١٤٧. کی نیا، د.مهدی؛ **مبانی جرم شناسی**؛ ج٢؛ چ٧؛ تهران: انتشارات دانشگاه تهران (١٣٨٤)؛ ص ١٤٣.

١٤٨. اوردوبای، احمد صبور؛ **اعتیاد (شناسایی، علل، پیشگیری)**؛ چ١؛ تبریز: انتشارات سازمان منطقه ای بهداری آذربایجان شرقی (١٣٦٣)؛ ص ٩٩.

- تیۆری ڕەفتاری دەماری (Neurobehavioral theory/ النظرية العصبية السلوكية)
- تیۆری بۆماوەزانی (Genetic theory/ النظرية الجينية)

### ١. تیۆری بایۆلۆژی دەماری:

تەرکیز دەکاتە سەر کردارە یەکەمەکان و لەگەڵ ڕۆڵی ئەو کردارانە بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان. ئامادەیی بۆماوەیی ڕۆڵێکی گەورەی لەم تیۆرەدا هەیە.[١٤٩]

### ٢. تیۆری ڕەفتاری دەماری:

گرفتی ماددە هۆشبەرەکان ڕوون دەکاتەوە، ئەویش لە ڕێگەی پەیوەندیکردنی نێوان ئالۆزی و لێکترازانییە سەرەکییەکانی ڕەفتار و سیستەمی کرداریی دەماری. ئامادەیی بۆماوەیی، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەم تیۆرەدا.[١٥٠]

### ٣. تیۆری بۆماوەیی:

جەخت دەکاتە سەر بۆماوە و سیفەتە بۆماوەییەکان، لەگەڵ توانای تاکەکان بۆ تووشبون بە ماددە هۆشبەرەکان، ئەوەش لە ڕێگەی شیکردنەوەی گەشەسەندنی ئالۆزییەکان و لێکترازانی خووگرتن.[١٥١]

تیۆری بۆماوەیی پێی وایە هیچ شکێکی تێدا نییە کە خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان پرۆسەیەکی بۆماوەییە و پشت دەبەستێت بە ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە بۆماەیی خووپێوەگرتن کە لەوانە:

---

١٤٩. بني يونس، د. محمد محمود؛ **علم النفس الفيسيولوجي**؛ ط١؛ عمان: دار وائل (٢٠٠٢)؛ ص ٢٥٨ ــ مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٠.

١٥٠. بنی یونس؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٥٨ ــ مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٠.

١٥١. چارلز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٨.

أ. لێکۆڵینەوەی ئاژەڵەکان لە تاقیگەکاندا:

زانایان هەندێ مشکیان راهێنا لەسەر خواردنی ئەلکهۆل و تریاك تاکو تووشی خووگرتن بوون. دواتر بۆیان سەلما کە بەشێك لە نەوەی ئەو مشکە خووگرتووانە تووشی هەمان خووگرتن بوونە بە بێ ئەوەی پێشتر ڕاهێنرابن. هەروەها بینیویانە کە ڕەفتاری ئەم تاقمەیە ڕەفتارێکی شەڕەنگێزانەتری هەیە بە نیسبەت ئەو مشکانەی کە تووشی خووپێوەگرتن نەبوونە.[152]

ب. لێکۆڵینەوەی مێژووی خێزانی و ڕەچەڵەکناسی (Genealogy):

توێژەران مێژووی هەندێ پیاوی خووگرتوویان شیکردەوە لە خانەدانێك کە لە کۆتاییدا بۆیان دەرکەوت کە جین و بۆماوەی تایبەت بە خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان بە تایبەتی ئەلکهۆل، لە منداڵەکان و نەوەی ئەوانیش دا دەبینرێت.[153]

١٥٢. فاید، د. حسين علي؛ **سيكولوجية الإدمان**؛ ط١؛ القاهرة: مؤسسة طيبة للنشر و التوزيع (٢٠٠٦)؛ ل ١٦١.

١٥٣. سليمى، على و داورى، محمد؛ **جامعه‌شناسى كجروى**؛ چ٢؛ قم: پژوهشگاه حوزه و دانشگاه (٢٠٠٦)؛ ص ٢٩٢

ـــ الوريكات، عايد عواد؛ **نظريات علم الجريمة**؛ ط١؛ عمان: دار الشروق للنشر و التوزيع (٢٠٠٨)؛ ص ٩٩.

### ج. لێکۆڵینەوەی جمکەکان (Twin study):

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان کە لەسەر دوو برای جمك (توأم) ئەنجام دراوە، نیشانی داوە کە ڕەفتار و نەریتیان لە خواردنەوەی ئەلکهۆل زۆر بە یەکتر چوون لە بەرامبەر دوو برا کە جمك نین.[١٥٤]

### د. لێکۆڵینەوەی تەبەننی و بە منداڵی خۆ قەبوڵ کردن (Adoption study):

لێکۆڵینەوەکان نیشان دەدات ئەو منداڵانەی کە لە دایك و باوکانی پاك، کە خووگرتوو نین، بەڵام لە لایەن دایك و باوکانی خووگرتوو بە منداڵی قەبوڵ کراون و گەورە کراون، کەمتر تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن؛ بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوانەی کە لە دایك و باوکانی خووگرتوو لە دایك دەبن و لە لایەن دایك و باوکانی پاك کە خووگرتوو نین گەورە دەبن، ڕێژەی خووگرتنیان ٤ تا ٥ ئەوەندەی منداڵانی دایك و باوکانی پاکن.[١٥٥]

### هـ. لێکۆڵینەوەی سیما و تایبەتمەندییە ڕەفتاری و دەروونی ـ دەمارییەکان:

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە سیما ڕەفتاری و دەروونی ـ دەمارییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، منداڵەکانی دایك و باوکانی خووگرتوو کەمترین توانایی لە بەجێهێنانی ئەرکەکانی تایبەت بە زمان و قسەکردن و

---

١٥٤. مساواتی آذر، د. مجید؛ **آسیب شناسی اجتماعی ایران**؛ چ٢؛ تهران: انتشارات فـروزش (٢٠٠٤)؛ ص ١١٢-١١٣ ـــ الوریکات؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٠٠.

١٥٥. الوریکات؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠١ـــ چالرز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٤٩.

خوێندن و ئاستی زانستی و... هەیە کە هەموو ئەوانە لە تاکەکانی خووگرتوو دا دەبینرێن.[١٥٦]

کەواتە تایبەتمەندییەکانی بۆماوەیی لە ڕێگەی مێژووی ڕەفتاری خووگرتنی تاکەکانی هەمان خێزان و لە ڕێگەی ئامادەیی بۆماوەیی خێزانەکان بە دیار دەکەون. کاریگەرییە بۆماوەییەکان توانای تاکەکان لەسەر پشتبەستن بە ماددە هۆشبەرەکان شی دەکاتەوە. ئەو تاکانەی کە تایبەتمەندی بۆماوەیی دیکە هەڵدەگرن، ئەوا کارای بۆماوەیی پارێزی و پێشگیری بە دیار دەخەن، وایان لێدەکات لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دوور بکەونەوە. شێوازە بایۆلۆژییە کەسییەکانیش، ئەو جینانەی کە ڕەنگە وا لە تاك بکات تووشی خووگرتن بێت، جیادەکاتەوە و دیارییان دەکات. ئەگەری ئەوەش هەیە کە هەندێ ئەنزیم هەبێت یارمەتی خووگرتن بدات.[١٥٧]

بە هەر حاڵ فاکتەرە جینییەکان بە تەنیا ناتوانن مرۆڤ ئالۆدە بکەن. فاکتەری دیکە هەیە بەشداری خووگرتن دەکات، لەوانە فاکتەری ژینگەیی و بیرۆکەی هەر کەسێك دەربارەی مادده هۆشبەرەکان و کاریگەرییان، خێزان، کاریگەریی هاوڕێ، فشاری ڕۆژانە، ئاستی ڕۆشنبیری. ئەو فاکتەرانە لەگەڵ فاکتەری بۆماوەیی بەشدارن لە گرفتی خووگرتن بە مادده هوشبەرەکان، گۆڕانکاری لە مێشك دروست دەکات بە ئاگای دەهێنێت و دەیوروژێنێت. ڕەنگە کەسانی شلەژاو، ئەوانەی وەسوەسەیان هەیە، ئەوانەی بە زۆر کاریان بە سەر

١٥٦. فايد، د. حسين علي؛ **المشكلات النفسية الإجتماعية رؤية تفسيرية**؛ ط١؛ القاهرة: مؤسسة طيبة للنشر و التوزيع (٢٠٠٥)؛ ص ٣٩.

١٥٧. سليمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٢٩٩-٣٠٣.

چەسپاوە، ئەوانەی خواردنیان شیۆاوە و ئەوانەی لەسەر حەشیش خووگرتوو بوون، یان ئالۆزیی دیکەیان هەیە، ئەو ماددە هۆشبەرانە کاریان تێبکات.[١٥٨]

## ب. تیۆریە فیزیۆلۆژییەکان (Physiological theories):

زۆربەی توێژەران هۆکاری خووگرتن بۆ تیۆرە فیزیۆلۆژییەکان دەگەڕێننەوە. تیۆریە فیزیۆلۆژییەکان جەخت دەکەنە سەر بونیادی کیمیایی ماددەی هۆشبەر لە لایەکەوە و ئاسەوارەکانی لەسەر جەستە لە لایەکی تر. هەروەها گرنگی دەدەن بە شیکردنەوەی چۆنیەتی دروستبوونی پشتبەستن (الإعتماد/Independence) و تەحەمەول کردن (الإحتمال/Tolerance).[١٥٩]

هەندێ ماددە هەن کە لە لایەن مێشکەوە بە شێوەی سروشتی بۆ هێورکردنی ئێشەکانمان دەردەرێن کە پێیان دەگوترێ: (ئندورفینەکان/Endorphins) و (ئنکفالینەکان/Encephalins)، کە لە ماددەکانی وەکو ئەفیۆنەکان پێکهاتووە؛ واتە دەتوانین بڵێین تریاکێکی ناوەکییە کە لە مێشکی مرۆڤەوە بۆ هێورکردنی ئێش و ئازارەکانی مرۆڤ دەردەبرێن. ئەم تیۆرە پێی وایە کە تاکی خووگرتوو خاوەنی ڕێژەیەکی کەمی ئەم ئەفیۆنە ناوەکی و سروشتییە لە ناو مێشکی دا؛ بۆیە پەنا دەباتە بەر ئەفیۆنی دەرەکی و درەختی. لە دوای بەکارهێنانی ئەفیۆنی دەرەکی، ئەوا تووشی پشتبەستن دەبێت و دوای ماوەیەك بەو برە ماددەیە تێر نابێت و تووشی حاڵەتی تەحەمول دەبێت و دەبێ ڕۆژ بە ڕۆژ بڕی ماددەکەی زیاتر بکات، کە لە ئەنجامدا لە کاتێ هەبوونی هەر ئێش و ئازارێکی جەستەیی و

---

١٥٨. برفي؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٠٦.

١٥٩. بني يونس؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٦٣-٢٦٤ ــ مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٦.

تەنانەت دەرونی، ئەوا مێشك ناتوانێ ئەفیۆنی ناوەکی و سروشتی دەربدات و هەر بە یەکجاری لە کار دەکەوێ و تەنها چاوەڕوانی ئەفیۆنی دەرەکی

دەتوانین تیۆرە فیزیۆلۆژییەکان بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە کە بریتین لە:

- تیۆری خۆراکی (Food theory/ النظرية الغذائية)
- تیۆری هەڵگێڕانەوە یان متابۆلیك (Metabolic theory/ النظرية الإستقلابية)
- تیۆری کوێرە رژێنەکان (Theory of Endocrine/ النظرية الغدد الصماء)
- تیۆری خۆگونجاندنی کۆئەندامە دەمار ( Theory of adaptation nervous system/ نظرية تكيف الجهاز العصبي)
- تیۆری شێوانی ماددە شلەکانی جەستە ( Theory of Perturbation in body fluids/ نظرية الإضطراب في سوائل الجسم)

### ١. تیۆری خۆراکی:

وای بۆ دەچێت ئەو کەسانەی پێویستیان بە هەندێ ماددەی خۆراکی هەیە کە دەست بە خواردنەوەی ئەلکهۆل و ماددە هۆشبەرەکان بکەن، ئەوا توانای وەرگرتنی ماددە خۆراکییەکانیان کەم دەبێتەوە و تووشی ناتەواوی خۆراکی

---

١٦٠. مصلح، سامي؛ **رحلة في عالم المخدرات**؛ ط١؛ القاهرة: دار البشير للطبعة و النشر و التوزيع (١٩٩٨)؛ ص ٥٣-٥٤.

دەبن، جگە لە تێکچوون و شڵەژانی ئەندام و کارەکانی جەستە. ئەوەش وای لێدەکات جەستەکەی لەسەر ئەلکهۆل و مادده هۆشبەرەکان خۆراك وەرگرێ.[161]

### ٢. تیۆری هەڵگێڕانەوە:

وای دەبینێت کە ئەلکهۆل لەناو جگەر (کبد)دا دەئۆکسێت ئەگەر بە شێوەیەکی بەردەوام ئەلکهۆل بەکار بهێنرێت، ئەوا کرداری ئۆکساندنەکە خێراتر دەبێت. متابۆلیزمی خێرا (خێرا هەڵگەڕانەوە) دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسەکە پێویستی بە ژەمی زیاتر هەبێت و پاشانیش ببێتە خووگرتوو. ئەم تیۆرییە ئاماژە بەوەش دەکات کە جگەری کەسی خووگرتوو ماددەی کیمیای وا پوختە دەکا کە پاڵپشتی لە پرۆسەی خووگرتن دەکات.[162]

### ٣. تیۆری کوێرە رژێنەکان:

هۆی خووگرتن بۆ نارێکی دەردان و ئیفرازکردنی کوێرە رژێنەکان دەگێڕێتەوە. کوێرە رژێنەکان ئەرکەکانی جەستە رێکدەخەن. نیشانەکانی ئەو نارێکییەی کە لە کوێرە ڕژێنەکان ڕوو دەدات بە نیشانەکانی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان دەچێت.[163]

### ٤. تیۆری ڕاهاتن و خۆگونجاندنی کۆ ئەندامە دەمار:

پێی وایە خانەکان کاری خۆیان لەگەڵ ئەو ماددەیەی کە تاکی خووگرتوو وەریدەگرێت، ڕادەهێنن. ئەو ڕاهێنانە دەبێتە هۆی ئەوەی خانەکان بتوانن لە

---

١٦١. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٦.

١٦٢. عبد القوي، سامي؛ **مدخل إلى علم الأدوية النفسية**؛ ط١؛ القاهرة: مكتبة النهضة المصرية (١٩٩٦)؛ ص ٣٣.

١٦٣. الزراد، فيصل و أبومغيصيب، عابد؛ **الإدمان على الكحول و المخدرات و المؤثرات العقلية (التشخيص و العلاج)**؛ ط١؛ بيروت: اليمامة للطباعة و النشر و التوزيع (٢٠٠١)؛ ص ٦٨.

بەرامبەر کاریگەریی مادده هۆشبەرەکان بوەستن کە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ وەریدەگریت. ئەو ڕاهاتنەی دەرمانەکانیش دەبێتە هۆی وروژاندنی دەمار و ئازاری جەستە و نیشانەکانی پاشەکشێ کاتێك کەسی خووگرتوو بە شێوەیەکی لەناکاو واز لەو مادە هۆشبەرە دەهێنێت.[١٦٤]

### ٥. تیۆری ئاڵۆزی و شێوانی شلەی ناو جەستە:

وای دەبینێت کە خواردنەوەی ئەلکهۆل دەبێتە هۆی گۆڕانێکی کاتی لە شلەکانی ناو جەستە و هەروەها لە هاوسەنگی ئاو و دەشبێتە هۆی کەمبوونی شلە لە ناو خانەکاندا. ئەوەش وا دەکات کەسی خووگرتوو هەست بە تینوێتی بکات لەگەڵ بەردەوامبوونی زیادکردنی ئەلکهۆل ناهاوسەنگیش لە شلەی ناو جەستە زیاد دەکات. ئەوەش وا دەکات پێویستی بە وەرگرتنی ئەلکهۆل زیاد بکات بۆ هاوکێشکردنی ئەو ناهاوسەنگییە. هەندێ لە پزیشکان بڕوایان وایە، کە ئەو ئاڵۆزییەی لە هەندێ توخمی ناو شلەی جەستە ڕوو دەدات، وا دەکات کە پێویستی بە ئەلکهۆلی زیاتر بێت.[١٦٥]

---

١٦٤. عبدالقوی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٤.

١٦٥. الزراد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٩.

## دووەم: ڕوانگەی دەروونناسی:

بۆ چەندین ساڵ پسپۆڕانی دەروونی گرفتی بەکارهێنان و خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان بە نیشانەکانی شێوانی دەروونییان دادەنا؛ نەك خودی شێوان و تێکچوونی دەروونی؛ واتە پێیان وابوو کە نە شێوانی دەرونییە و نە شێوانی کەسایەتی. بەڵام ئێستا هەر یەکە لە کۆمەڵەی پزیشکی دەروونیی ئەمەریکی و کۆمەڵەی دەروونناسی ئەمەریکی، ئەوە دووپات دەکەنەوە کە خووگرتن خۆی لە خۆیدا شڵەژان و ئالۆزییە؛ نەك تەنها نیشانەیەکی ئالۆزی و شڵەژان بێت. ئێستا زۆر تیۆری دەروونناسی لایەنگیری ئەو بۆچوونە نوێیە دەکەن و پێشکەوتنی شێواز و جۆری چارەسەری و ڕێ نیشاندان بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ماددەهۆشبەرکان لەسەر ئەو لێکدانەوانە بەندە[١٦٦].

ئەم ڕوانگەیە چەندین تیۆری دەروونی دەگرێتەخو کە لەوانەی خوارەوە کورت دەکەینەوە:

- تیۆری ڕەفتاری (Behavioral theory/ النظرية السلوكية)
- تیۆری مەرجی (Conditioning theory/ النظرية الشرطية)
- تیۆری سایکۆدینامیکی (Psychodynamic theory/ النظرية السيكودينامية)
- تیۆری نیشان و تایبەتمەندییەکان ( Trait theory/ نظرية السمات)
- تیۆری ڕەفتاری مەعریفی(Cognitive-behavior theory/ النظرية السلوكية المعرفية)
- تیۆری پێشبینیکردن (Expectancy theory/ النظرية التوقع)
- تیۆری دانەپاڵ (Attribution theory/ نظرية العزو)

---

١٦٦. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦١.

• تیۆری بەڕێوەبردنی فشار –پاڵەپەستۆ– ( Stress-management theory/ نظرية إدارة الضغط)

***١. تیۆری ڕەفتاری:***

جێبەجێکردنی مەرجی کلاسیکی (classical conditioning) بۆ بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر و خووپێوەگرتنیان روون دەکاتەوە. ئەم تیۆرییە پێی وایە کە تاکەکان ئەو ڕەفتارانەی کە بتوانن ئەنجام دەدەن، دووبارە دەکەنەوە و ئەو ڕەفتارانەی کە ناتوانن ئەنجامی بدەن یان بە هۆیانەوە سەرزەنشت دەکرێن، دوور دەخەنەوە.[١٦٧] ئەم تیۆرییە دەڵێت: ئەگەر لە پشت ڕەفتاری خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان پاڵنەری ئیجابی لە تەجاروب و جێبەجێکردنی مەرجی هەبێت، وەك ئەو ڕەفتارە ئاساییەکانی دیکە وەکو خۆراك و پارە و... کە بۆ هەر کەسێك ئاساییە و دەتوانێت ئەنجامی بدات، کەسەکە لەسەر ڕەفتاری خووگرتن مەرجی دەبێت و بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە.[١٦٨] کەواتە بەرکاهێنان و خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان، ڕەفتارێکی فێرکراوە. تاك کاتێ کە هەست بە دڵەڕاوکێ و شڵەژانی بکات و پەنا بباتە ماددەی هۆشبەر و هەست بە هێمنی و خۆشی بکات، ئەوا دەبێتە هۆی بەکارهێنانی دووبارە.[١٦٩]

---

١٦٧. فاید؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٤١.

168.Stolerman, I, **Behavioral pharmacology of addiction**, In L. Glass (Ed.). The international handbook addiction behavior (2001), New York: Routledge, p 19.

١٦٩. الدمرداش، د. عادل؛ **الإدمان مظاهره و علاجه**؛ الكويت: المجلس الوطني للفنون و الآداب، سلسلة عالم المعرفة (١٩٨٢)؛ العدد ٥٦؛ ص١٢٦.

***٢. تیۆری مەرجی:***

یارمەتی پسپۆڕان و خووگرتووەکان دەدات بۆ تێگەیشتنی زاراوەکانی بەرگەگرتن و تەحەممول کردن (التحمل/Tolerance)، ئارەزوو و هەوەسی زۆر (الرغبة الملحة/craving) و، وازهێنان (الإنسحاب/Withdrawal). هەروەها ئەو ڕۆڵە گرنگەی شیدەکاتەوە کە مەرجی ئیجرائی (Operant conditioning/ الإشراط الإجرائي) لە پێشخستن و بەردەوامکردنی ڕەفتاری بەکارهێنان و خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان دەبینیٚ؛ کەواتە بەپێی ئەم تیۆرییەش، ڕەفتاری خووگرتن وەکو هەموو ڕەفتارێکی دی، ڕەفتارێکی وەرگیراو و فێرکراوە.[170]

***٣. تیۆری سایکۆدینامیکی:***

بەو شێوەیە دیاردەی خووگرتن شیدەکاتەوە کاتێك کەسێك مادده هۆشبەرەکان بەکاردەهێنیت، ئەوا خووگرتن لە لایەنیان پەرەدەسێنێت، بۆ ئەوەی هەستی خۆشیان لا دروست بێت، لەگەڵ هەستی هەڵاتن لە ئازار. لەوانەیە ململانێی نێوان خود(ID) و من(Ego) و منی باڵا(super ego) وا لەو تاکە بکات کە ئەو ماددانە وەرگرێت بە مەبەستی ڕزگاربوون لە دڵەڕاوکێ. لە داواکارییەکانی من(Ego) گرنگی دانە بە خود و پارێزگاریکردنە لە ئازارەکان. هەر شێوان و ئاڵۆزییەك لە خودی کەس و ڕووخاندنی نەفس، نیشانەی لاوازبوونی داواکارییەکانی (من)ن .(من) هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی هەست و سۆزیش.[171]

بەپێی تیۆری سایکۆدینامیکی، کەمبوونی گرنگیدان بەخود و کەمبونی ڕێزلێنانی نەفس و هەست نەکردن بە خۆشی هەردووکیان بە یەکەوە ناتوانن

---

170. Rasmussen, Sandra. **Addiction treatment theory and practice**, sage publications, INC, (2003), P 97.
171. Ibid, (p 98).

دەست بەسەر هەستدا بگرن، بەشداری لەوەش دەکەن کە کەسەکان بۆ خووگرتن هان بدەن.[172]

ڕواڵەتەکانی دی سایکۆدینامیك ئەمانە لە خۆدەگریت: بە زۆر ڕەفتارکردن و نەبوونی سەربەخۆیی خود و ڕووخانی نەفس و هەست نەکردنی بە لێپرسیارییەتی و لاوازبوونی ویست و ئیرادە و پاشەکشە و گۆڕانی هەوەس و ئارەزوو، ئەوجا کەسەکان میکانیزمی دیکە بە کار دەهێنن بۆ بەرگریکردن وەکو خۆ قوتارکردن و فرێدان. ئەوەش بۆ ئەوەی دەستنیشانکردنی ئالۆزییەکانی خووگرتن ڕەت بکەنەوە و بەرهەڵستی چارەسەریش ببنەوە. پسپۆڕان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە نەخوشییە دەرونییەکان توانای ئەوەیان هەیە، کە پەرە بە خووگرتن بدەن، یاخود وا لە کەسەکان بکات ببنە خووگرتوو. یەکێك لە کرۆك و بناغەکانی تەندروستیی دەروونی ئەوەیە کە پسپۆڕان نەخۆشەکانیان لە ئالۆزی و شێوانە دوولایەکان چارەسەر دەکەن. دەکرێ نەخۆشییە دەرونییەکانیش لەگەڵ یان دوای خووپێوەگرتن دروست بن.[173]

### ٤. تیۆری نیشانەکان:

پێشنیاری ئەوە دەکات کە هەندێ هێما و نیشانەی تایبەتی و کەسی هەبێت وا لە مرۆڤ بکات زیاتر بەلای خووپێوەگرتن بچێت. هیچ بەڵگەیەکیش نییە لەسەر دروستکردنی کەسێتیەك کە خووگرتن ببڕێت و پێشی بکەوێ. لێکۆڵینەوە ئەزموونییەکانیش ناتوانن جیاوازی لە نێوان تایبەتمەندییە کەسییە دیاریکراوەکانی خووگرتووان بکەن. کەسێتی تاکی خووگرتوو بە زۆری بۆ وەسفکردنی ئەو کەسانە بە کاردێت کە پێنەگەیشتوون، ئەوانەی پشت بە

---

١٧٢. فاید؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٧.

١٧٣. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٢.

**کەسانی دی دەبەستن، ئەوانەی کاریان بەسەر سەپێنراوە و، ئەوانەش کە بە ئاسانی ورەیان دادەبەزێ و دادەمرکێنەوە[174].**

**ڕاپۆرتە نوێیەکانیش وەسفی لێکۆلینەوەیەکی کەنەدی دەکەن کە لەسەر (١٠٣٤) مندالّی باخچەی ساوایان ئەنجام دراوە و بۆ ماوەی زیاتر لە دە سالّ لە ژێر چاودێری بوونە بۆ هەلّسەنگاندنی هێما و نیشانەکانی کەسێتییان و پشتی بە ڕاپۆرتەکانی بەکارهێنانی جگەرە و ئەلکهۆل و ماددەی هۆشبەر بەستووە. بابەتی لێکۆلّینەوەکەش لەسەر شتە نائاشناکان بوو. ڕەفتاری دوورکەوتنەوە لە ئازار و چالاکی لە ڕادەبەدەر ئەو ڕەفتارەیە کە پێشبینی دەکرێ بۆ جگەرەکێشان و دەستکەوتنی ئەلکهۆل و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان؛ بۆیە توێژەران بە دایك و باوکان و مامۆستایان ئامۆژگاری دەکەن کە لە ڕووی ئەو هێما و نیشانەکانەوە گرنگییەکی تایبەت بە مندالآن بدەن[175].**

### ***٥. تیۆری ڕەفتاری مەعریفی:***

**جەخت دەکاتە سەر فاکتەرە جۆراوجۆرەکانی ژینگەیی کە پەیوەست بە پەرەسەندن و بەردەوامبوون لەسەر بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان. جا چارەسەرکارانی ڕەفتار و پسپۆرانی دیکە بۆ چارەسەرکردنی حالّەتەکانی خووگرتن هەستاون بە گەشەپێدانی ژمارەیەکی جۆراوجۆری ڕێگا ڕەفتارییەکان[176]. تیۆری ڕەفتاری مەعریفی لەو ڕەفتارانە دەکۆلّێتەوە و دەکاتە**

---

١٧٤. الشناوي، محمد؛ **نظريات الإرشاد و العلاج النفسي**؛ ط١؛ القاهرة: دار غريب للطبعة و النشر و التوزيع (١٩٩٤)؛ ص ١١٣.

١٧٥. الزراد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٣.

١٧٦. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٦.

نیشانەی خۆی کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان پەیدا دەبن و هەموو ئەو گرفتە ڕەفتارییە و هەڵچوونانەی کە پەیوەندییان پێوە هەیە[177].

فاکتەرەکانی ڕەفتاری مەعریفی وەکو: هوشیاری و هەستکردن بە خود و پێشبینیەکان و چاوەڕوانییەکانی تاك لە بارەی خودی خود، ڕۆڵێکی ئاشکرایان هەیە لە یارمەتیدانی پسپۆڕان و خووگرتووەکان کە لە مانای خووگرتن تێبگەن. تیۆری هەستکردن بە خود (نظرية الوعي بالذات) کاریگەرییە دەروونییەکانی خووگرتن لە ڕێگەی هەستکردنی کەسان بە خودی خۆیان ڕوون دەکاتەوە؛ بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە کردارەکانی مەعریفی و زانینەوە هەیە؛ بۆ نمونە هەندێ هەرزەکاران بڕوایان وایە، ئەگەر ماریجوانا وەربگرێت، ئەوا هزر و بیری کورتخایەن باشتر دەکات و شڵەژان و شێوان کەم دەکاتەوە و، پاڵنان زیاد دەکات و، وا دەکات نرخی کات بزانێ؛ بۆیە بۆ لای مادده هۆشبەرەکان دەچن.[178]

### ٦. تیۆری پێشبینیکردن:

پەیوەندیی چاوەڕوانکراوی نێوان بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و ڕەفتاری کەسێتی و ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان ڕوون دەکاتەوە. ئەو تیۆرە بەکارهێنانی سەرەتایی (Initial use) بە تایبەتی لە لای هەرزەکاران و، بەکارهێنان و وەرگرتنی بەردەوام (Continued use) و، شکستهێنان (Relapse) لێکدەداتەوە[179].

---

١٧٧. فايد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٦.

١٧٨. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٣.

١٧٩. بوكستن، أوسكار جاري؛ **إدمان المراهقين التقييم و الوقاية و العلاج**؛ ترجمة: خالد إبراهيم و إبتسام أحمد؛ ط١؛ القاهرة: دارالحضارة للطباعة و النشر و التوزيع (٢٠٠٠)؛ ص ٩٣.

### ٧. تیۆری دانەپاڵ:

گرنگی بەو ڕێگایە دەدات کە کەسەکان هۆی ڕەفتاری خووگرتوویان دەدەنە پاڵ شتی دیکە یان کەسانی دیکە. هەر کەسێك ڕەفتاری خووگرتنی دەداتە پاڵ سەرچاوەی جۆراوجۆر؛ جا چ ناوەکی بێت یان دەرەکی. ڕەنگە ئەو دانەپاڵەش پۆزەتیڤ بێت (وەك هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی تاك بۆ خووگرتن) یاخود نێگەتیڤ بێت (وەك لۆمەکردنی کەسانی دیکە و شوێنەکان و شتەکان).[١٨٠]

### ٨. تیۆری بەڕێوەبردنی فشار:

جەخت دەکاتە سەر پێویستی تاکەکان بۆ کەمکردنی ئەو فشار و شڵەژان و دڵەڕاوکێیەی کە دەبێتە هۆی فشاری دەروونی. ئەو کەسانەی تووشی خووگرتن دەبن، ئاستێکی بەرزی فشاریان بڕیوە و ڕەنگە لە کەسانی دیکە زیاتر ئامادە بن بۆ فشار و شڵەژان؛ بۆیە پەنا دەبەنە بەر وەرگرتنی مادده هۆشبەرەکان بۆ دابەزاندنی دڵەڕاوکێ و شڵەژان و فشاریان.[١٨١] جا کەسەکان وای دادەنێن کە بنچینەی شڵەژانیان دەگەڕێتەوە بۆ زەحمەتی کار و گرفتە خێزانییەکان و گرفتەکانی منداڵی. ئەو کەسانەی لە دەست ئەو دڵەڕاوکێ و ئالۆزییەی کە لە ئەنجامی فشار پەیدا دەبێت، دەناڵن. حەز دەکەن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یارمەتی وەربگرن،. بۆ ڕزگاربوون لەو دڵەڕاوکێ و ئالۆزییە یارمەتی خۆیان دەدەن، ئەویش بە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرکان.[١٨٢] هەتا ڕاهێنەکانی خاوبوونەوە و (Relaxation Exercises)، ڕامان و لێ ووردبوونەوە (Meditation) و تەکنیکەکانی دیکە جگە لە داو و دەرمان، بە نیسبەت لە

---

١٨٠. بهرامی، د.هادی؛ **اعتیاد و فرایند پیشگیری**؛ چ١؛ تهران: انتشارات سمت (٢٠٠٤)؛ ص ٧٦.

١٨١. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٥٧.

١٨٢. محتشمی پور، عماد؛ **اتیولوژی اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: انستیتو عالی علوم بیمارستانی (١٩٩٦)؛ ص ٥٤.

مادده هۆشبەرەکان کاتی زیاتریان دەوێ تا کەسەکان هەست بە ئاسوودەیی بکەن؛ بۆیەشە لەسەر بەکارهێنەران و خووگرتووەکانی ماددەی هۆشبەرەکان پێویستە چارەسەری دیکە جگە لە داو و دەرمان بەکاربهێنن بۆ هەڵسوڕان و بەڕێوەبردنی فشار و خۆپاراستن لە خووگرتن.[١٨٣]

183 . Rasmussen, Sandra, op.cit, (p 103).

## سێیەم: ڕوانگەی کۆمەڵناسی:

ئێمە وەکو کۆمەڵناسێك پێمان وایە زۆر لۆژیکیترە کە دیاردەی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان لە چوارچێوەی ئەم ڕوانگەیەدا ڕوون بکرێتەوە. لەم ڕوانگەیەدا تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خووگرتوان چ لە ڕووی خێزانی، گروپی هاوتەمەنەکان و بارودۆخی کۆمەڵایەتی لە خۆ دەگرێت و تیایدا چاوخشاندن بە مێژوو و پێکهاتەی سیاسی، ئابووری و کولتووری کۆمەڵگا شیتەڵ و شیدەکرێتەوە.

ڕوانگەی کۆمەڵناسی، کۆمەڵگا بە فاکتەری سەرەکیی کێشە کۆمەڵایەتییەکان دەزانێت و دابەش دەبێتە سەر چەندین تیۆری جیاوازەوە، کە گرنگترینیانم هەڵبژاردووە بۆ باس کردن کە بەم شێوەی خوارەوەیە:

### ١. تیۆرەکانی کۆمەڵناسی:

- **تیۆرەکانی بەرەڵایی و بێسەروبەریی کۆمەڵایەتی:**
  - دورکایم: تیۆری ئانۆمی
  - مێرتون: تیۆری بینای کۆمەڵایەتی و ئانۆمی
  - پارسونز: تیۆری کردەی کۆمەڵایەتی و ئانۆمی
  - پارك و برگس: تیۆری ئیکۆلۆژی و ئانۆمی
- **تیۆرەکانی ملململانێ:**
  - مارکسیزم
  - مارکسیزمی نوێ
  - مارکسیزمی فمینیزم

- **تیۆرەکانی وردە کولتوور:**
- کوهن: گەنجانی لادەر
- میلر: کولتوری چینی خواروو
- کلووارد و ئۆهلاین: هەڵی جیاواز
- ماتزا: تیۆری بێلایەنبوون

## ٢. تیۆرە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان:

- **تیۆری کۆنترۆڵ:**
- کۆنترۆڵی کەسی
- کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی
- **تیۆری فێربوونی کۆمەڵایەتی:**
- تیۆری هاودەمی جیاواز
- تیۆری لاساییکردن
- **تیۆرەکانی گشتگیر بین:**
- تیۆری ڕەفتاری کێشەدار
- تیۆری گروپی هاوتەمەنەکان
- تیۆری هەڵبژاردەی عەقڵانی
- **تیۆری کردەی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی:**
- تیۆری ناولێنان
- فینۆمێنۆلۆژی (دیاردەناسی) و لادان

## ٣. تیۆرە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان:

- تیۆری خێزان (Family theory/ نظرية الأسرة)
- تیۆری سیستمەکان (Systems theory/ النظرية الأنظمة)

– تیۆری ئەنترۆپۆلۆژی (Anthropological theory/ نظرية الأنتروبولوجيا)

– تیۆری دەروازە ( Gateway theory/ نظرية البوابة)

– تیۆری ئابووری (Economic theory/ النظرية الإقتصادية)

## أ. تیۆرەکانی کۆمەڵناسی:

پرۆسەی خووگرتن لە ڕوانگەی هەر کام لە تیۆرەکانی کۆمەڵناسی واتای خۆی هەیە و دەکرێ شی بکرێتەوە. لەم ڕوویەوە پێویستە دان بنێین بەوە، کە خووگرتن تەنیا ئەنجامی فاکتەرێك نییە، بەڵکو کۆمەڵێك فاکتەر لەپاڵ یەکدا بۆ شیکردنەوە دەتوانن تیایدا بەشدار بن. هەڵبەتە لە پەیوەندی لەگەڵ تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتی، ئابووری وکولتووری خووگرتوان، فاکتەرێك دەتوانێت زیاتر لە هەر فاکتەرێکی تر گرنگتر بێت.[١٨٤]

### ١. تیۆرەکانی ئانۆمی و بێسەروبەریی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان:

کاکڵەی سەرەکیی ئەم تیۆرانە ئەوەیە کە کۆمەڵگا خاوەن سیستمێکی هاودەنگ و بەیەکەوە بەستراوە و ئەگەر هاتوو ئەم بەیەکەوەبەسترانە تێك بشکێت، کاریکەریی نەخوازراوی لێ پەیدا دەبێت و بەدوایشدا کێشە کۆمەڵایەتییەکان سەرهەڵدەدەن. لەم ڕوانگەیەدا کۆمەڵگا بە سیستمێکی تۆکمە سەیر دەکات کە بەشەکانی بەشێوەیەکی ڕێکخراو و هاودەنگ بەیەکەوە بەستراون.[١٨٥] ئەگەر لە سیستمێکی کۆمەڵایەتیدا، بەشێك یان چەند بەشێك

---

١٨٤. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٠٨.

١٨٥. رفیع پور، فرامرز؛ **آنومی یا آشفتگی اجتماعی**؛ چ١؛ تهران: انتشارات سروش (١٩٩٩)؛ ص ٥٦.

ناچوونییەك كار بكەن، كارایی سیستمەكە تێك دەچێت، لە ئەنجامدا ژمارەیەك لە ڕێكخراوی كۆمەڵایەتی بۆ نموونە سیستمێكی ئابووری و بەدوایدا كاریگەریی پێوەرە كۆمەڵایەتییەكان لەسەر گروپە تایبەتییەكان یان چەند كەسێكی دیاریكراو، لاواز دەبێت و كێشە كۆمەڵایەتیەكان سەرهەڵدەدەن.[١٨٦] ئەمەش واتا ئامانجە هاوبەش و گەلەكییەكانی كۆمەڵگا وەكو رێوڕەسمە كۆمەڵایەتییەكان، رێزلێنانە كۆمەڵایەتییەكان، بەبێ سیستمێكی تەواو و هاودەنگ و ڕێكخراو ناتوانێت بە شێوەیەكی تەواو دەرك بكرێن و بێجگە لەمە هەندێك لە تاكەكان و گروپەكان دەست دەدەنە ڕەفتاری نەخوازراو یان تووشی نەخۆشی دەروونی دەبن.[١٨٧]

خاوەنڕایان لەسەر ئەم تیۆرە باوەڕیان وایە كە ناچوونییەكی سیستمی كۆمەڵایەتی هۆكارە بۆ ئەوەی زۆربەی تاك و گروپەكان، ئامانجە كۆمەڵایەتییەكان دەرك نەكەن و لە ئەنجامدا لەوانەیە بۆ دەستكەوتنی ئەو ڕەزامەندییەی كە كۆمەڵگا لێی سەندۆتەوە پەنا بۆ ماددە هۆشبەرەكان بەرێت.[١٨٨]

بەپێی ئەم تیۆرانە هەروەها گۆڕانی كۆمەڵایەتی، ڕۆڵێكی گرنگ لەسەرهەڵدانی كێشە كۆمەڵایەتییەكان دەگێڕێت. بەم شێوەیە ئەگەر هاتوو بەشێك لە كولتووری كۆمەڵگا بەهۆی دۆزینەوە یان داهێنانێكی نوێوە، زووتر بگۆڕێت، دەبێتە هۆی ڕوودانی گۆڕان لە بەشەكانی تردا كە پێیەوە بەستراون. بەڵام زۆرجار گۆڕانی بەشە بەستراوەكە درەنگتر ڕوو دەدات كە ولیام ئۆگبێرن (W.F.Ogbern) بە دواكەوتنی كولتووری ناوی دەبات. وەهایە كە پێشەكی

١٨٦. هەمان سەرچاوە؛ ل ٥٧.

١٨٧. آبادینسكی، هووارد؛ **جامعه شناسی مواد مخدر**؛ ترجمه: محمد علی زكریایی؛ چ١؛ تهران: دبیرخانه ستاد مبارزه با مواد مخدر (٢٠٠٣)؛ ص ١٤.

١٨٨. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٠١.

بێسەروبەری کۆمەڵایەتی، سەرهەڵدانی پەیدابوونێکی کۆمەڵایەتی یان گۆڕانی شتێکی کۆنە یان نوێبوونەوەی کۆمەڵایەتییە (Social Innovation). لە ئەنجامدا نوێبوونەوە لە هەندێك سیستمەکانی کۆمەڵگا گۆڕانی کۆمەڵایەتی ڕوو دەدات و لە ئەنجامدا سیستمەکانی تر دەبنە قوربانیی دواکەوتنی کۆمەڵایەتی و بەم شێوەیە گونجانی کۆمەڵایەتی لەناو دەچێت و نرخی بەها کۆمەڵایەتییەکان کەم دەکاتەوە. لەوانەیە دروستبوونی پێوەری تری نوێ، پێویستی بە کاتێکی دوور و درێژ بێت و یان قەبوڵبوونی زەمەنێکی دوور و درێژی بوێت، لەم مەودا زەمەنییەدایە کە جۆرە بارێکی بێپێوری دێتە پێشەوە و ئەنجامدانی کاری ناڕەوا بڵاو دەبێتەوە.[189]

تیۆرەوانانی ئەم بوارە باوەڕیان وایە کە هۆکارەکانی لاوازبوونی کاریگەریی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی وەك خێزان و لاوازبوونی پەیوەندییەکانی خزمایەتی وەك هێزە نافەرمییەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، لاوازی پابەندی کۆمەڵایەتی کە ئەنجامێکی خێرای بە پیشەسازیبوون و شارنشینی و کۆچکردن بەرەو مۆڵگەکانی شارە، تاوانەکانی وەك کوشتن، دزی، لادانە سێکسیەکان، خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان ڕوو لە زیاد بوونە.[190]

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە تا چارەکی سێیەمی سەدەی بیستەم، چەمکەکانی وەکو "ئانۆمی" و "بێسەروبەری کۆمەڵایەتی" لە لایەن دورکایم و مێرتۆن و پارسۆنز و پارك و برگس لە ناوەندەکانی توێژینەوەی ئەوروپایی و ئەمریکایی دەرکەوتن.[191]

---

١٨٩. اوگبرن، ویلیام و نیم کوف، مایر؛ **زمینه جامعه‌شناسی**؛ ترجمه: امیر حسین آریـان پور؛ چ ١٣؛ تهران: نشر گسـتره (٢٠٠١)؛ ص ٤٣٦-٤٣٨.

١٩٠. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠١.

١٩١. رفیع پور؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦١.

أ. **دورکایم: تیۆری ئانۆمی (Anomic theory)**

لەم تیۆرە دا ئەمیل دۆرکایم ـ کۆمەڵناسی فەرەنسی ـ داکۆکی لە هۆکارە سەرەکییەکانی لاوازبوونی پێوەر و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دەکات و وا دەخاتە ڕوو کەوا لاوازبوونی بەهاکان و نۆرمە کۆمەڵایەتییە کولتوورییەکان هۆکارن بۆ پەنابردنی تاك بۆ مادده هۆشبەرەکان.

پێی وایە گۆڕانکاریی خێراییەکانی پیشەسازی ـ ئابووری و بەدوای ئەویشدا گۆڕانکاریی خێرا و بەرفراوانە کۆمەڵایەتییەکانی وەك شارنشینی، مۆدێرنە، دەرکەوتنی کۆمەڵگای جەماوەری (Mass society)، لاوازبوونی باوەڕەکان و بەها و نەریتە کولتووری و ئایینی و نەتەوەیی و نەژادی، شلەژانی بونیادی نەریتی خێزان، هەموویان بوونەتە هۆی گۆڕانی ناسنامەی (Identity) تاکەکان و ڕەفتاری نەریتییان. چەند کۆمەڵگا پێش بکەوێ، ڕادەی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان زیاتر دەبێت؛ بۆ نموونە لە شارە گەورەکان زیاترە وەك لە گوندەکان. هەروەها لەو خێزانانەی کە کەوتوونەتە بەر شاڵاوی مودێرنە و پێکهاتەی کۆن و نەریتی خۆیان لە دەست داوە یا خەریکە لە دەستی دەدەن، خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان زیاترە.[192]

ب. **مێرتون: تیۆری گۆشەگیری و پاشگەزبوون (Retreatism)**

مێرتون بە درێژەدەری تیۆری ئەنۆمیای دورکایم دەناسرێت، بەڵام لە چەمکی ئانۆمی گۆڕانکاری کردووە. دورکایم جەخت دەکاتە سەر ئەنۆمیا (بێسەروبەری) کۆمەڵایەتی لە میانەی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەکاتەوە، کەچی مێرتون جگە لەوە هۆکارە تاکەکەسییەکانیش دەخاتە پاڵ بونیادی

---

١٩٢. مك داول، دیوید ام و اسپیتر، هنری آی؛ **اعتیاد از اصول تا عمل**؛ ترجمه: محسن گل پرور و دیگـران؛ چ١؛ تهـران: کانون گسترش علوم (٢٠٠١)؛ ص ١٠٧-١٠٩.

کۆمەڵایەتی؛ وەکو: پارە، دەسەڵات، پێگە و ئامرازە بە یاسایی و بە ڕێکخراوەییکراوەکان (Institutionalized legitimate means)، کە ئەوەش لە لایەن حکومەت و کۆمەڵگایەوە بووەتە باو و دەچەسپێندرێت. بەڵام ئەو شتانەش تەنها بۆ ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی کۆمەڵگا ڕەخسێندراوە.[١٩٣]

ئەم تیۆرە زۆر بە تیۆری پەراوێزگەرێتی (Marginaliztion) دەچێت کە بەم دواییە زۆر باو بوە. پێی وایە کە سەرکەوتنی تاك لە دەستکەوتنی هەر یەك لە کاری باش، سەرمایەیەکی زۆر، خوێندنی گونجاو لەگەڵ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دایە. بەڵام بێبەشبوون لە هەر کام لەوانە دەبێتە هۆی دوورەپەرێزبوونی تاك لە کۆمەڵگا.[١٩٤] چونکە خۆی بە بێگانە دەبینێت لە دیدگا و باوەڕ و پێوەر و نۆرمە باوەکانی کۆمەڵگا کە زیاتر لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندایە و هەموو ئەوانە بە تەوەرێك دادەنێن. بۆیە خۆی وەکو ئەوان نابینێت و بۆ دەربازبوون لەم هەڵ و مەرجە پەنا بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و تاوانەکانی تر دەبات.[١٩٥]

### ج. پارسۆنز: کردەی کۆمەڵایەتی و ئانۆمی

پارسۆنز لە ڕوونکردنەوەی لادانە کۆمەڵایەتییەکان پشت بە پێشمەرجێك دەبەستێت کە لە چوار وردە سیستەم پێك دێت کە بریتین لە: کولتووری، کۆمەڵایەتی، کەسایەتی، ئابووری. ئەرکە دروست و گونجاوەکانی هەر یەك لەم وردە سیستەمانە و پەیوەندی و کارلێکردنیان، هۆکاری کۆنترۆڵکردنی هەر

---

١٩٣. احمدی، د. حبیب؛ **جامعەشناسی انحرافات**؛ چ١؛ تهران: انتشارات سمت (٢٠٠٥)؛ ص ٤٤.

١٩٤. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٠١-١٠٢.

١٩٥. غباري، محمد سلامة محمد؛ **الدفاع الإجتماعي في مواجهة الجريمة**؛ ط١؛ الإسكندرية: دار الوفاء لدنيا الطباعة و النشر (٢٠٠٦)؛ ص ١١٧.

کۆمەڵگایەکە و هەروەها هۆکاری مانەوە و سەقامگیری سیستەمی کۆمەڵایەتییە. بە پێچەوانەوە زەمینەی سەرهەڵدانی ڕەفتاری لادان وەکو خووگرتن و پەنابردن بۆ مادده هۆشبەرەکان دێتە ئاراوە.[١٩٦]

لە ڕوانگەی پارسۆنز، سیستەمەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان هۆکاری جێبەجێکردن و ئامرازەکانی بە کۆمەڵایەتی کردنی تاکەکانن. لە کاتێك دا ئەگەر هاتوو ئەم سیستەمە و ڕێکخراوە کاربەدەستانە وەکو: خێزان، قوتابخانە، ڕاگەیاندن، بە ئەرکی خۆیان بەجێ نەهێنن، کۆمەڵگا تووشی بێسەروبەریی کۆمەڵایەتی دەبێت و ئەنجامەکەشی بڵاوبوونەوەی ڕەفتاری لادانە لە کۆمەڵگا.[١٩٧]

### د. پارك و بێرگس: ئیکۆلۆژیی کۆمەڵایەتی (Social ecology)

پارك و برگس کە سەر بە قوتابخانەی "شیکاگو"ن ـ لەسەرەتای سەدەی بیستەم ـ لە چوارچێوەی ئاراستەی ئیکۆلۆژی دەستیان داوەتە لێکۆڵینەوە لە لادانە کۆمەڵایەتییەکان وەك خۆکوشتن، تەڵاق، داوێن پیسی، خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان، لە شاری شیکاگو بە ئامانجی تێگەیشتن لە کاریگەریی هۆکارە ئیکۆلۆژییە کۆمەڵایەتییەکانی وەك: تەمەن، ژمارەی ئەندامانی خێزان، چڕی دانیشتوان، کوچکردن، نەتەوە و نەژاد، شوێنی دانیشتن و جۆری خانووەکان لەسەر ئانۆمی و بێسەروبەریی سیستەمی کۆمەڵایەتی.[١٩٨]

---

١٩٦. بست، ژان میشل؛ **جامعه‌شناسی جنایت**؛ ترجمه: فریدون وحیدا؛ چ١؛ مشهد: انتشارات آستان قدس رضوی (١٩٩٣)؛ ص ٦١.

١٩٧. قائم مقامی، فرهت؛ **نظام گسیختگی و انحرافات اجتماعی**؛ چ٣؛ تهران: انتشارات روشنفکر (١٩٨٣)؛ ص ٣٩.

١٩٨. اشرف، احمد؛ **کژ رفتاری مسائل انسانی و آسیب شناسی اجتماعی**؛ چ٢؛ تهران: آموزشگاه عالی خدمات اجتماعی (١٩٩٧)؛ ص١١٣.

بێرگس بەپێی نموونەی ئایدیالی (Ideal type pattern) بۆ کۆمەڵگای پیشەسازی، شاری گەورە (دایکەشار) دابەش کردووە بۆ (٥) بازنەی هاوچەق کە بریتین لە:

١) ناوچەی بازرگانی (سەنتەری شار).
٢) ناوچەی گواستنەوە.
٣) ناوچەی نیشتەجێبوونی کرێکاران و چینی خواروو.
٤) ناوچەی نیشتەجێبوونی چینی ناوەڕاست.
٥) ناوچەی کۆتایی کە کەمترین ڕێژەی لادان تێدا ڕوو دەدات.

بەپێی ئەم تیۆرە ناوچەی دووەم کە بریتیە لە ناوچەی گواستنەوە، بەرزترین ڕێژەی تاوان و لادان تێدا دەبینرێت لەبەر ئاستی بەرزی جوڵەی دانیشتوان، ڕێژەی بەرزی کۆچکردن، وێرانی خانووەکان و چڕی دانیشتوان. بە پێچەوانە ناوچەی کۆتایی کەمترین ڕێژەی تاوان تێدا بەدی دەکرێت.[١٩٩]

## ٢. تیۆرەکانی ململانێ و دژایەتی:

تیۆرەوانانی ململانێ، لادان و تاوان بە گشتی بەرهەمی سیستەمی سەرمایەداری دەزانن. پێیان وایە کۆمەڵگای سەرمایەداری بەردەوام لە حاڵەتی گۆڕانی ناچوونییەك و ناهاوسەنگ دایە، کە ئەمەش چەند تایبەتمەندییەکی ناچاری سیستەمی سەرمایەدارین. ئەم تیۆرانە پەیوەندیی دروست دەکەن لە نێوان لادان و سیستەمی سەرمایەداری بە ئاماژەکردن بەوە کە یاسای سزادان کە لە لایەن چەند گروپێك کە دەسەڵاتی ئابووری و سیاسییان لەبەر دەست دایە بۆ مەبەستی کۆنترۆڵکردنی کەسانێك کە خاوەن دەسەڵات نین، داندراوە:[٢٠٠]

---

١٩٩. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٥٥-٥٩.

٢٠٠. کارة، د. مصطفی عبدالمجید؛ **مقدمة في الإنحراف الإجتماعي**؛ ط١؛ بیروت: معهد الإنماء العربي (١٩٨٥)؛ ص٧٦.

### أ. ماركسیزم:

یەكەم تیۆرەوانی ئەم ڕەوتە كارل ماركسە كە پێی وایە سیستەمی سەرمایەداری بە هۆی چەند تایبەتمەندییەك كە لە ناو ئەم سیستەمە دا هەیە، وەك نایەكسانی چینایەتی، پەیوەندییە چینایەتییە دژ بە یەكێكان و دەستەمۆكردنی كاری مرۆڤ لە پەیوەندی لەگەڵ بەرژەوەندییە چینایەتییە زاڵەكانی كۆمەڵگا بۆتە هۆی نامۆبوون و دواجار تاوان و لادان كە ماددە هۆشبەرەكانیش دەگرێتەوە.[201]

### ب. ماركسیزمی نوێ:

ئەم ڕەوتە درێژەدەری بیر و ڕێبازی ماركسیزمی كلاسیكە و پێی وایە ڕەفتاری لادان بە گشتی بەرهەمی "هەوڵە ڕێگرەكانی" چینە دەسەڵاتدارەكانە بۆ كۆنترۆڵكردنی چینە بێدەسەڵاتەكان. لە دیدگای ئەوانەوە لە ئەنجامی ئەم ڕێگرایەتییە نە تەنیا دەبێتە هۆی زیادبوونی لادان لە ناو چینەكانی خوارەوەی كۆمەڵگا، بەڵكو دەبێتە هۆی زیادبوونی حەزەكانی چینەكانی ناوەڕاست و باڵادەستەكان بۆ ناولێنان (Labeling) بە ڕەفتاری لادان لە كارەكانی ئەندامانی چینی خواروو بە مەبەستی ئاسانتر كۆنترۆڵ كردنیان.[202]

### ج. ماركسیزمی فمینیزم:

بزوتنەوەیەكی ڕادیكالی چەپگەرایە كە دژ بە جیاوازییە ڕەگەزەییەكانی نێوان ژن و پیاوە. تیۆرەوانانی ئەم ڕەوتە پێیان وایە كە لادانی ژنان كاردانەوەیەكە لە

---

٢٠١. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٦٠-٦٢.

٢٠٢. هەمان سەرچاوە؛ ص ٦٣-٦٧.

بەرامبەر جیاوازییەکان و بێبەشکردنەکانی سیستەمی سەرمایەدارییە کە دەرحەق بە ژنان دەکار دەکرێت.[٢٠٣]

**٣. تیۆرەکانی وردە کولتوور (تیۆری گواستنەوەی کولتووری):**

بەپێی ئەم تیۆرانە ئەو خەڵکەی کە سەر بە کولتوورێکن، خاوەن دید، بەها، پێوەرە دیارکراوەکانی خۆیانن بە جۆرێك کە رێگە بە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان یان خراپ بەکارهێنانیان دەدات یان هیچ هەڵوێستێکی نییە بەرامبەری؛ بۆ نموونە وردە کولتورێك هەیە کە ڕێگە بە بەکارهێنانی دەرمانی ناپزیشکی (Non-medical) وەکو تریاك دەدات بۆ هێورکردنەوەی ئێش و ئازارەکان.[٢٠٤]

ئەم ڕوانگەیە بە پێچەوانەی تیۆرەکانی بێسەروبەری، گۆشەگیری و تەنانەت ناولێنانیش، بەها و پێوەرەکان و دیدگا تایبەتییەکان بە بەرهەمی پەلکێشبوونی تاکەکان دەزانێت بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و باوەڕی وایە هەندێ گروپ لە خەڵك بە هۆی هەبوونی هەندێ تایبەتمەندیی هاوبەش وەکو: ئایین، نەژاد، تێڕوانینی کۆمەڵایەتی، گروپی تەمەن، گروپی کۆمەڵایەتی و هتد، هەم خۆیان لە خەڵکی جیا دەکەنەوە و هەمیش بۆ پەرەپێدانی ئەم هاوبەشیانە لە هەوڵدانە. ئەم بابەتە خۆی لە خۆیدا دەبێتە مایەی شێوەوەرگرتنی کۆمەڵێك لە باوەڕ، بەها، پێوەر و ڕەفتارەکان کە شێوازێکی ژیان دروست دەکات، کە دواتر بە وردە کولتوور ناو دەبرێن؛ کەواتە بە پێی ئەم تیۆرە، پەلکێشبوون بە ماددە

٢٠٣. سلیمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٣٨٤- ٣٨٥.

٢٠٤. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص١٠٣-١٠٤.

هۆشبەرەکان، لە کاتێکدا دێتە ئاراوە کە گواستنەوەی کولتووری هاتبێتە دی و تاك بە وردە کولتوری خوازراوی خۆی حەزی هەبێت و بە دوای بچێت.[٢٠٥]

تیۆری گواستنەوەی کولتووری (یاخود وردە کولتوور) لە کاریگەریی هۆکارەکانی کولتووری لە تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان دەکۆڵێتەوە و بابەتی ئەم تیۆرانەش زیاتر ڕەفتاری لادانە لە ناو "گەنجانی چینەکانی خوارووی کۆمەڵگا" بەپێی تایبەتمەندییە وردە کولتوورییەکانیان وەکو: پێوەر و بەهاکان، زمان و شێوازی ژیانیان لە هەموو ڕوویەکەوە.[٢٠٦] لە گرنگترین تیۆرەوانانی ئەم ڕوانگەیە دەتوانین ئاماژە بە: کۆهن (١٩٥٥)، کلووارد و ئۆهلاین (١٩٦٠)، ماتزا (١٩٦٤) و میلر (١٩٧٥) بکەین:

### أ. کۆهن: گەنجە لادەرەکان

کۆهن جەخت دەکاتە سەر ڕەفتاری لادانی گەنجانی چینی خوارووی کۆمەڵگا کە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئامرازەکانی گونجان لەگەڵ ژینگە بەپێی پێوەرە قەبوڵکراوەکان کە کۆمەڵگا دەچەسپێنێ، هەروەها پەلکێشبوون بەرەو وردە کولتورییەکانی لادان؛[٢٠٧] بۆ نموونە لە قوتابخانە دا، قوتابیان دەخرێنە بەر خوێندنێك کە بەپێی پێوەرەکانی قەبوڵکراوی کۆمەڵگا لە لایەن چینی ناوەڕاست دیاریکراوە کە قوتابیانی چینی خواروو ناتوانن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەم پێوەرانە؛ بۆیە ناتوانن بکەونە کێبڕکێ لەگەڵ قوتابیانی چینی سەرووی تر. بۆیە

---

٢٠٥. هەمان سەرچاوە؛ ل ١٠٥.

٢٠٦. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٢.

٢٠٧. محسنی تبریزی، علیرضـا؛ **جامعەشناسی انحرافات**؛ چ١؛ تهران: دانشكده علوم اجتماعی دانشگاه تهران (١٩٩٤)؛ ص ٤٩.

پەلکێشی دارودەستەی گەنجە لادەرەکانی هاوچینی خۆیان دەبن کە یەکێک لەوان خووگرتووان بە مادده هۆشبەرەکانە.[٢٠٨]

### ب. میلر: کولتووری چینی خواروو

جەخت دەکاتە سەر لادانی چینەکانی خوارەوە کە پێی وایە لادانەکانیان وەڵامێکە بۆ وردەکولتووره چینایەتییەکانیان. بە بڕوای میلر، گەنجانی چینی خواروو بە نیسبەت گەنجانی چینی سەروو، بە هۆی ئازادی و سەربەخۆبوونی زیاتر بۆ چوونەدەر لە ماڵەوە، زەمینەی زیاتریان تێدایە بۆ پەلکێشبوون بۆ ڕەفتاری لادان و بەکاربردنی مادده هۆشبەرەکان و جگەرەکێشان و خواردنەوەی ئەلکهۆل کە زیاتر بەتەمەنەکان بەکاری دێنن.[٢٠٩]

### ج. کلووارد و ئۆهلاین: هەڵی جیاواز

پێیان وایە بێبەشبوونی چینەکانی خوارووی کۆمەڵگا بۆ دەستکەوتنی کاری گونجاو، دەبێتە هۆی ڕەفتاری لادانی گەنجان، کە دابەش دەکەنە ٣ جۆر:

١) وردەکولتووری تاوانی ڕێکخراو: کە بە ئامانجی ئابووری بە شێوەیەکی عەقڵانی و ڕیکخراو و بە پلان ئەنجام دەدرێت.

٢) وردەکولتووری ملمڵانێ: بریتیە لەو ڕەفتارە لادانەی کە زیاتر بە شەڕ و توندوتیژی بۆ مەبەستی بە دەستکەوتنی پێگە و پایە ئەنجام دەبێت.

٣) وردەکولتووری گۆشەگیری: بریتیە لەو گەنجانە لادەرانەی کە سەر بە هیچ گروپێکی ڕێکخراوی تاوانبار نین و ناتوانن بە خۆیان دارودەستەیەکی لادەر

---

٢٠٨. صدیق سروستانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٧١.

٢٠٩. رابرتسون، یان؛ **درآمدی بر جامعه**؛ ترجمە: حسین بهروان؛ چ٢؛ مشهد: آستان قدس رضوی (١٩٩٩)؛ ص١٨٥-١٨٩.

دروست بکەن؛ بۆیە ڕوو دەکەنە ماددە هۆشبەرەکان کە ئەم جۆرە وردەکولتوورە تایبەتە بە خووگرتووان بە ماددە هۆشبەرەکان.[٢١٠]

### د. ماتزا: تیۆری بێلایەنکردن

دیڤید ماتزا لە باسی لادانەکان دا بە سوودوەرگرتن لە ڕێبازی ماکس ڤیبەر، لە دوای تێگەیشتن و دوزینەوەی ئەو مانا زیهنییەکانە بووە کە لادەرەکان بۆ کارەکانیان دەردەبڕن؛ چونکە بەبێ تێگەیشتن لەم مانا و باوەڕانە، ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی لادانەکان لە ڕاستی و واقعییەت دوور دەبێت.[٢١١] ماتزا ڕەخنە لە تیۆرەوانانی پێشووی خۆی لە ڕوانگەی وردەکولتوور (کۆهن، میلر، کلووارد و ئۆهلاین) دەگرێت و پێی وایە کە گەنجانی چینی خواروو نە کولتووری زاڵی کۆمەڵگا پەیڕەوی دەکەن و نە ڕەتی دەکەنەوە، بەڵکو هەندێ ڕووداو لە دونیای واقع دا بۆیان ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی لاوازبوونی پێگەیان.[٢١٢] ئەم جۆرە باوەڕ و تێگەیشتنە لە واقع دا دەبێتە هۆی بێلایەن بوونیان لە پابەندی ئەخلاقییان بە یاسا و پەنا ببنە بەر هەندێ قسە تاوانکارییان تەبریر بکەنەوە؛ وەکو: هەڵەی ئێمە نییە، ئێمە بەرپرسیار نین، ئێمە نەخۆشین، ئێمە زەرەری هیچ کەسمان نەبووە و ئەگەر ئەو کارەشمان نەکردبایە، بە خۆیان هەر تووش دەبوون، نەمدەتوانی برادەرانی خۆم بە تەنیا

---

٢١٠. وایت، رابرت و فیونا هینز؛ **جرم و جرم شناسی**؛ ترجمە: علی سلیمی و دیگران؛ چ١؛ قم: مؤسسە پژوهشی حوزە و دانشگاە (٢٠٠٤)؛ ص١٧٢-١٧٣.

٢١١. لە هەندێ سەرچاوەکان وەکو: علی سلیمی؛ **جامعەشناسی کجروی**؛ ئەم تیۆرە لە تیۆرەکانی دیاردەناسی (فێنێمۆنۆلۆژی) لە بازنەی تیۆرەکانی کردەی دوولایەنی هێمایی لە قەڵەم دەدەن.. بڕوانە: ل ٤٣٠-٤٣٣.

٢١٢. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٧٨-٨٠.

بەجێ بێڵێم، من ئەو کارەم لە پێناو خۆم نەکردووە، هەموو هەڵەکان دەگەڕێتەوە بۆ دایك و باوك، بۆ دەوڵەت، بۆ کۆمەڵگا و...[٢١٣]

## ب. تیۆرییە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان:

تاك وەکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، بەردەوام لەگەڵ تاکەکانی دیکەی کۆمەڵگا لە کردەی دوولایەنە (Interaction/ التفاعل) دایە و ڕەفتاری باش و خراپ، ئەنجامی ئەم پرۆسەیەیە. ژینگەی کۆمەڵایەتی کاردەکاتە سەر ڕەفتاری تاك و سنووری بۆ دادەنێت و کۆنترۆڵی دەکات و دەیگۆڕێت و یان چاکی دەکات. دەروونناسانی کۆمەڵایەتی لە لایەك جەخت دەکەنە سەر نۆرمە زاڵەکانی کۆمەڵگا بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و، لە لایەکی ترەوە ڕەچاوی ڕەفتاری تاك دەکەن لە ناو گروپ و کۆمەڵگا دا و چۆنیەتی کارتێکردنیان لەسەر یەکتر.[٢١٤]

تیۆرییە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکانی لادان، لێکۆڵینەوە لەسەر تاوان و لادان دەکەن بەپێی ڕەهەندەکانی کردەی دوولایەنی لە نێو بارودۆخی کۆمەڵایەتی کە لادانی کۆمەڵایەتی تیایدا ڕوو دەدات. پێش گریمانەی سەرەکی لە دەروونناسی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە لادانی کۆمەڵایەتی لە پرۆسەکانی کردەی دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان (Social Interaction) ڕوو دەدات؛ بۆیە تاك لە پرۆسەی تەماشاکردن و فێربوونی ڕەفتارە لادەرەکان، لاساییکردن لە لادەرەکان، کۆنترۆڵە لاوازەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی، بەکۆمەڵایەتی بوونی ناتەواو، گۆڕانی ناسنامە کە بە هۆی ناولێنانی کۆمەڵایەتی لە لای دروست دەبێت،

---

٢١٣. صدیق اورعی، غلامرضا؛ **جرم و زندان**؛ مشهد: جهاد دانشگاهی دانشکده ادبیات و علوم انسانی (بدون تاریخ؟)؛ ص ١٤ـ و عبدی، عباس؛ **آسیب شناسی اجتماعی تأثیر زندان بر زندانی**؛ چ١؛ مؤسسه تحقیقاتی و انتشارات نور (١٩٩٢)؛ ص ٤٥-٤٦.

٢١٤. ستوده، د. هدایت الله؛ **روان شناسی اجتماعی**؛ چ٥؛ تهران: انتشارات آوای نور (٢٠٠٠)؛ ص ٤٥-٤٧.

تووشی ڕەفتاری لادان دەبێت کە ڕەفتاری خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکانیش دەگرێتەوە.[٢١٥]

١. **تیۆری کۆنترۆڵ** (Control Theroy):

ئەم تیۆرە لەسەر ئەو گریمانە دامەزراوە کە بۆ کەمکردنەوەی حەزکردن لە ڕەفتارەکانی لادان و تاوانەکان، پێویستە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکرێن. لە ڕوانگەی ئەم تیۆرە، ڕەفتاری لادان، شتێکی گشتی و جیهانییە کە لە ئەنجامی لاوازی کۆنترۆڵە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان پەیدا دەبێت؛ بۆیە تاوانکاری لە لایەك ئەنجامی هۆکارە کەسییەکانی وەك بە نیگەتیڤ بینینی خۆی (Negative self concept)، ناکامی، دەروونپەرێشانی، لاوازی متمانە بەخۆ بوونە، لەلایەکی ترەوە کەمتەرخەمی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان و لە دەستدانی پابەندی بە سیستەمە بنەڕەتیە کۆمەڵایەتییەکانە وەك خێزان، قوتابخانە کە دواجار تووشی ڕەفتاری لادان دەبێت.[٢١٦]

أ. **کۆنترۆڵی کەسی (**Personal control**)**:

کۆنترۆڵی کەسی بەو توانایانە دەوترێت کە تاك بەکاری دەهێنێت بۆ ڕامکردنی خودی خۆی.[٢١٧] خودخەیاڵی (Self-image)، خۆناسین (Self-concept) و خۆدەرككردن (Self-perception) لە توخمەکانی پێکهێنەری

---

٢١٥. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص٨٥.

٢١٦. اقلیما، د. مصطفی؛ **انضباط اجتماعی و نقش آن در پیشگیری از آسیبهای اجتماعی**؛ چ ١؛ تهران: انتشارات اسپندهنر(٢٠٠٤)؛ ص١٩٩.

٢١٧. الرازقي، د. محمد؛ **علم الإجرام و السياسة الإجرامية**؛ ط٣؛ بنغازي (ليبيا): دار الكتاب الجديدة المتحدة (٢٠٠٤)؛ ص ١٣٨.

کۆنترۆڵی دەروونییە، کە زەمینەسازی دەکات تاکو تاك خۆی وەك بەرپرسێك بناسێت و هەڵسوکەوت بکات لە ئەنجامدا تووشی ڕەفتاری لادان نەبێت. بەرزبوونی ئاستی مەبەست و ئامانج و ئارەزووە هاودەنگەکان لەگەڵ بەها و یاساکانی کۆمەڵگا، بەربەستن لە تووشبوون بە لادان.[218]

**ب. کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی** (Social control):

ئەگەر هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ژینگەیی وەك خێزان، قوتابخانە و مزگەوت و ڕاگەیاندن و گروپی هاوتەمەنەکان لەبار نەبوون با کۆنترۆڵە دەروونی و کەسییەکانیش بەهێز بن، بەڵام هەندێك جار تاك تووشی لادان دەبێت. لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە چ هۆکارێك وادەکات هەندێك لە گەنجان ئەگەرچی کۆنترۆڵی دەروونیان بەهێزە، دیسان تووشی لادانی وەك خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان دەبن؟ بێگومان ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی پابەندی و خۆبەستنەوەیان بە سیستمە کۆمەڵایەتییەکان و ڕێکخراوەکان.[219]

**٢. تیۆری فێربوونی کۆمەڵایەتی** (Social lerning theory):

ئەم تیۆرە وای بۆ دەچێت کە توانستی خودی (Self-Efficacy/ الكفاية الذاتية) پێکدێت و بەندە لەسەر فاکتەرە کەسێتییەکان، فاکتەرە ژینگەییەکان و ڕەفتاری تاکەکان لەگەڵ کەسانی دەوروبەریان. لەم تیۆرەدا بنەماکانی فێربوون و زانین و مەعریفە بنەمای گرنگن، کە ڕەفتاری خووگرتن و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان یەکێك لەو ڕەفتارانەیە کە لە ڕێگەی کۆمەڵایەتی فێر دەبن.[220]

---

٢١٨. أنسل، لمارك؛ **الدفاع الإجتماعي الجديد**؛ ترجمة الدكتور محمد الرازقي؛ ط ١؛ بنغازي (ليبيا): دار الكتاب الجديدة المتحدة (٢٠٠٢)؛ ص ٧٦.

٢١٩. سليمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٨٥.

٢٢٠. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٨٧-٨٨.

### أ. تیۆری هاودەمی جیاواز (Differntial association theory):

سازەرلەند (١٩٤٢) ئەم چەمکەی داهێنا، و مەبەست پێی ڕەفتاری لادان بۆماوەیی و زاتی نییە، بەڵکو بە هەمان شێوە فێری دەبێت وەك چۆن هەر ڕەفتارێکی تر فێر دەبێت. لە ئەنجامی هاودەمی، تاك فێری ئەو یاسا و مافانە دەبێت کە وەك کاروبارێکی گونجاو یان نەگونجاو پێناسە دەکرێن؛ واتە تاك ئەم پێناسانەی لە کەسانی هاودەمییەوە وەردەگرێت. تاك لە بەر ئەوەی لەگەڵ کەسانێك هاودەمە کە وا دەبینن پێشێلکردنی یاسا باشترە لە ملکەچ بوونیان، بۆیە تووشی لادان و تاوان دەبێت.[٢٢١]

### ب. تیۆری لاساییکردنەوە (Imitaion Theory):

گابریل تارد لە تیۆرەوانانی لاساییکردنەوەیە و دژ بە تیۆرە بایۆلۆژییەکانە پێی وایە کە تاکەکان، تاوانبار لە دایك نابن، بەڵکو دەبنە تاوانبار. تارد لەو باوەڕە دایە کە ڕەفتاری لادان، لە ڕێگەی لاساییکردنەوە وەردەگیرێ کە پشت دەبەستێ بە ئەزموونەکانی فێربوون و تەماشاکردن. تارد لەو باوەڕەدا کە هەموو کردەکانی گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتی کە ئەنجام دەدرێن، لە ژێر دەسەڵاتی "نموونەکانە" کە دەخرێتە پێش تاك و تاك دەیانبینێت. تارد بەپێی تیۆری لاساییکردنەوە، ڕەفتاری تاوان بە هەمان شێوەی ڕەفتاری ناتاوان ڕوون دەکاتەوە و باس لە سێ یاسا دەکات بۆ لاساییکردنەوە: یاسای یەکەم: مرۆڤەکان بەپێی ڕادەی نزیکییان لە یەکەوە، بەشێوەیەکی هاوتەریب لاسایی یەکتر دەکەنەوە. تارد لە یاسای دووەمدا دەڵێت: ژێردەستان لە باڵادەستان لاسایی دەکەنەوە؛ بۆ نموونە دانیشتوانی گوندەکان و شارە بچووکوکان لاسایی

---

٢٢١. گسن، ريمون؛ **مقدمه‌ای بر جرم شناسی**؛ ترجمه مهدی کی نیا؛ چ١؛ تهران: نشر آگه (١٩٩١)؛ ص ١٥٠-١٥٣.

تاکەکانی شارەگەورەکان دەکەنەوە. تارد پێی وایە ڕەفتاری لادانیش وەکو نەخۆشییە گوازراوەکان لە ناو کۆمەڵگا دا بڵاو دەبێتەوە. لە یاسای سێیەمیشدا دەڵێت: کاتێك دوو مۆدیل بە تایبەتیمەندییە تاقانەکانی خۆیان ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، یەکێکیان دەبێتە جێنشینی ئەوی تر. ئەم تیۆرە زۆر گونجاوە لە کاریگەریی ڕاگەیاندن و ئەکتەرە سینەماییەکان لەسەر تاکەکان.[٢٢٢]

### ٣. تیۆرەکانی گشتگیربین:

ئەم تیۆرانە هەوڵیان ئەوەیە کە بە تێکەڵکردنی چەند تیۆری پێکەوە تیۆرییەك پێکدەهێنن و وەکو گشتێك سەیری دەکەن کە دەکرێ ئەوانەی خوارەوە ناو ببەین:

#### أ. تیۆری ڕەفتاری کێشەئامێز (Problem behavior theory):

ئەم تیۆرە لە لایەن جێسور و هاوکارەکان لە ساڵی (١٩٧٧) خراوەتە ڕوو، کە تیایدا باسیان لە هۆکارەکانی ڕەفتارە هەڕەشە ئامێزەکانی نەوجەوانان کردووە. ئەم تیۆرە دەڵێت: ئەو نەوجەوان و گەنجانەی کە ڕەفتاری هەڕەشە ئامێزیان هەیە، زیاتر تووشی گرفتە دەروونییەکان دەبن (وەك بەکارهێنانی حەشیش).[٢٢٣] بۆ ڕاستی و دروستی ئەم تیۆرە چەندین توێژینەوە ئەنجام دراوە، دەرکەوتووە ئەو نەوجەوانانەی کە حەشیش بەکاردەهێنن، گریمانەی زیاتری تووشبوون بە ماددەی کهولیان لێ دەکرێت، لە هەمان کاتدا لە ڕووی سێکسییەوە بێموبالاتن؛ لەوانەیە کاری نایاسایی ئەنجام بدەن؛ شەڕ بەرپا بکەن یان لەگەڵ دایك و باوکانیان تووشی کێشە ببن. لێکۆڵینەوەکان نیشان دەدەن کە ئەو

---

٢٢٢. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٩٨-١٠٠.

٢٢٣. فاید؛ **سیکولوجیة الإدمان**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٩٥-١٩٦.

نەوجەوانانەی کە لە دواناوەندی ماریجوانا (حەشیش) بەکاریان هێناوە، ڕێژەی زیاتری تەڵاق و دزی و لادانەکانی دیکە لە لایان دەبینرێن و زیاتر دەچنە لای پزیشکە دەروونییەکان بۆ ڕاوێژکردن.[٢٢٤]

**ب. تیۆری گروپی هاوتەمەنەکان** (Peer cluster theory)؛

ئەم تیۆرە لە لایەن ئۆتینگ و بوالیس لە ساڵی (١٩٨٦ـ١٩٨٧) خرا بەر باس و لێکۆڵینەوە، کە هەندێك لە بابەتەکانی تیۆری ڕەفتاری کێشەئامێزیش لە خۆ دەگرێت. بەپێی ئەم تیۆرە تەنیا گۆڕاوی سەرەکی لە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، کاریگەریی هاوتەمەنەکانە کە هەڵیانبژاردوون بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵیان کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ژێر کاریگەریی ئەواندا پەلکێشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن.

بەپێی ئەم تیۆرە چوار گروپ لە گۆڕاوەکان کاریگەرییان هەیە لەسەر پەیوەندییەکانی نەوجەوانان لەگەڵ هاوتەمەنەکان بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان:

١) گۆڕاوەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی، وەك تەڵاق لە خێزاندا و پێگەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری، کە گریمانەی ئەوەی لێدەکرێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەلومەرجی پێویست بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بێنێتە ئاراوە.

٢) تایبەتمەندییە دەروونییەکان، سیفاتە کەسایەتییەکان، خوو و ڕەفتاری نەجەوانان کە پەیوەندی و دڵگیریان بە هاوتەمەنەکان زیاتر دەکات.

٣) دیدگا و بۆچوونەکانی نەوجەوانان سەبارەت بە ڕەفتاری لادان بەگشتی و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بە تایبەتی.

---

٢٢٤. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٩٤.

٤) پەیوەندییەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون، کە ڕوونکەرەوەی پەیوەندییەکانی نەوجەوانانە لەگەڵ کەسانێك کە لەوانەیە هاندەر یان ڕێگر بن لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.[٢٢٥]

**ج. تیۆری هەڵبژاردەی عەقڵانی (Rational choice theory):**

بەپێی ئەم تیۆرە تاکەکان بەرەو ئەم مادده هۆشبەرەکان پەلکێش ناکرێن، بەڵکو ئەوان بە شێوەیەکی کارا ئەم کارە ئەنجام دەدەن و پێیان وایە ئەرزشی ئەوەی هەیە مرۆڤـ خۆی لەقەرەی وەها کارێك بدەن. ئەم تیۆرە هەندێك لە فاکتەرە تاکییەکانمان بۆ دەردەخات لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان؛ واتە موغامەرەکردن (خۆتێهەڵقورتاندن و هەستی زانینخوازی) یەکێکە لەو هۆکارانەی وا لە تاك دەکات بە تایبەتی نەوجەوانان حەزیان لە دۆزینەوەی شتە نەناسراوەکان بێت. جا ئەگەر ئەو گروپە هاوتەمەنەی کە تاك دەبێتە ئەندام تیایدا بە ماددەکان تووشبوو بن، بە بێ ڕەچاوکردنی کاریگەریی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی هاوتەمەنەکانی، بەپێی کونجکاوی خۆی دەست دەداتە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.[٢٢٦]

ئارەزووی تامکردن و چێژوەرگرتن، دژ بە یاساکان پەیوەندییە خێزانییەکان ڕەفتارکردن، ڕەخنە لە نۆرمە کۆمەڵایەتیەکان، ئارەزووی دەربازبوون، هەندێك جار خۆکوژیش بناغەیەکە بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.[٢٢٧]

لەوانەیە هەندێ جار مەرجی بە ئەندامبوونی گروپێکی هاوتەمەن، بەکارهێنانی ماددەکان بێت کە لەو کاتە ماددەکان یەکێك لە هۆکارەکانی

٢٢٥. هەمان سەرچاوە؛ ل ٩٥.

٢٢٦. وایت؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٣١٠.

٢٢٧. بهرامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٩٦.

**هاوبەندی گروپەکە دەبێت؛ بەڵام لێرەدا زیاتر جەخت دەکرێتە سەر هەڵبژاردنی عەقڵانی تاك کە دەیەوێت پێ بنێتە ناو ئەو جۆرە گروپانە.**[228]

**٤. تیۆری کردەی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی** (Social Interaction Theory):

**هێربەرت مید و چارلز کولی لە دیارترین کەسانی ناو ئەم بۆچوونەن، کە گرنگیان داوە بە چۆنیەتی دروستبوونی تێڕوانین سەبارەت بە خود وەکو کەسێکی تاوانبار یان لادەر. لەم ناوەشدا دەزگاکانی کۆمەڵایەتی رۆڵێکی سەرەکییان هەیە. کردەی کۆمەڵایەتی تاك، جا چ کردەیەکی تاوانکاری بێت یان ناتاوانکاری، لە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی دوولایەنە و ڕووبەڕوودا دروست دەبێت.[229] بنەمای سەرەکی ئەم تیۆرییە، کە تیایدا ناسنامەی تاك بە کردەی دوو لایەنەکانی نێوان خود و ئەوانی تر بەستراوەتەوە، لە ڕێگەی کردەی دوولایەنە لەگەڵ کەسانی تر دروست دەبێت و بەردەوام دەبێت. ئەم تیۆرە وەڵامی پرسیارێك دەداتەوە کە دەڵێت: تاك چۆن خۆی هەڵدەسەنگێنێت؟ چۆن ئەم هەڵسەنگاندنە لەگەڵ پێناسەکانی ئەوانی تر هاودەنگ دەبێت؟**[230]

**أ. تیۆری ناولێنانی کۆمەڵایەتی** (Social labeling theory):

**ئەم تیۆرە زۆرتر لە تیۆرەکانی بیکەر لە ساڵی (١٩٦٦) بەرچاو دەکەوێت کە مامەڵەی لەگەڵ پەیوەندییەکان یان پەیوەندیی کارلێکی هێمایی، کردووە.**[231] **ئەم تیۆرە باوەڕی وایە کە بیرکردنەوە و ڕەفتاری مرۆڤ بەپێی ئەو پەیامانەیە کە**

---

٢٢٨. هەمان سەرچاوە؛ ل٩٧.

٢٢٩. ستودە؛ **آسیب شناسی اجتماعی**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٤٦.

٢٣٠. سلیمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٧٣.

٢٣١. ورسلی، پیتر؛ **جامعەشناسی مدرن**؛ ترجمە حسن پویان؛ ج٢؛ چ١؛ تهران: انتشارات چاپخش (١٩٩٦)؛ ص٥٣٦.

له دەوروبەری خۆی له خەڵك وەردەگرێت. ئەم تیۆره ڕەفتاری تاك دەکاته خوڵگه بونیادی ڕەفتاری تاك له چوارچێوەی چاوەڕوانییەکانی ئەوانی تر دا دەبینێت.[232] له بواری خووگرتن به مادده هۆشبەرەکان، وا دێته بەرچاو که هێماکان، نیشانەکان، چاوەڕوانییەکان و ڕەفتاری کەسانی تر که خووگرتوو نین و دەتوانن، به گووتەی گیدنز[233]، پێناسه ئەخلاقییەکان به خەڵکانی تر بقەبووڵێنن و به شێوەی فەرمی یان نافەرمی، نوێنەری هێزەکانی سیستەم و یاسان، سەرچاوەی سەرەکیی ناولێنان دەستەبەر بکەن؛ بۆ نموونه به نیشانەکانی ڕەنگبزرکێ، چاوه خەواڵوەکان، به سستی به ڕێگادا ڕۆیشتن، کەسی خووگر دەناسرێتەوە.

ئەو کۆمەڵناسانەی کەوا باوەڕیان به تیۆری ناولێنانی کۆمەڵایەتی هەیه له ڕوویەکەوه دەڕواننه مادده هۆشبەرەکان ودەڵێن هەندێك مادده هۆشبەرەکان بەناولێنانی ناڕەوا و هەندێکی تر بەڕەوا وەردەگرن، و ئەوەی کام له بەکارهێنەرانی مادده هۆشبەرەکان به لادەر بناسرێت بەستراوەته بەوه که چ کەسانێك له کۆمەڵگادا له لوتکەی دەسەڵاتدان؛ بۆ نموونه له وڵاتانی ڕۆژئاوا ئەلکهۆل ماددەیەکی هۆشبەره که له لایەن خاوەن دەسەڵاته کۆمەڵایەتییەکان قەبوڵ کراوە. بۆیه بەکارهێنانی شتێکی ئاساییه و قەبوڵ کراوە. به پێچەوانەوه بەکارهێنانی ماریجوانا یان تریاك لەبەر ئەوەی له لایەن کەسانێك بەکار دەهێنرێت که له ڕووی کۆمەڵایەتییەوه بێدەسەڵاتن، قەدەغه کراوه و ناوی لادەر له بەکارهێنەرانی دەنرێت؛ بۆیه کاردانەوەی کۆمەڵگا هیچ پەیوەندییەکی به سیفاته سەرەکی و زاتییەکانی ئەو ماددانەوه نییه، بەڵکو پەیوەندی به پێگەی کۆمەڵایەتی تاکەوه هەیه. لەم تیۆرەدا ناولێنانی وشەی لادەر،

---

٢٣٢. کواراکیوس، ویلیام س؛ **بزهکاری نوجوانان**؛ ترجمه جعفر نجفی زند؛ چ١؛ تهران: نمایشگاه کتاب کودکان (١٩٩٤)؛ ص ٦٣.

٢٣٣. گیدنز، آنتونی؛ **جامعەشناسی**؛ ترجمه منوچهر صبوری؛ چ٥؛ تهران: نشر نی (٢٠٠١)؛ ص ١٤٣-١٤٤.

هۆكارێكی بەهێزە كە تاكی لادەر دیاری دەكات. بۆ نموونە لەوانەیە قوتابیەك ماددەی هۆشبەر بەكاربێنێت و لە لایەن كەسانێكەوە ببینرێت، و ناولێنانی لادەری لێبنرێت، ئەو كاتەی قوتابی ئەم ناونیشانە (لادەر)ی قەبوڵكرد و لەم ڕوانگەیەوە تەماشای خۆی دەكات، لە داهاتووشدا بەپێی ئەمە ڕەفتار دەكات.[٢٣٤]

### ب. دیاردەناسی یان فینۆمێنۆلۆژی (Phenomenology):

دیاردەناسی وەك تیۆرێكی فەلسەفی لە سەرەتاكانی سەدەی بیستەم لەلایەن ئیدمۆند هۆسرل دامەزرا و دواتر بەكارهێنانە فەلسەفییەكەی لە كۆمەڵناسی و دەروونناسیی كۆمەڵایەتی لە لایەن "ئەلفرید شۆیتز" ئەنجام درا، تا سەرنجام لە لایەن كارفینكڵ، گریمانەكانی دیاردەناسی لە ژێر ناونیشانی "ئیتنۆمیتۆدلۆژیای خەڵك" بەكارهێنرا و، چەندین زانای وەك سیكۆرێڵ، فیلپس، داكڵس لە بوارەكانی تاوانی كۆمەڵایەتی خستیانە بواری جێبەجێ كردنەوە.[٢٣٥]

دیاردەناسی لە ناسینی ماهییەتی لادان و تاوان، جەخت دەكاتە سەر واتابەخشین بە كۆمەڵگا، ڕێكخستنی كۆمەڵایەتی و لادانە كۆمەڵایەتییەكان لە ڕێگەی كردەی دوولایەنە. دیاردەناسی لەو باوەڕە دایە كە لە ناسینی تاوان نابێ وەك دیاردەیەكی بابەتی توێژینەوەی لەسەر بكەین، بەڵكو پێویستە سەرنج بدەینە فەهم و ڕاڤەكردنی زیهنی خودی لادەر و تاوانبار.[٢٣٦] دیاردەناسی هەوڵدەدات تاكو گرێكوێرەكانی دەروونی تاوانبار وەك دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی

---

٢٣٤ برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١١٠-١١١.

٢٣٥. ریتزر، جورج؛ **نظریه جامعه‌شناسی در دوران معاصر**؛ ترجمه محسن ثلاثی؛ چ١؛ تهران: انتشارات علمی (١٩٩٨)؛ ص ٣٢١.

٢٣٦. ممتاز، فریده؛ **انحرافات اجتماعی: نظریه‌ها و دیدگاهها**؛ چ٢؛ تهران: شرکت سهامی انتشار (٢٠٠٦)؛ ص ١٥٧-١٦١.

دەرك و فەهم بكات. لە گریمانەكانی دیاردەناسی ئەوەیە كە لادانی كۆمەڵایەتی پرۆسەیەكی پەیوەندی و كردەی دوولایەنەی كرداره واتادارەكانی تاكەكانی كۆمەڵگایە؛ بۆ ناسین و دەرككردنی پێویستە بۆچوونی ئەنجامدەرانی لە بەرچاو بگرین و بە دەروونفەهمی و دەرك دەتوانین دیارەدەكە شی بكەینەوە.[237]

دیاردەناسان ئامارە ڕەسمییەكانی تاوان و لادانەكان قەبوڵ ناكەن و جەخت دەكەنە سەر پاڵنەرەكانی دەروونیی تاوانكاران و لادەرەكان. ئەوان لە دوای ئەو مانایەن كە لە پشت ڕەفتاری لادان دایە.[238]

### ج. پۆست مودێرنیزم (Post modernism):

پۆست مودێرنیستەكان یەكەم جار لەسەرەتای سەدەی بیستەم لە فەڕەنسا وەكو ڕەوتێكی فەلسەفی هاتنە كایەوە و ڕەخنەیان لە هەموو بەها و دەستكەوتەكانی مودێرنیزم گرت؛ وەكو: داهێنان، عەقڵانییەت، زانستگەرایی، بابەتیگەرایی و... و لە جیاتی داوای سەرنجدانی زیاتر بە بەهاكانی پۆست مودێرنیزم بوون؛ وەكو: هەست، سروش و ئیلهام، خودگەرایی و... تاكو ژیانی مرۆڤ بگاتە ئەو ڕادەی كە خۆیان دەیانەوێ بەو شێوەی كە ئەوان بە ویست و هەستی خۆیان وێنە دەكەن و مانای پێدەبەخشن.[239]

پۆست مۆدێرنیستەكان پێیان وایە كە تاوانناسان، چاوپۆشی دەكەن لە دیدگا و ڕای خودی تاكی تاوانبار و لادەر، یان قوربانییەكان و یان هەر كەسێكی

---

٢٣٧. ولد، جورج و دیگران؛ **جرم شناسی نظری: مروری بر نظریه‌های جرم شناسی**؛ ترجمه: علی شجاعی؛ تهران: انتشارات سمت (٢٠٠١)؛ ص ١٤٧.

٢٣٨. سلیمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٣٠.

٢٣٩. بیات، عبدالرسول و دیگران؛ **فرهنگ واژه‌ها: درآمدی بر مكاتب و اندیشه‌های معاصر**؛ چ ٢؛ قم: مؤسسه اندیشه و فرهنگ دینی (٢٠٠٢)؛ ص١١٢-١٢٦.

دیکە بە نیسبەت ڕەفتاری لادان و هەروەها شێوازی کاردانەوەیان بەو ڕەفتارە و حیسابێکیان بۆ ناکەن. لەم ڕوانگەیە دا دەتوانین بڵێین: تاوانناسان بەپێی ڕای پۆست مودێرنیستەکان، دیدگا و بۆچوونەکانی خۆیان سەبارەت بە بابەتی لێکۆڵینەوە (وەکو ماددە هۆشبەرەکان) دەسەپێنن. لێرەدایە کە پۆست مودێرنیستەکان لەگەڵ فینۆمینۆلۆژیستەکان پەیوەست دەکات.[٢٤٠]

## ج. تیۆرە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان:

١. **تیۆری خێزان** (Family Theory):

ئەو تیۆرە ڕەتی دەکاتەوە کە نەخۆشی یان کێشەکانی تاك سەرەتایەك بێت بۆ خووگرتنی تاك. ئەو تیۆرە پێی وایە ڕەفتاری خووگرتن دەگەڕێتەوە بۆ خێزان و جەخت دەکاتە سەر چۆنیەتی کارتێکردنی کێشەکان لەسەر هەر ئەندامێکی خێزان و کاریگەرییەکانی خووگرتن لەسەر خێزان وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو.[٢٤١] ئەم تیۆرە وای دادەنێت کە خووگرتن یەکێکە لەو ڕێگایانەی خێزان بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ژیان و ڕووبەڕووبونەوەکان دەیگرێتە بەر و خووگرتن ڕێگایەکی خۆ گونجاندنە لەگەڵ بارودۆخی ژیان.[٢٤٢]

ڕەفتاری ڕێپدراو و ڕێپەنەدراوی ناو خێزان پاڵپشتی ڕەفتاری خووگرتن دەکات، ئەو نەریت و بەندوباوانەی خێزان هەیەتی و ئەو یاسا و ڕژێمانەی دەیسەپێنێت، هەموویان بەشدارن لە گرفتی خووگرتن. هەر وەك پەیوەندیی ناکاریگەریی دەربڕینی دیاریکراوی هەست و نەست لە ناو کەش و هەوای خێزان،

---

٢٤٠. صدیق سروستانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٧٥-٧٦.

٢٤١. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٤٨.

٢٤٢. سویف؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٨٨.

هەموو ئەوانە سیفەت و تایبەتمەندی ئەو بۆچوونە ناڕێك و ڕەفتارە توندەکانیان لەگەڵ منداڵەکانیان، هاندانێکە بۆ ڕەفتاری خووگرتن، جگە لەوەی گوێ پێنەدان و توڕەبوون لە هۆکارەکانی ئاڵودەبوونن.[٢٤٣]

٢. **تیۆری سیستەمەکان** (System Theory):

ئەم تیۆرە کارلێك و هاوکاری و پشتبەستنی دوولایانە و تەواوکاری یان تەبایی ئەندامەکان لە ناو سیستەم دا دووپات دەکاتەوە. بەم پێیە هەموو ئەو ئەندامانەی بەیەکەوە دەژێن وەکو سیستەمی کراوە وان. سیستەمی کراوەش (open system) پارێزگاری لە بەردەوامی دەکات و بە ژینگەش بەستراوە. سیستەمی کراوە جیاوازترە و تایبەتمەندتر و کۆنترۆڵکراوترە لە کاتێکدا سیستەمی داخراو (Close system) لە ژینگە دابڕاوە و بۆ لای زۆربوونی ئاڵۆزییەکان دەجولێت. ئەو تیۆرە کەسەکان وا وەسف دەکات کە کۆمەڵایەتین زیاتر لەوەی گرنگی بە لایەنی دەروونی و بایۆلۆژییان بدات. هاوکاری نێوان ژینگە و کەسەکان شتێکی گرنگ و هەستیارە لەو تیۆرەدا؛ بۆ نموونە لابردنی ژەهر لە کەسێکی خووگرتوو لە بنکەی چارەسەرکردن بە چارەسەرێکی لاواز دادەنرێت ئەگەر کەسەکە حەزی لە گەڕانەوە بۆ ژینگەی خووگرتن بێت.[٢٤٤]

٣. **تیۆری ئەنترۆپۆلۆژیا** (Anthropological Theory):

ئەم تیۆرە گرنگی بەو بنەما و نەریت و بیروبۆچون و لایەن و پێورانە دەدات کە هەر کەسێك بەرامبەر بە وەرگرتنی ماددە هۆشبەرەکان و ڕەفتاری خووگرتن هەیەتی. کۆمەڵگا سەرەتاییەکان ژمارەیەکی زۆری ماددەی هۆشبەریان ناسیوە

---

٢٤٣. هەمان سەرچاوە؛ ل ٨٩.

244. Rasmussen, Op.cit, (P 114).

و بەکاریان هێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا خووگرتن بەو شێوازەی ئێستا ناسراو و زانراو نەبوو. لێکۆڵینەوەکان ئەوە دووپات دەکانەوە کە کاری یەکەمی ئەلکهۆل و ماددە هۆشبەرەکان لەناو هەموو کۆمەلگایەك دا، دابەزاندنی شڵەژانە بە زۆریش ئەوە لە کۆمەڵگا ناجێگر و ناتەواو و گۆڕاوەکان دا هەیە.[٢٤٥]

٤. **تیۆری دەروازە** (Gataway Theory):

پێشنیاری ئەوە دەکات کە وەرگرتنی داو و دەرمانی رێپدراو و رێپەنەدراو، دەروازە و ڕێگایەکە بۆ وەرگرتنی ماددەی هۆشبەری ڕاستەقینە. زۆر لێکۆلینەوە بە تایبەتی ئەوانەی لەسەر هەرزەکاران کراوە، ئەوەیان دۆزیوەتەوە کە وەرگرتنی تۆباکو (جگەرە) و ئەلکهۆل کەسەکە بۆ لای بەکارهێنان و خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکانی دیکەش دەبات. پێشکەوتنەکە لەسەرەتا دا بە بەکارهێنانی توتن و ئەلکهۆل دروست دەبیت، پاشان بە وەرگرتنی جۆرەکانی دیکەی ماددە هۆشبەرەکان لە کۆتایشدا دەبێتە ماددە هۆشبەرە سەختەکان وەکو ئەفیونەکان (Hard drug).[٢٤٦] هەروەك لە لێکۆڵینەوەکەماندا دەرکەوت کە ڕێژەی (١٠٠٪)ی خووگرتووەکان بەر لەوەی ماددە هۆشبەرەکانی دیکە بە کار ببەن، جگەرەکێش بوونە و ڕێژەی (٦٠٪)یشیان پێشتر مەشروباتی ئەلکهۆلیان خواردۆتەوە.

٥. **تیۆری ئابووری** (Economic Theory):

گرنگی بە خەرجی و مەسرۆفاتی کۆمەلایەتی دیاردەی خووگرتن دەدات و پێی وایە ڕەگەزی ئابووری لە سیاسەتی وڵاتاندا ئامانجی گۆڕینی شێوە و نەریتی بەکاربردنە (عادات الإستهلاك). ئەم تیۆرە لێکۆلینەوەی لەسەر فاکتەرە

245.Ibid, (P 116).
246. Ibid, (P 118).

کاریگەرەکانی ڕەفتاری بەکاربردن و ڕەفتاری خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان دەکات و هەروەها پەیوەندیی نێوان کێشەی خووگرتن لەگەڵ ئاستەکانی بەکاربردن و نموونەی بەکاربردن کە پەیوەستن بە مادده هۆشبەرەکان باس دەکات؛ چونکە پێی وایە خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان ڕەگەزێکی گرنگە لە لایەنی ئابوورییەوە.[٢٤٧]

247. Ibid, (P 119).

## چوارەم: هەڵسەنگاندن و کۆکردنەوەی ڕوانگەکانی تیۆری:

هەر وەکو لە پێداچوونەوەی ئەو ڕوانگانە و تیۆرانە دەردەکەوێت، هەر ڕوانگە و توێژینەوەیەك بە گشتی لە دیدگایەکی تایبەتەوە دەڕوانێتە خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان. ئەگەرچی هەندێ جار قەتیسبوونی تیۆرەکان لەسەر فاکتەرێك شتێکی ڕێپێدراوە و جێگەی باسە، بەڵام بێگومان سەر دەکێشێت بۆ سنووردارکردنی دووربینی و شیکردنەوەی تیۆری. هەر ڕوانگەیەك لەوانەیە جۆرێك لە جۆرەکانی خووگرتن بە باشی ڕوونبکاتەوە، بەڵام لە شیکردنەوەی جۆرەکانی تر و بوارەکانی تر دەستەوەستان دەبێت؛ بە تایبەتی سەبارەت بە خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان کە تاك فاکتەر نییە. داکۆکیکردن لە ڕوانگە و تاك فاکتەرێك، هەڕەشەی سەپاندنی تیۆرێکی تایبەت لەسەر دیاردە و لە ئەنجامدا ئەنجامی ناواقعی بەرز دەکاتەوە. لەم ڕوانگەیەوە لە توێژینەوەی ئێستا دا هەوڵدراوە تا جگە لە کۆکردنەوەی ڕوانگەکانی سەرەوە کار بۆ دروستکردنی تیۆرێکی تێکەڵاو (مرکب) بکەین.[٢٤٨]

بەڵام لەگەڵ ناسینی هەمە لایەنەی پرسەکە پێویستە لە سروشت و فترەتی مرۆڤ بکۆڵینەوە کە ئاخۆ مرۆڤ لەبەر پێویستییەکانی زانستی لەو ڕوویەوە کە مرۆڤە خوو دەگرێت بە مادده هۆشبەرەکان؟ ئایا خووگرتن لەگەڵ سروشتی مرۆڤانە تێکەڵاو بووە و خوو وەك غەریزەیەك لە مرۆڤدا بوونی هەیە؟ ئایا تەواوی مرۆڤەکان بە دوور لە هەر جۆرە کاریگەرییەکی ژینگەیی و کۆمەڵگا و دژایەتییە ڕۆحی و دەروونییەکان، بە پاڵنەری خووگرتن دروست کراوە؟ ئایا پاڵنەری خووگرتن تەنیا دەبێ لە ڕۆح و دەروونەوە بۆی بگەڕێین یان لاشە و

٢٤٨. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١٣.

زنجیرەی دەمارەکانیش بەشدارن تیایدا؟ ڕوونبوونەوەی پرسی خوو و خووگرتن کە شتێکی زاتییە یان وەرگیراو، باشتر دەتوانین بڕیار بدەین سەبارەت بە فاکتەرەکانی خووگرتن و تەرککردن و تەرکنەکردن. ئەمڕۆکە زۆربەی فەیلەسوف و زانایان بەشداری پێکردنی بابەتە جینیتیکی و بۆماوەییەکان لە ((خوو)) دا بە ڕەوا نازانن و خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان بە ویست و فێربوونەوە دەبەستنەوە و باوەڕیان وایە کە غەریزەیەك بەناوی ((خوو و پاڵنەری خووگرتن)) لە ناخی مرۆڤدا بوونی نییە و هیچ مرۆڤێك بە خووەکانی لەدایك نەبووە و بۆیە پرسی خووگرتن بەماددە هۆشبەرەکان و هەروەها تەرککردنی لە وتەکانی هەڵبژاردن و مەیلکردن لە ژێر کاریگەریی ویستی مرۆڤ دایە؛ بۆ نموونە ئەرەستۆ دەڵێت: ((خوو بە تێپەڕینی کات، وردە وردە لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی کار و جوڵانێك کە سروشتی و فیتری نییە، بەدی دێت. بۆیە بونیاد و بنەمای خوو دووبارەکردنەوەی کارە. پێش لەسەرهەڵدانی خوو لە هەر کارێك، پاڵنەر و ئارەزووکردنی، بە خاڵی دەستپێکی خوو دادەنرێت کە بە ویست و ئازادیی مرۆڤ ئەنجام دەدرێت و دواتر بە دووبارە بوونەوەی دروست دەبێت)).[٢٤٩]

لەبەر ئەوە خووگرتن و هەموو کێشە کۆمەڵایەتییەکانی تر لە شیکردنەوەی کۆتاییدا دەگەڕێنەوە بۆ تاك، بەڵام تاك بە دابڕان لە ژینگەی دەوروبەری خۆی کە لە ئاستی جیاوازدا بوونی دەرەکی هەبێت، بۆچوونێکی بێواتایە.[٢٥٠] ڕوانگەیەك دەتوانێت شیکردنەوەی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان بکات کە بەردەوام

---

٢٤٩. هەمان سەرچاوە؛ ص ١١٣-١١٤.

٢٥٠. هەمان سەرچاوە؛ ل١١٤.

لەسەر تاك و كۆمەڵگا و ئاستە جیاوازەكانی بونیادی كۆمەڵایەتی بلەرێتەوە لە پەیوەندییەكی هاودەنگدا لەبەر چاوی بێت و لەسەریان بوەستێت.[٢٥١]

لەبەر ئەم كارە، ئەم چوارچێوەیەی خوارەوە پێشنیار دەكرێت كە هەم سەرەنج دەداتە بونیادی كۆمەڵایەتی و هەم تۆڕی پەیوەندییە دوولایەنەكان و سیستەمی كۆمەڵایەتی و، هەمیش تاك و ڕەفتارەكانی.

لەم چوارچێوەیە، دەتوانین لە سێ ئاستی: قەبە، ناوەندی و بچووك بخەینە ڕوو:

***١. ئاستی قەبە (Macroscopic):***

لەم ئاستەی شیكردنەوە، باس لە بونیادی كۆمەڵگا دەكرێت و ڕادەی دروستكردنی كێشە دەخاتە بەر باس و لێكۆڵینەوە. دروستكردنی كێشە لە كۆمەڵگادا لە هەلومەرج و گۆڕانكاریی مێژوویی هەر كۆمەڵگایەك هەڵدەقولێت و بە سەر تاكدا دەسەپێنرێت. ئەم هەلومەرجانە، دروستكەری ئامادەگی كۆمەڵایەتیی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەكانن؛ واتە ئەو هەلومەرج و گۆڕانكارییانەی كە كۆمەڵگا ئامادە دەكات بۆ تووشبوون بە مادده هۆشبەرەكان و كۆمەڵگایەك ئامادە نابێت بۆ تووشبوون بە مادده هۆشبەرەكان. لە ئاستی ماكرۆییدا كۆمەڵێك هۆكاری ئابووری، سیاسی، كولتووری، كۆمەڵایەتین كار دەكەن بۆ بەرزبوونەوە یان دابەزینی ئامادەگی كۆمەڵایەتیی هەر كۆمەڵگایەك بۆ خووگرتن بە مادده هۆشبەرەكان؛ بۆ نموونە ئەو كۆمەڵگایانەی كە بە دروستكەری سترێس و فشاری دەروونین ناو دەبرێن و دەبنە هۆی شڵەژانی گشتی، ئامادەیی زیاتریان تێدایە بۆ دەركەوتنی ژمارەیەكی زۆرتری خووگرتووان. یان ئەو كۆمەڵگایانەی كولتوور یان وردە كولتوورەكانی،

٢٥١. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٧.

پشتگیری له خووگرتن به مادده هۆشبەرەکان دەکەن، دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی خووگرتن بەو ماددانە لە ناو خەڵکدا. لە ڕاستیدا ئاستی ماکرۆیی، ئاستی سەپاندنە کۆمەڵایەتییەکانە کە لە ناخی بونیادی کۆمەڵایەتیدایە، کە دەتوانێت ئاسانکاری یان ڕێگری بکات لە تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان.[٢٥٢]

### ٢. *ئاستی ناوەندی (Messoscopic)*؛

لەم ئاستەی شیکردنەوەدا، سەرنج دەدرێتە شوێنە ئیکۆلۆژی و جوگرافییەکانی جۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی گروپەکان و ڕێکخراو و دەزگاکانی کۆمەڵایەتی کە چۆن دەبنە مایەی ئاسانکاری یان دواکەوتن، توندی یان لاوازیی شەپۆلی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان؛ چونکە هەندێك شوێن تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان تیایدا زۆرترە لە هەندێك شوێنی تر. هەر وەکو لەو شوێنانەی کە ماددەکان بوونیان هەیە زۆربوونی تووشبووان زیاترە؛ چونکە سەلمێندراوە کە بەردەستبوون و گەیشتن بە کارێکی خراپ بە واتایەکی گشتی، خۆی لەخۆیدا هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ تووشبوون بەو خراپەیە. هەروەها پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، دام ودەزگا کۆمەڵێیەکان کە لە دڵی بونیادی کۆمەڵگادان لە ئامادەکردنی کۆمەڵگا بۆ تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان ڕۆڵیان هەیە.[٢٥٣]

---

٢٥٢. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١٤.

٢٥٣. هەمان سەرچاوە؛ ل ١١٥.

### ٣. ئاستی ورد (Microscopic)؛

شیکردنەوە لەم ئاستەدا گرنگی بە توێژینەوەی تاك و تایبەتمەندییەکانی دەدات، چونکە لە تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان تەنیا سەپاندنە کۆمەڵایەتییەکان و شێوەی پەیوەندیی دەزگا و ڕێکخراوەکان بە بەرپرس نازانرێن، بەڵکو لە پاڵ هەموو ئەم پرسانەدا، ڕەفتاری تاك کە نیشانەی ئازادی و ویستی ئەوە کاریگەریی هەیە. بابەتی ئاستی ورد یان شیکردنەوەی مایکرۆیی، تایبەتمەندییەکانی تاك دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. گروپێك ئامادەیە بۆ گرفتار بوون بە داوی خووگرتن، و هەندێکی تریش ئامادەییان تێدا نییە. وەکو هەندێ نەخۆشی کە لە ناخی مرۆڤدایە بە گوێرەی بارودۆخە بونیادییەکان، تاك ئامادە دەکات بۆ ئارامکردنەوەی ئازارەکانی، پەنا بۆ ماددەی هۆشبەر بەرێت.[٢٥٤]

---

٢٥٤. هەمان سەرچاوە؛ ل ١١٥.

## پێنجەم: ڕوانگە و تیۆرە زاڵەکانی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستان:

بەپێی لێکۆڵینەوەکەم، دەتوانین ڕوانگەکانی خوارەوە وەکو ڕاڤەکاری خووگرتن و خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستان ڕوون بکەینەوە:

### أ. ڕوانگەی دەروونناسان:

هەر وەك بینیومان ڕوانگەی دەروونناسان، خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان دەبەستنەوە بە جۆرەکانی کەسایەتی[255] و داکۆکی لەسەر حەزە تایبەتییەکانی ئەو کەسانەی دەکەن کە ئامادەییان تێدایە بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان؛ بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە تووشی شڵەژان بوون بۆ دەستخستنی ئارامی، متمانە و لابردنی ماندوویەتی سوود لە ماددە هۆشبەرەکان وەردەگرن. لە ڕاستیدا خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان وەك کردەیەکی فێربوون یان جۆرە میکانیزمێکی بەرگرییە بۆ هێوربوونەوەی کاتی ماندوویەتی یان شڵەژان. هەروەها ئەو کەسانەی کەسێکی وابەستەن زۆر بە توندیش پێویستیان بە ئەوین و خۆشەویستییە، لەوانەیە ڕوو بکەنە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان تاکو شڵەژان و نیگەرانییەکانی خۆیان کەم بکەنەوە.[256]

تیۆرەکانی دەروونناسی سەبارەت بە خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان داکۆکی لەوە دەکەنەوە کە خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان هاوکاتە لەگەڵ

---

٢٥٥. گیدنز؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٨١.

٢٥٦. وجدیان، محمدرضا؛ **ناسازگاری و اعتیاد**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ سال ٢؛ شماره ١٢؛ ص ١٦.

دروستبوونی هێزی پۆزەتیڤ و نیگەتیڤ لای بەکاربەر. بەهێزکردنی پۆزەتیڤانە کاتێك ڕوو دەدات کە خووگرتوو بە مادده هۆشبەرەکان ئەزموونی خوازراوەکان وەکو دڵخۆشی، چێژ و کەوتنەبەردڵی هاوتەمەنەکانی بۆ دروست بکات. لاوازکردنی هێزی نێگەتیڤانە کاتێك ڕوو دەدات کە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان ببێتە هۆی کەمکردنەوەی کاتی ئەزموونە تاڵەکانی وەکو ئازار، شڵەژان، بێتاقەتی و تەنیایی.[٢٥٧]

"زیگمۆند فرۆید"، کە یەکێکە لە تیۆرەوانەکانی دەروونناسیی شیکاری، پێی وایە کە خووگرتن بە هۆی پاڵنەری تێکشکان و سەرکەشی بەرامبەر خۆی دروست دەبێت و کەسەکە بە لەناوبردنی خۆی و زیان گەیاندنی ئەوانی تر، ئەم پاڵنەرە رازی دەکات.[٢٥٨]

"کارل هۆرنای" یش باوەڕی وایە لەوانەیە تاك بۆ هەڵاتن لە شڵەژان و نکۆڵیلێکردنی پەنا بۆ هەر ئامرازێك بەرێت. لەم بارەدایە تاك هۆشیارانە و بە مکوڕبوون، بە توندی حەزی دەچێتە کهول و مادده هۆشبەرەکان. "وێڵکەر" باوەڕی وایە ئەو کاتەی تاکی خووگرتوو ناتوانێت کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات و ڕووبەڕووی دەرگیرییە سۆزدارییەکانی ببێتەوە، بۆیە پەنا بۆ مادده هۆشبەرەکان دەبات.[٢٥٩]

ئەنجامەکانی توێژینەکەوەم لە دوای چاوپێکەوتن و ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ خووگرتووانی بەندکراو لە هەولێر لە ڕێگای پرسیارەکان و ئەو تێبینییانەی کە ڕاستەوخۆ بینیم، ئەوە نیشان دەدەن کە خووگرتووان بە گشتی خاوەن دڵتەنگی، شڵەژان، هەستکردن بە تەنیایی، لە دەستدانی پەیوەندییە

---

٢٥٧. آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٥٧.

٢٥٨. میرافخمی، سعیده؛ **تحقیقی در خصوص اعتیاد و شیوەهای پیشگیری از آن**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠١)؛ سال ٣؛ شماره ٢٩؛ ص٤١.

٢٥٩. هەمان سەرچاوە؛ ل ٤٢.

سۆزدارییەکان، بێزاری و هەستکردن بە بێتوانایی و خۆبەکەم سەیرکردن، متمانە بە خۆبوونی لاواز، ڕەشبینی، نائومێدی، ناڕازیبوون، هەستکردن بە پووچی و بێئامانجی، لاوازی و سستی ویست و زوو ڕەنجان یان هۆکاری خووگرتنیان بەو ماددانە بۆ چێژوەرگرتن، زیتەڵی و چوستی، خۆشگوزەرانی، لادانی ماندوویەتی و ئارامگرتنی دەردە جەستەیی و ڕۆحی و تێکچوونی کەسییەتی و دەروونی بووە.

لێرەدا پێویستە بووترێت، کە ڕوانگەی دەروونناسی لە بواری خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان تەنیا دەتوانێت لایەنێك لە لایەنەکانی بەکارهێنانی ئەو ماددانە ڕوونبکاتەوە؛ چونکە خووگرتن و بەکارهێنانی ئەو ماددانە دیاردەیەکی ئاڵۆزە، کە تەنیا هۆکارە دەروونی و کەسییەکان ناتوانن هۆکارەکانی سەرهەڵدان و پاڵنەری بەکاربەرانی ماددە هۆشبەرەکان ڕوون بکاتەوە؛ بۆیە ئەم دیاردەیە لە ڕوانگەی دەروونناسان ئەگەر چی پێویستە، بەڵام بەس نییە. لەوانەشە دروستبوونی شڵەژانەکان، دڵتەنگییەکان، تێکچوونی دەروونی و.. لە ئەنجامی نالەباری ژینگەی خێزانی یان کۆمەڵایەتی تاکەوە سەرهەڵبدات.

## ب. ڕوانگەی کۆمەڵناسان:

### ١. ڕوانگەی ئەرکگەرایی ـ بونیادی لە ڕەهەندی ورد (مایکرۆ):

دەتوانین بڵێین: گرنگترین و بەربڵاوترین ڕوانگە زاڵەکان لە ڕوونکردنەوەی خووگرتن و خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستاندا بریتییە لە خێزان و ڕۆڵی لە ئاڕاستەکردنی تاکەکان بە تایبەتی لاوان و نەوجەوانان لە خووگرتن بەو ماددانە. ڕۆڵی بونیادی خێزان وەك یەکەمین شوێن لە دروستکردنی کەسییەتی منداڵ و دیاریکردنی ناسنامەی تاك زۆر بەرچاو و

دیارە؛ بۆیە بە جۆرێکی ناڕاستەوخۆ کاریگەریی هەیە لە بونیادی کۆمەڵگا و لەم ڕوانگەیەوە سەرچاوەی زیادبوونی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکانە.

ڕوانگەی ئەرکگەرایی ـ بونیادی لە ڕەهەندی مایکرۆدا، ڕۆڵی خێزان لە تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان ڕووندەکاتەوە، کە هەر کاتێك پێوەرەکانی خێزان بە هەر شێوەیەك لاواز بێت و نامۆبوون لەو ئاستەدا ڕوو بدات ــ واتە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی تاك لە خێزاندا بەشێوەیەکی تەندروست بەڕێوە نەچووبێت و هاودەنگییەکی کەمتر لە پەیوەندییەکاندا لە نێوان ئەندامانی خێزان پێك هاتبێت ــ تاك ڕوو دەکاتە ماددە هۆشبەرەکان. بەپێی "تیۆری کۆنتڕۆڵی کۆمەڵایەتی"، لادەرەکان زۆر کەمتر بەکۆمەڵایەتیبوونە و خێزان یەکەی سەرەکی بەکۆمەڵایەتی کردنیانە؛ بۆیە هەم لە ڕووی دەروونناسی و هەمیش کۆمەڵناسی "کۆنتڕۆڵی دەروونی"ی تاك لە خێزانەوە سەرچاوە وەردەگرێت. بەو مانایە کە پەیوەندیی گەنجان لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکان و هەر لادانێکی دیکە، پەیوەستە بە نامۆبوون لەگەڵ خێزان.[٢٦٠]

بەپێی ئەساسی ئەم ڕوانگەیە ئەو لاوانەی کە باوانیان لێك جیابوونەتەوە یان بە هەر بەڵگەیەك پەیوەندییەکی بێسەروبەر وکێشەدار زاڵ بێت بە سەر ناوەندی خێزان و کۆنتڕۆڵ و چاودێری نەکرێن لە لایەن باوانیانەوە، لەوانەیە ڕوو بکەنە ماددە هۆشبەرەکان. هەروەها بەسەرنجدانە ڕۆڵی خێزان لە گواستنەوەی پێوەر، بەها و شێوازەکان بۆ منداڵان و نەوجەوانان لە ئەندامانی خێزاندا، لە کاتێکدا یەکێك لە باوان خووگرتوو بێت بەو ماددانە بێجگە لە کاریگەرییە تێکدەرەکانی ماددە هۆشبەرەکان لەسەر خۆی، ئەم منداڵانەش ئەگەری زۆری هەیە کە بەرەو ماددە هۆشبەرەکان پەلکێش بن.[٢٦١]

---

٢٦٠. آبادینسکی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٢.

٢٦١. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٩٣.

"مارسۆلی کۆل" لە زەمینەی ڕۆڵی خێزان لە ئاراستەکردنی (تاك) بەرەو ماددە هۆشبەرەکان دەڵێت: لەبەر یەکترازانی خێزان و یان مردنی یەك لە باوان بە تایبەتی باوك ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لەلایەن لاوانەوە.[٢٦٢]

لەو توێژینەوەیەی کە "ریچارد بلۆم" لە بەراوردکردنی خێزانەکانی بەکارهێنەرانی ماددەی هۆشبەر و خێزانەکانی ئاساییدا لە جەزائیر ئەنجامی داوە، گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە خێزانەکانی بەکارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەکان هاودەنگییەکی کەمتر هەیە لە نێوان ئەندامانی خێزان، چاودێری کەمتری منداڵان دەکەن و ئازادییەکی زیاتر دەدەن پێیان، بیروباوەڕی ئایینی و سوننەتە خێزانییەکان کەمتر لە نێوانیاندا دەبینرێت (لاوازی پێوەرەکان و بەهاکانی خێزانی) و ئەوەندە گوێ نادەنە پەروەردە و فێرکردنی منداڵانیان.[٢٦٣]

لە کوردستانیشدا بەپێی ئەنجامە دەستکەوتووەکانی لێکۆڵینەوەکەم چەند هۆکاریکی وەك ناڵەباری و ساغ نەبوونی پەیوەندیی ئەندامانی خێزان، گوێپێنەدان بە منداڵان و کەمترخەمی لە خۆشەویستنیان، کۆنترۆڵ نەکردنی هاتووچۆی منداڵان، خووگرتنی یەکێك لە باوان بە یەکێك لە ماددە هۆشبەرەکان، لاوازیی پابەندی تاکەکانی خێزان بە بیروباوەڕی ئایینی، لاوازیی ئاستی زانستی و هۆشیاریی منداڵان، جیاوازی لە نێوان منداڵان، پشت گوێخستنی پەروەردەی منداڵان، ئازاد کردنی بێ بەند و بار، توندوتیژی لە ناو خێزان و نەبوونی ئەمنییەتی منداڵان، کاریگەرییان هەبووە لە ئاڕاستەکردنی

---

٢٦٢. شایستە، سیاوش؛ **مقایسه شخصیتی جوانان معتاد به مواد مخدر و جوانـان عـادی**؛ چ١؛ اصـفهان: دانشـگاه تربیت مدرس (١٩٩٧)؛ ص٢٧.

٢٦٣. صالحی، ایرج؛ **زنجیرەهای اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: نشر آوای نور (١٩٩٣)؛ ص ٧٧.

منداڵان بۆ مادده هۆشبەرەکان. (لە بەشی داهاتوو دا ئاماژە بە ئامارەکان و ڕێژەی سەدییان دەکەین).

کەواتە لێرە پاڵپشتی لە تیۆری "تالکۆت پارسۆنز" دەکرێ سەبارەت بە ((کردەی کۆمەڵایەتی و ئانۆمی)) کە لە ڕوانگەی پارسۆنز، سیستەمەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان هۆکاری جێبەجێکردن و ئامرازەکانی بە کۆمەڵایەتیکردنی تاکەکانن. لە کاتێك دا ئەگەر هاتوو ئەم سیستەمە و ڕێکخراوە کاربەدەستانە وەکو: خێزان، قوتابخانە، ڕاگەیاندن، بە ئەرکی خۆیان جێبەجێ نەکەن، کۆمەڵگا تووشی بەرەڵایی و بێسەروبەری کۆمەڵایەتی دەبێت و ئەنجامەکەشی بڵاوبوونەوەی ڕەفتاری لادانە لە کۆمەڵگا.[٢٦٤]

٢. ڕوانگەی ئەرکگەرایی - بونیادی لە ڕەهەندی قەبە یان ماکرۆییدا:

بەپێی ئەم ڕوانگەیە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان وەڵامێکە بۆ لاوازبوونی پێوەرەکان لە کۆمەڵگا. ئەو کاتەی کۆمەڵگا ئاڵۆزتر دەبێت و گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی خێرای تێدا ڕوو دەدات، پێوەرەکان و بەهاکان ئەرکی خۆیان لە دەست دەدەن و نادیار دەبن و نامۆبوون و ئانۆمی دێتە دی؛ واتە حاڵەتێك لە بێپێوەری دێتە ئاراوە. بێپێوەری لەوانەیە لە ئاستی کۆمەڵایەتی بوونی هەبێت، کە لەم بارەدا دەبێتە هۆی پاڵەپەستۆ، بەرگری نەکردنی کۆمەڵایەتی و بێسەروشوێنی لە پێوەرەکانی کولتووری و لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.

بەواتایەکی تر بێپێوەری (ئانۆمی) لە بارودۆخێکدا دێتە ئاراوە کە ڕەفتارە نۆرمەکانی قەبوڵکراو و پێشوەختە دیاریکراوەکان لە لایەن کۆمەڵگاوە، بە هۆی تەنگژەیەکی سەختی کۆمەڵایەتی وەك کێشە ئابوورییەکان، شەڕ و نائەمنی و

٢٦٤. قائم مقامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٣٩.

بێسەروسامانییە کۆمەڵایەتییەکان، باری هاوسەنگی تێکبدات و ببێتە هۆی تێکدانی ژیانی زۆرێك لە خەڵك و بوون و نەبوونی بەها و پێوەرەکانی کۆمەڵگا لاواز بکات[٢٦٥] و، بەم شێوەیە بێپێوەرییەکی زۆر لە ئاستی کۆمەڵگا بەدیدێت کە زەمینە خۆشکەری بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکانە.

توێژینەکانی "روراباو" (١٩٧٥) لە ئەمریکا نیشان دەدات کە بەرزبوونەوەی ڕێژەی خواردنەوەی ئەلکهۆل لە دەیەکانی (١٨٣٠ و ١٩٦٠)، وەڵامێك بوو بۆ گۆڕانە کۆمەڵایەتییە خێراکانی ئەو کاتە کە بوە هۆی فشاری دەروونی لە ناو کۆمەڵگادا.[٢٦٦]

"هێنری لیڤی برۆهل" لەم بارەیەوە دەڵێت : بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان وەك تاوانێك، دیاردەیەکە کە لە ئەنجامی ئەرك و کردە نادروست و هەڵەکانی دەزگا و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان سەر هەڵدەدات؛ ئەو دامەزراوانەی کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری، سیاسی و ئایینی ناتوانین بە هیچ شێوەیەك خۆمانی لێی دەرباز بکەین.[٢٦٧]

بەپێی ئەم ڕوانگەیە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان وەڵامێکە بۆ نەبوونی پەیوەندی بەرچاو لە نێوان تاك وکۆمەڵگا و لاوازی هاودەنگییەکی کۆمەڵایەتی لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوەی کەوا قەبوڵکراوە. بەپێی ئەم ڕوانگەیە "ئەلبرت نی لندز"، "تۆك یینگ تونگ" و "زیاهۆ زو" (١٩٩٦) لە توێژینەوەکانی خۆیاندا گەیشتۆنەتە ئەو ڕاستییەی کەوا ئەو لاوانەی ئایین ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانیاندا

---

٢٦٥. کوزر، لوئیس و روزنبرگ، برنارد؛ **نظریه‌های جامعه‌شناختی**؛ ترجمه: فرهنگ ارشاد؛ چ ٢؛ تهران: نشر نی (٢٠٠٢)؛ ص ٤٠١.

٢٦٦. آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٦٣-٦٤.

٢٦٧. روزا، کرم پور؛ **ارزیابی تحقیقات انجام گرفته در خصوص اعتیاد و سوء مصرف مواد مخدر در ستاد مبارزه با مواد مخدر**؛ چ١؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ ص ٣٣.

دەگێڕێت، کەمتر لەو لاوانەی کە بیروباوەڕیان بە ئایین لاوازە، ڕوو لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەکەن.[٢٦٨]

بارودۆخە هەنوکەییەکانی کۆمەڵگای کوردستان، دەتوانین بە تەواوی لە لایەن ڕوانگەی سەرەوە ڕوونبکەینەوە. لە بەشی پێشوو لە باسی (ڕەوشی مادده هۆشبەرەکان لە کوردستاندا) ئاماژەمان بە خاڵێکی گرنگ کرد کە بریتییە لە هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای کوردی دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١) و باس لە هەندێ ئاماری وردمان کرد کە نیشاندەری ئەم شڵەژانە کۆمەڵایەتییە بوو.

کوردستان شوێنێکی تازە پێگەیشتووە بە بەڵگەی گواستنەوەی لە کۆمەڵگای نەریتییەوە بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن، بەردەوامیشە لەم گۆڕان و گواستنەوەیەدا. هاودەنگ نەبوونی بارودۆخی هەنووکەیی کوردستان لەگەڵ پێویستییەکانی کە بەردەوام لە حاڵەتی گۆڕان دایە، هەروەها لەگەڵ نەبوونی کولتورێکی بەهێز و ئامادە کە بتوانێت هاوسەنگییەك لەگەڵ گۆڕانەکان دروست بکات و یاخود کونترۆڵی ئەم گۆڕانانە بکات، هۆکارێکە بۆ بێسەروبەری، بێسەروسامانی، نەهامەتی ئابووری و تەنگژەی کۆمەڵایەتی کە بۆتە هۆی لاوازکردنی ئەرکە سووننەتی و نەریتییەکانی دەزگا و بونیادە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگا؛ لە ئەنجامدا بۆتە هۆی ئالۆزبوونی کێشەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان؛ تەنگژەکانی وەك زۆربوونی ناڕێکخراوی دانیشتووان، کۆچکردنی دێهاتییەکان بۆ شار، پەراوێزنشینی لە شارەکان، بێکاری، خۆکوژی، هەژاری و نایەکسانی، لە دەستدانی ناسنامە، لاوازبوونی پێوەرە ئایینیەکان، کێشە کۆمەڵایەتییەکانی وەك تەڵاق، هەڵاتنی کچان لەماڵەوە و توندوتیژی دژی ئافرەتان.

---

٢٦٨. هەمان سەرچاوە؛ ص ٣٣-٣٤.

ئێستاکە دانیشتوانی هەولێر و شارەگەورەکانی کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندان و کۆچی خەڵکی بیانی بۆ هەرێمی کوردستان وەك عەرەبەکانی عێراق لەبەر ئاسایشی زیاتری کوردستان، هەروەها خەڵکی گوندنشین و شارۆچکەکان بۆ شارەگەورەکانی وەك هەولێر، ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایە و هەمووشمان دەزانین کە زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووان دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و کەمیی پێداویستییەکان. لە لایەکی ترەوە زۆر لە دانیشتووانی کوردستانیش لە ژێر هێڵی هەژاریدان و، لەبەر هێنانی کرێکار لە دەرەوەی وڵات وەکو: کرێکارانی ئێرانی، تورك، بەنگلادشی، هیندی، فیلیپینی و...، نرخی بێکاریش لە کوردستان بەرزبۆتەوە. جگە لەوانەش ڕادەی تاوانەکان و نرخی تەڵاق و خۆکوژی (ئافرەت و پیاو) وەك کێشەیەکی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی خێرا لەزیادبووندایە؛ ئەم تەنگژانە وەك بێسەروبەریەکی کۆمەڵایەتی هاوسەنگی کۆمەڵگای تێك داوە و بۆتە هۆی بێپێوەری. ئەم بێپێوەرییانە بۆتە هۆی پاڵەپەستۆ و دابەزینی بەرگری کۆمەڵایەتی کە لە کۆتاییدا مایەی ئاسانبوونی زۆر لە کیشە کۆمەڵایەتییەکانە کە خووگرتن و بەکار هێنانی ماددە هۆشبەرەکان یەکێك لەوانەیە.

لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا لە دوای ئازادبوونی عێراق و داگیرکاری لە لایەن ئەمریکا و بڵاوبوونەوەی کولتوری ئەورووپی وەك: ماددیگەرایی و تاکگەرایی و سوودگەرایی و ئازادیی جنسی و خواردنەوەی ئەلکهۆل بە شێوەیەکی بێبەند و بار ـ بە پشتگیری ڕاگەیاندنی کوردی ـ ئەوە پێشاندەدەن کە بەهاکان و بیروباوەڕە ئایینیەکان لە کۆمەڵگادا دابەزیوە و داشدەبەزێت. لاوازبوونی بەها و پێوەرە ئایینیەکان، بۆتە هۆی لاوازیی هاوبەندی کۆمەڵایەتی و یەکانگیربوونی گەلەکی و لێکترازانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خێزانی و خزمایەتی و هاوسێیەتی، بە جۆرێك زەمینەی پەلکێشبوون بەرەو ماددە هۆشبەرەکانی هێناوەتە دی.

هەروەها بەپێی تیۆری "مێرتۆن"، کە یەکێکە لە کۆمەڵناسە گەورەکانی قوتابخانەی ئەمریکی ئەرکگەرایی ـ بونیادی، بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە ئەنجامی نامۆبوون لە خودە کە خۆی لە خۆیدا بەرهەمی نەگونجانە لەگەڵ ئامانجە کولتوورییەکانی کۆمەڵگا و ئامرازە گونجاوەکان بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە. مەبەستیش لە ئامانجەکان، ئەو پەیوەندییانەیە کە بە هۆی کولتووری کۆمەڵگاوە پێناسە و دیاریکراون و بۆتە ئامانجی ڕەوا بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا یان بەشێك لە کۆمەڵگا.

بەپێی "تیۆری دوورەپەرێزبوون"ی مێرتۆن، سەرکەوتنی تاکی کوردستانی پەیوەستە بە دەستکەوتنی هەر یەك لە کارێکی باش، سەرمایەیەکی زۆر، خوێندنی گونجاو لەگەڵ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی. بەڵام بێبەشبوون لە هەر کام لەوانە دەبێتە هۆی دوورەپەرێزبوونی تاك لە کۆمەڵگا.[٢٦٩] چونکە خۆی بە بێگانە دەبینێت لەو دیدگا و باوەڕ و پێوەر و نۆرمە باوەکانی کۆمەڵگا کە ئەوانەش بەرهەمی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانە و ئێستا لە کوردستانیشدا بوونەتە تەوەرێکی هەڵسەنگاندنی مرۆڤ و ژیانی ڕۆژانە. بۆیەشە خۆی وەکو ئەوان نابینێت و بۆ دەربازبوون لەم هەلومەرجە پەنا بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و تاوانەکانی تر دەبات، یانیش وەکو هەڵاتن لەم کێشەیە و دوور کەوتن لەو واقیعە تاڵە هەوڵ دەدات کە بۆ دەرەوەی وڵات کۆچ بکات؛ چونکە ئێستا **"ڕێگاکان و ئامرازەکان"**ی ڕەوا بۆ گەیشتن بەو **"ئامانجان"**ـە لە کوردستان سنووردار بوە و پاڵەپەستۆیەکی بونیادی تیایدا دەبینرێت. لەوەها بارودۆخێکدا ــ وەك مێرتۆن دەڵێت ــ تاك پەنا دەباتە بەر دوورەپەرێز بوون و گۆشەگیری؛ کەواتە دوورەپەرێزەکان کەسانێکن کە ئومیدی ئەوەیان نییە کە

---

٢٦٩. ترنر، جاناتان اچ؛ **مفاهیم و کاربردهای جامعەشناسی**؛ ترجمە: فولادی و محمد عزیز بختیـاری؛ چ ١؛ تهـران: نشـر گرایش (١٩٩٩)؛ ص٣٥٢.

بگەنە هەم ئامانجە کولتوورییەکان و هەم ئامرازەکانی دەستخستنی ئەو ئامانجانە لەبەر سنووورداربوونی بارودۆخەکان؛ بۆیە خۆکێشانەوە و گۆشەگیرییان هەڵبژاردووە و ڕوو دەکەنە مادده هۆشبەرەکان و لادانەکانی دیکە.

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین ڕۆژبەڕۆژ زیادبوونی خووگرتن بەمادده هۆشبەرەکان لە کۆمەڵگای کوردستاندا ڕوونبکەینەوە؛ چونکە لە دوای شەڕی ناوخۆیی و شەڕی عێراق، کولتووری کۆمەڵگا گۆڕا و بەها ماددییەکان دەوڵەندتربوون و، بەسەر بەهاکانی تری کۆمەڵگادا زاڵبوون و بوون بە پێوەرێکی گشتی. ڕۆڵی دەسەڵات و ڕاگەیاندنیش لەم بوارەدا نابێ لە بیر بکەین کە یان بێدەنگ بوون، یانیش لەبەر نەزانین یان کەمتەرخەمی پشتگیریی ئەم پرۆسەیەیان کرد؛ بەڵام هاوکات بە بەهابوونی ماڵ و سەورەت و سەیارە و خانوو و کاری باش و پێگەی کۆمەڵایەتی (جێنتێلمەن بوون و کوڕی فلانە بوون و لەو بنەماڵە بوون و...!) لە کولتووری گشتی کۆمەڵگادا، بە هۆی بێسەروسامانی ئابووری لە ئەنجامی شەڕ و نادادپەروەری لە دابینکردنی کار بۆ هەموویان، داهاتی هەندێك دابەزی و هەندێك لە ئەندامانی کۆمەڵگا کە زۆر پێویستیان بە پارە هەبوو (کە ئامرازێکی ڕەوایە)، بۆ دابینکردنی ئامانجەکانی خۆیان (پێویستی بە جۆرەها کەلوپەل بە تایبەتی ئەو کەلوپەلانەی کە بە هۆی چاولێکەری لە ئەوانی تر لە چینی کەمینەی دەسەڵاتدار دروست بوو) تووشی کێشە بوون و تەنانەت ئامرازی گەیشتن بەو ئامانجانە لەبەر دەست نەبوو کە هەروەك گووتمان، ئەو ئامانجانە لە لایەن تاقمەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵگا بڵاو کراوەتەوە کە دەسەڵات و ڕاگەیاندنیان لە دەست دایە، بۆیە یان ڕوویان لە ڕێگا ناڕەواکان کرد، یانیش دوورەپەرێزبوون و ڕوویان کردە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و مەشروباتی ئەلکهۆلی.

## ج. ڕوانگەی دەروونناسانی کۆمەڵایەتی:

### ١. تیۆری کردەی دوولایەنەی هێمایی:

ڕوانگەی کردەی دوولایەنەی هێمایی ڕوانگەیەکی تری زاڵە بۆ ڕوونکردنەوەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە کوردستان. بەپێی ئەم شێوازە خووگرتن و خراپ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە ڕێگەی کردەی دوولایەنەی لە نێوان گروپە بچووکەکان (گروپی هاوتەمەنەکان) فێری دەبن. لە قۆناغی سەرەتادا بەکارهێنەر تەنیا پاڵنەر و هونەرەکانی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان فێر نابێت، بەڵکو فێر دەبێت کە چ شتێك تاقی بکاتەوە.[٢٧٠]

هەروەك ئاماژەمان کرد، "ئێدوین سازەرلەند" یەکێکە لە گرنگترین تیۆرەوانەکانی ئەم ڕوانگەیە و باوەڕی وایە تاك، ڕەفتاری بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە ڕێگەی کردەی دوولایەنەی لەگەڵ گروپی هاوڕێ و هاوتەمەنەکان فێری دەبێت. کاریگەریی ڕادەی فێربوونی تاکەکان پەیوەندی بە توندی، زۆری و بەردەوامبوونی هاودەمییەوەیە و بەکارهێنانی ئەو ماددانە کاتێك دەست پێدەکات کە هاودەمی کردنی ڕەفتارە نائاساییەکان زیاتر بێت لە هاودەمی کردنی ڕەفتارە ئاساییەکان. بەڕای ئەو تاك هەر وەك فێری ڕەفتارە ئاسایی و نۆرمەکان دەبێت، بە هەمان شێوەش شێوازەکانی ڕەفتاری خوار و خێچیش فێر دەبێت؛ ئەم فێربوونەش لە پرۆسەیەکی دوولایەنەدا دێتە دی.[٢٧١]

لەم ڕوانگەیەوە تاکەکان لە بەرامبەر بە پاداشت و پشتگیرییەکان، وردە وردە چاوەڕوانییەکانی گروپ بە خودی و دەروونی دەکەن و ئەم

---

٢٧٠. مصلحی، زیبنده؛ **بررسی مشکلات عاطفی جوانان معتاد**؛ چ١؛ تهران: دانشکده علوم اجتماعی (٢٠٠١)؛ ص ٢٦٧.

٢٧١. هەمان سەرچاوە؛ ل ٢٦٨.

دەروونیکردنەی پێناسە کۆمەڵایەتییەکان ڕێگەیان پێدەدات تاکو ڕەفتاری خۆیان لە ڕوانگەی گروپەوە هەڵسەنگێنن.[272]

"سیگۆل"یش لە توێژینەوەکانی خۆی لە ساڵی (١٩٩٧) لەسەر ١٥٠٠ قوتابی تەمەن (٧ـ١٢) ساڵانە لە ئالاسکا سێ پاڵنەر بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەست نیشان دەکات:

- پاڵنەری گونجان و تێکەڵبوون.
- پاڵنەری ئەزموونکردنی ماددەکان.
- پاڵنەری کاریگەریی گروپی هاوتەمەنەکان.[273]

بەپێی ئەم ڕوانگەیە و، بە پشت بەستن بە توێژینەوەکەم، دەتوانین بڵێین کە گرنگترین هۆکاری تووشبون بە مادده هۆشبەرەکان لە کوردستان بریتییە لە: مامەڵەکردن لەگەڵ نزیکەکان، هاوکاران و هاوتەمەنەکان و بە تایبەتی هاوڕێتی خووگرتووەکان و لادەرەکان، لاساییکردنەوەی دەوروبەرەکانی، مامەڵەکردن لەگەڵ ناوەندەکانی ناتەندروست و جۆراوجۆر لەوانە قوتابخانە و ژینگە فێرکارییە نەگونجاوەکان، کە دواتر بە تێروتەسەلی باسی لێدەکەین.

### ٢. تیۆری کۆنتڕۆڵی کۆمەڵایەتی:

دەکرێ پشت بە تیۆری کۆنتڕۆڵی کۆمەڵایەتیش ببەستین بۆ شیکردنەوەی تووشبوونی گەنجانی کوردستان بە مادده هۆشبەرەکان؛ چونکە بە بێشك ((لادانی کۆمەڵایەتی)) لە ئەنجامی ((کۆنتڕۆڵی کۆمەڵایەتی)) ڕوودەدات؛ بەو مانایە ئەگەر پرۆسەی کۆنتڕۆڵی کۆمەڵایەتی (هەم دەروونی و هەمیش دەرەکی)

---

٢٧٢. عبدی، کافیه؛ **عوامل اعتیاد در میان حاشیه‌نشینها**؛ چ١، تهران: دانشکده علوم اجتماعی (٢٠٠٥)؛ ص ٦٦.

٢٧٣. هەمان سەرچاوە؛ ص ٦٦-٦٧.

سست بوو، ئەوا زەمینەی لادانەکان فەراهەم دەبێت؛ چونکە بە ڕاستی ژیان پڕە لە وەسوەسە و هەڵخەلەتاندن و فریوخواردن! کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بریتییە لەو هێزە کە ناهێڵێ تاکەکان لە ناو کۆمەڵگادا دژ بە پێوەر و یاسا قەبوڵکراوەکان ڕەفتار بکەن. هەروەك پێشتریش باسمان کرد، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دوو لقی هەیە: کۆنترۆڵی کەسی و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی. کۆنترۆڵی کەسی هەموو هۆکارە دەروونییەکانی دەگرێتەخۆ؛ وەکو: متمانە بەخۆبوون، عیزەتی نەفس، بەرزیی ئیرادە و ویژدانێکی تەندروست. کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بریتیە لە وابەستەیی و پابەندی بە سیستەمە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا؛ وەکو: خێزان، قوتابخانە، ئایین. کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بەرهەمی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیکردنە کە ئەگەر لە لایەن خێزان یان قوتابخانەوە بە شێوازێکی ناتەندروست ئەنجام بدرێت، واتە دایك و باوك نەتوانن منداڵیان بەکۆمەڵایەتی بکەن یان بە کەم و کورتی ئەنجام بدەن، ئەو منداڵە ناتوانێ خۆی لەگەڵ پێوەر و یاساکانی کۆمەڵگا بگونجێنێت و هاودەنگ و هاوبیچم بێت؛ بۆیە تووشی هەندێ ڕەفتار دەبێت کە کۆمەڵگا لێی ڕازی نییە، وەکو خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان.

دوو شێوازی کۆنترۆڵی تاکەکان هەیە کە بریتین لە:

١) لە ڕێگای فشاری کۆمەڵایەتی؛ وەکو ترساندن، ناچارکردنی زۆرەملێ، سەپاندنی یاساکان لەسەریان، دانانی ئامرازی چاودێری وەکو کامێرا و... کە ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی لاوازە؛ چونکە لەگەڵ نەمانی ئەم ترس و زۆرداری و چاودێرییە، تاك تووشی لادان دەبێت؛ لەبەر ئەوە نەبۆتە شتێکی زاتی و دەروونی و لەناو دڵەکاندا ناچەقێتەوە!

٢) لە ڕێگای دروستکردنی بیروباوەڕ و بەدەروونی کردن؛ وەکو هێزی ئیمان و باوەڕ بە خوا و ڕۆژی قیامەت و... بەڵگەکان دەسەلمێنن کە هیچ سیستەمێك وەکو ئایین و ترس لە خوا ناتوانێ تاکەکان لە خراپەکاری لابدات و ڕوو لە چاکەکاری بکات.

**د. بەستنەوەی ڕوانگەکان:**

بەپێی ئەو ڕوانگانەی باس کرا، خێزان وەك سەرەکیترین و بچووکترین بونیاد لە کۆمەڵگادا، ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە بە کۆمەڵایەتیکردن و شێوەوەرگرتنی بونیادەکان و بناغەی کەسایەتی تاکەکان. کاریگەرییەکانی باوان لەسەر منداڵانیان تەنیا تایبەت نییە بە قۆناغی منداڵی؛ بەڵکو سەرتاپای ژیانی لەخۆ دەگرێت. لەم ڕوویەوە شڵەژان و بێسەروسامانی لە پەیوەندییەکانی خێزان، کاریگەریی قووڵ لەسەر ئەندامانی خێزان بەجێدێڵێت و پرۆسەی شێوەوەرگرتن و بەکۆمەڵایەتیبوونی تاکەکان و گواستنەوەی بەها و پێوەرەکانی خێزان، تووشی گرفت دەبێت، تا دەگاتە ئەوەی هاوبەندی و یەکدەنگی گشتی لە نێو خێزاندا لاواز دەبێت و تووشی جۆرە نامۆبوونێك دێت و لە ڕووی "کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی"یەوە پێگەیشتوو نابێت و لە ئەنجامدا تاکەکان ئامادەی جۆرەها لادان بە تایبەتی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەکات. لە لایەکی ترەوە تاکەکان لە وەها خێزانێکدا لەبەر نالەباری پەیوەندییەکانی، ڕوو لە گروپەکانی سەرەکی (مرجع) دەکەن و پرۆسەی شێوەوەرگرتن یان بە کۆمەڵایەتیبوون لە ناوەندی خێزان دەگوازرێتەوە بۆ گروپەکانی بچووك و گیانی بە گیانی و هاوتەمەنەکان. لە وەها بارودۆخێکدا ئەگەری دۆستایەتیکردنی کەسانی لادەر زیاتر دەبێت و، بە جۆریك ئەگەر مامەڵەکە بەردەوام بێت، زەمینەی لادان و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان فەراهەم دەبێت.

بۆیە ناتوانین ڕوڵی خێزان و گروپە هاوتەمەنەکان وەك ناوەندەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون لە ڕوونکردنەوەی خووگرتن و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە بەرچاو نەگرین. بەڵام پێویستە ئەم خاڵەمان لە بەرچاو بێت کە هەر چەندە لەم بوارەدا لێکۆڵینەوەی بەرفراوان، جۆراوجۆر و قووڵ لە زۆربەی شوێنەکان ئەنجام دراوە سەبارەت بە ڕۆڵی خێزان و گروپی هاوتەمەنەکان لەبارەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و ڕێگاچارەی جۆراوجۆر گیراوەتەبەر،

کەچی ڕۆژ بەڕۆژ ئەم کێشەیە ئاڵۆزتر دەبێت! بێگومان ئەگەرچی گوتاری زاڵ لەم بوارەدا لە ڕاڤەکردنی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان پێویستە، بەڵام بەس نییە و ئێمە لەپاڵ ئەم ڕوانگەیەدا پێویستیمان بە گوتار و پارادایمێکی ترە تاکو لەپاڵ ڕوانگەکانی تری دەروونناسان و کردەی دوولایەنەی کۆمەڵایەتی و ئەرکگەرای ـ بونیادی لە ڕەهەندی ورد دا، بتوانێت دەریچەیەکی تازە بە ڕووی ڕوانگەی قەبە یان ماکرۆییدا بکاتەوە. ئەو پارادایم و ڕوانگەیەش شتێك نییە بێجگە لە دەستخستنە ناوی ڕەهەندەکانی کۆمەڵایەتی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە ڕێگەی ڕاڤەکردنی نموونەکانی کۆمەڵناسی.

ڕوانگەی کۆمەڵناسی زۆربەی جار بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان وەك ئاکامێکی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکان دەبینێت کە بێهیوابوون، بێبەشبوون، بێئومێدی و هەستکردن بە نامۆبوون لە زۆربەی بەشەکانی دانیشتواندا دەهێنێتە دی.[٢٧٤] داکۆکی دەکات لە هۆکارەکانی وەك دەسەڵاتە کۆمەڵایەتییەکان، بەهاکان، سوونەت و نەریتەکان و تایبەتمەندییەکانی کولتووری کۆمەڵگا، دانیشتووان، ئابووری، شەڕ و جەنگ، پەروەردە و فێرکردن، کۆچکردن، ناسنامە و پێشینەی کولتووری و ئایینی و هەتاکو یاسایی و بڕیارەکانی سزادان ومەدەنی.[٢٧٥]

کەواتە دەکرێ هەموو ئەم ڕوانگە زاڵانە بۆ شیکردنەوەی خووگرتن و خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستاندا پێکەوە ببەستینەوە و وەکو پارادایمێکی گشتگیر بڕوانینە ئەم بابەتە کە ئەمەش هەم دەروونناسان و هەم کۆمەڵناسان و هەمیش دەروونناسانی کۆمەڵایەتی، پێکەوە گرێدەدات.

---

٢٧٤. کوتلە (kottle) زانای بەلـژیکی دەڵێت: کۆمەڵگا بەرپرسی هەموو تاوانەکانە؛ چونکە خۆی هۆکاری سەرهەڵدانیانە. بڕوانە: ستودە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٣٦.

٢٧٥. پورقاضی، جواد محمد؛ **بررسی روند مبارزه با سوء استعمال و قاچاق مواد مخدر با تکیه بر موانع اجتماعی و فرهنگی**؛ چ١؛ تهران: دانشکده علوم اجتماعی (١٩٩١)؛ ص١٠١.

ئەم وێنەیە بەستانەوەی ڕوانگە زاڵەکانی شیکردنەوەی خووگرتن لە کوردستاندا



## دەستپێك:

خووگرتن و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان وەك کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، ئەو دیاردەیەیە کە بوونە کۆمەڵگا بێهێز دەکات لە ڕووی ڕێکخستن و پاراستنی سیستمەکان، ئەرکی پێوەری کۆمەڵایەتی دەشێوێنێت و دەبێتە هۆی گۆڕانی سیستەمی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووریی کۆمەڵگا.

هەتا ئێستا کۆمەڵناسان، دەروونناسان، تاوانناسان، پزشکانی دەروونی و بە گشتی توێژەران و پسپۆڕان، بە دیدگای جۆراوجۆرەوە، هۆکارەکانی خووگرتن و خراپ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکانیان دەستنیشان کردووە هەر کامیان گرنگی بە لایەنێك داوە. لەم ڕووەوە کە لێکۆڵینەوەکان لە شوێنی جیاواز ئەنجامدراون، هۆکارەکانیش لە بواری خووگرتن جارجار دەگۆڕێت و هەندێك جاریش هاوبەشن. لەم بەشە دا هاوکات لەگەڵ ئامارە جیاجیاکانی دیکەی جیهان سەبارەت بە هۆکارەکانی تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان، ئاماژە بە ئامارەکانی لێکۆڵینەوەکەم دەکەم کە لەسەر خووگرتووەکانی بەندکراو لە شاری هەولێر ئەنجامم داوە.

بە گشتی بە پێی بنەمای ڕوانگە تیۆرییەکان ـ کە لە بەشی پێشوودا باسکران ـ دەتوانین هۆکاری تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکانیش بکەینە سێ بەش: هۆکاری ورد (مایکرۆیی)، ناوەندی و قەبە (ماکرۆیی).

## **یەکەم: هۆکارەکانی خووگرتن لە ئاستی ورد دا:**

مەبەست لە ئاستی ورد هەمان ڕوانگەی دەروونناسانە. بەم پێیە، هەموو هۆکارەکانی پەیوەست بە تاك، کەسایەتی و ناڕەحەتییە دەروونی و جەستەییەکان دەخرێنە بەر باس و لێکۆڵینەوە؛ وەکو: گرفتەکانی جەستەیی و پەنابردنە بەر ماددەکان بۆ چارەسەری یان ئارامکردنەوەی ئێش و ئازار، نەخۆشی و گرفتی دەروونی و ڕەفتاری، شڵەژان، لە دەستدانی ئیمان، بەهێزکردن و ورژاندنی سێکسی.

### ***١. هۆکارە کەسێتی و دەروونییەکان:***

دەماغی ماندوو و دەروونی پەژارە و ناهاوسەنگیی، ڕووکردنە ماددە هۆشبەرەکان بە باشترین پەناگا و ماددەی شادیهێنەری خۆیان دەزانێت. ئەو خەڵکانەی خاوەن هەستێکی زوو کارتێکراون زۆر زوو لە کێشەکانی کۆمەڵگا، دەڕەنجێن و ناڕەحەت دەبن و هێزی خۆڕاگرتن لە بەرامبەر ڕووداوە ناخۆشەکاندا لەدەست دەدەن. وەها خەڵکانێك بۆ زاڵبوون بە سەر ڕووداوی نەخوازراو و هەڵچوون و دەستکەوتنی ئارامی دەروونی خۆیان پێویستیان بە دەرمانێکی ئارامبەخشە کە هەستەکانیان سڕ بکات و بۆ چەند ساتێکیش لە بێهۆشیدا بن و ئەم کاریگەرییەش لە ماددەی هۆشبەردا دەبینن؛ بەڵام نازانن کە دەرمانەکە لە دەردەکە خراپترە.[٢٧٦]

---

٢٧٦. دامنی، محمد ابراهیم؛ **استعمال و معامله مواد مخدر**؛ چ١؛ تهران: شرکت نشر فرهنگ قرآنی (٢٠٠٠)؛ ص ٢٩.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە لایەن دەروونناسانەوە لە بارەی خووگرتنەوە ئەنجام دراون، ئەوە نیشاندەدەن کە خووگرتوان لە ئاستەکانی شڵەژان، هەستکردن بە تەنیایی، تووشبوون بە خەمۆکی، هەژاری لە پەیوەندییە سۆزدارییەکان و هەستکردن بە نالێهاتوویی، ڕێژەیەکی بەرزیان هەیە. لە لێکۆلێنەوەیەکی تردا کە نمونەکەی لە (١٠٠) کەسی خووگرتوو پێکهاتبوو لە نەخۆشخانەی ڤەنەکی تاران (ونك) وەرگیرا بوو، نیشانەی بوونی پێشینەی جۆرە نەخۆشییەکی کەسایەتی و دەروونی لە ناویاندا دەبینرا. بەپێی ئەم توێژینەوەیە زۆربەیان گۆشەگیر، دڵەڕاوکێ و شڵەژانی دەروونیان هەبوو و زۆر تێکەڵاوی خەڵکی نەدەبوون. لە ڕووی سۆزدارییەوە نابالغ، سەرپێچیکار، شەڕانگێز و نائارام بوون و، خاوەن پێگەیشتنێکی کۆمەڵایەتی نەبوون.[٢٧٧] لە لێکۆلێنەوەیەکی تردا کە لەسەر (١١٦٧) خوگرتوو ئەنجام درابوو، دەرکەوت کە زۆربەیان ماددە هۆشبەرەکان بە هۆکاری لەناوبردنی گرفتە دەروونییەکانی خۆیان دەزانن. نەبوونی ئامانج و ئایدیالی ژیان، نائومێدی و خەم، بێباوەربوون بە خود و لاوازی ئیمان و ئیرادە، شکست هێنان لە گەیشتن بە ئاواتەکان، زووڕەنجان، کەسایەتی تەلقین وەرگر، پشتنەبەستن بە دەوروبەر و ئایندە، گرێکوێرەی بێڕێزی و خۆکەمبینی، گەشەی ناتەندروستی کەسایەتی، زیتەڵی و زانینخوازی و خۆتێهەڵقورتاندن، سەرلێشێواوی لە ژیان و لە کۆمەڵگا لە فاکتەرەکانی تری کەسێتی و دەروونین کە پاڵ بە تاکەکانەوە دەنێن بۆ خووگرتن و ڕووکردن بە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان.[٢٧٨]

---

٢٧٧. صفایی راد، ایرج؛ **اعتیاد و مواد مخدر**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ سال ٢؛ شماره ١٧؛ ص ١٣.

٢٧٨. یزد خواستی، علی؛ **علل و عوامل اعتیاد به مواد مخدر از دیدگاه محققان و متخصصان ایرانی**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠١)؛ سال ٣؛ شماره ٣١؛ ص ٢٣-٢٦.

له توێژینەوەکەشمدا بۆمان دەرکەوت کە ڕێژەی (٢١.٨٨٪) تاکەکانی نموونە، "چێژوەرگرتن" بە هۆکاری دەستپێکردن دەزانن. ڕێژەی (١٢.٥٪) لەبەر "هۆکاری جنسی" دەزانن بەم تێڕوانینەی کە ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی چالاکی هێزی جنسی، کەچی بە پێچەوانەوە دوای ماوەیەکی کەم دەبێتە هۆی لاوازی هێزی جنسی یان نەمانی شەهوەت و زیادبوونی کێشەی هاوسەری بە تایبەتی ئەوانەی ماددەی هیرویین بەکار دەهێنن. ڕێژەی (٩.٣٨٪) هۆکاری "تێرکردنی هەستی مەعریفی و زانینخوازی "، ڕێژەی (٨.٣٤٪)یش هۆکاری "سەرگەردانی و هەست بە پوچی "، ڕێژەی (٦.٢٦٪)یش هۆکاری "سەرنەکەوتن لە خۆشەویستی" و هەمان "هەڵاتن لی کێشەکانی ژیان" دەزانن.

کەواتە دەتوانین هەموو ئەم فاکتەرانە بە شێوەی خوارەوە دەستەبەندی بکەین:

١. ئەو تاکانەی کە بەدەست هەندێ نەخۆشی دەروونی وەکو ((نوروتیك))* و ((سایکۆپاتیك))** و ((هایپۆکوندریا))*** و ((خەموکی)) و

---

* نوروتیك: جۆرە نەخۆشییەکی دەماری دەرونیە کە بریتیە لە حاڵەتێك کە بە هۆی ململانێ لە نێوان دەروون و دەرەوەی تاك دروست دەبێت؛ واتە کاتێك کە تاك نەتوانێت لە نێوان دوو هێزی جیاواز یەکێکی هەڵبژێرێت و تووشی بێبڕیاری و ململانێ و پەرێشانی و سەرگەردانی دەبێت کە دەبێتە هۆی ڕەنج و ناڕەحەتی لەگەڵ ترس و دڵەڕاوکێ و هەست بە نائاسوودەیی بە بێ ئەوەی هۆیەکەی بزانێت. بڕوانە بە: دکتر مهدی کی نیا؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٩٢-١٠٩٥ ـ هەروەها: شعاری نژاد، علی اکبر؛ **فرهنگ علوم رفتاری**؛ چ ٢؛ تهران: انتشارات امیر کبیر (١٩٩٦)؛ ص٢٥٦.

** سایکۆپاتیك: جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییە کە تاك ناتوانێت لە بەها ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگا تێبگات و لە ئەنجام دا لە دەستور و داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان سەرپێچی دەکات و هیچ ڕەچاوی ئامانج و پێوەرەکۆمەڵایەتییەکانی باو لە ناو کۆمەڵگا دا ناکات؛ چونکە "منی باڵا"یان گەشە نەکردووە و تاریکی سەرتاپای ویژدانیان گرتووە و بە بێهەست بە گوناە و شەرم یان ترس و دڵەڕاوکێ دەست بە کاری ناڕەوا و دژبە ئەخلاق دەدەن و هیچ مافێك بۆ هیچ جەسێك دانانێن جگە لە خۆیان و ناتوانن پەیوەندی سۆزدار و

**((سایکۆسۆماتیك))**** و ((شیزوفیرنیا))***** دەناڵێنن، لە پێناو نەهێشتنی فشار و دڵەراوکێ و کێشەی دەروونی زیاتر لە مەترسی تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان دان[٢٧٩].**

**٢. ئەوانەی کە کێشەی ((کەسایەتی))یان هەیە، بە تایبەتی ((ئیرادەی لاوان))[٢٨٠] و ((شپرزە و کێشەی زەینی))، ((باوەڕ بەخۆنەبوون))، ((نەگونجان و هەڵاتن لە واقع و کێشەکانی ژیان))، ((دەمارگیری و نائارامی)) و...هتد[٢٨١]. زۆربەی ئەوانە توانایی ڕووبەڕووبوون لەگەڵ کێشەکان و ناکامییەکان و**

---

خێزانێك دروست بکەن. بۆیە پەنا دەبەنە بەر مادده هۆشبەرەکان تاکو هەست بە ئاسایش و ئارامی دەروونی بکەن. بڕوانە: بە کی نیا؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٩٢؛ هەروەها: شعاری نژاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٢٤.

*** هایپۆکوندریا: جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییە کە تاك خۆی بە نەخۆش دەزانێ، کەچی تەندروستە؛ واتە تووشی خەیاڵ دەبێت و ترسێکی لە ڕادەبەدەر لە لای دروست دەبێت سەبارەت بە تەندروستی خۆی لە حاڵێکدا هیچ بەڵگەیەکی جەستەیی و پزیشکی نییە بۆ ئەم ترسە. بڕوانە بە: شعاری نژاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٨٧.

**** سایکۆسۆماتیك: بریتییە لە نەخۆشییە دەروونییە جەستەییەکان؛ واتە هۆکاری دەروونی ببێتە هۆی نەخۆشی جەستەیی و بە پێچەوانەوەش هۆکاری جەستەیی ببێتە هۆی نەخۆشی دەروونی. بڕوانە بە: شعاری نژاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٢٥.

***** شیزوفیرنیا: نەخۆشییەکی دەروونییە کە زۆر جار "جنون الشباب"ی پێدەگوترێ و دەبێتە ئەگەر خۆکوژی لای گەنجان. ئەوانە کە تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن، هیچ گرنگی بۆ ڕەوالەتی خۆیان نادەن و نیسبەت بە تاکەکانی دیکە زۆر بێسۆز و عاتیفەن. لەگەڵ کۆمەڵگا بەدبینن و کۆمەڵگای بە دوژمنی خۆیان دەزانن، هەمیشە گۆشەگیر و پەریشانن و لە پێناو نەهێشتنی ئازارە دەروونییەکانیان پەنا دەبەنەر بەر مادده هۆشبەرەکان. بڕوانە: دانش؛ معتاد کیست؟ مواد مخدر چیست؟؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١٧.

٢٧٩. د.سید أحمد أحمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٩٦-١٩٨.

٢٨٠. برژه، ژان؛ **اعتیاد و شخصیت**؛ ترجمە: توفان گرکانی؛ چ١؛ تهران: سازمان و انتشارات و آموزش انقلاب اسلامی (٢٠٠٠)؛ ص ٣٧.

٢٨١. تقی زاده، داریوش؛ **اعتیاد، علل، پیشگیری و درمان**؛ تهران: مجلەی اجتماع درمان مدار (٢٠٠٥)؛ سال ٢؛ شماره ٣؛ ص٨-٩.

شکستەکانی خۆیان نییە و ماددەی هۆشبەر وەکو ئامرازی ڕزگاربوون لە قەڵەم دەدەن لە پێناو نەهێشتنی ناڕەحەتی و فشارە دەروونییەکانیان. ئەوانە ئیرادەیان زۆر لاوازە و ملکەچی هەوا و هەوسن و متمانەیان بە خۆیان نییە و ئارامی و ئاسایشی خۆیان لە ماددە هۆشبەرەکاندا دەبینن.[282]

٣. هەندێ کەس لە هەستکردن بە گوناه، لە خۆیان بێزار دەبن و پەنا بۆ ماددە هۆشبەرەکان دەبەن؛[283] وەکو ئەوانەی کە تووشی خولێکدانی سەیارە دەبن و دەبێتە هۆی مردنی کەسێك و هەست بە گوناه دەکەن، یان ئەو نەخۆشە دەروونییانە کە تووشی خەیاڵی گوناهی گەورە دەبن و بۆ هەڵاتن لە ئەشکەنجەی دەروونی و لە بیرکردنی گوناهی خەیاڵیی خۆیان، ڕوو دەکەنە ماددە هۆشبەرەکان.[284]

٤. تێڕوانین و ئاراستەی پۆزەتیڤانە بەرامبەر بە ماددە هۆشبەرەکان؛ هەندێ کەس بۆ تێرکردنی ئارەزوو دەرونییەکانی وەکو: ((ئارەزووی سێکسی)) و ((چێژوەرگرتن و لەزەت و خۆشی)) و ((سەربەخۆیی و ئازادی)) و...، هەندێ کەسیش بۆ تێرکردنی هەستی زێتەلی و زانینخوازی (الفضولیة/Curiosity) و هەڵسەنگاندنی هێزی جەستەیی خۆی، خووگر دەبن و وادەزانن کە بە یەکجار بەکارهێنان خووگرتوو نابن؛[285] وەکو ئەوانەی کە وادەزانن بە هۆی ماددە هۆشبەرەکانەوە ناخەون و دەتوانن دەرس بخوێنن و هۆش و زاکیرەیان بەهێز دەکات، یان دەڵێن: ئەو ماددانە بەهێزکەر و چالاککەرن و دەتوانن بە هۆیەوە لە چالاکی وەرزشی یان کاری سەخت سەرکەوتوو بن، یان دەڵێن: ئەو ماددانە

---

٢٨٢. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١٨.

٢٨٣. یزدانی، د.غلامرضا؛ **اعتیاد چیست؟**؛ لە سایتی ئینتەرنێتی:
http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

٢٨٤. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١٧-١١٨.

٢٨٥. دانش؛ **مجرم کیست؟ جرم شناسی چیست؟**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٢٧٧.

دەبنە هۆی شکاندنی ئێش و ئازاری جەستەیی و... بەم شێوەیەوە فریوی پروپاگەندەی ناڕاستەقینەی ئەم ماددانە دەبن و تووشی خووگرتن دەبن.[٢٨٦]

٥. هەرەسهێنان بە هۆی سەرنەکەوتن لە قۆناغەکانی ژیان وەکو: ((هاوسەرگیری بە تایبەتی هاوسەرگیریی زۆرەملێ، بە دەستهێنانی پارە، خوێندن، خۆشەویستی و...هتد)).[٢٨٧]

٦. تەنیایی و گوشەگیری وەکو: ((سەڵتبوون))، ((دووری لە خێزان))، ((لە دەستدانی کەس و کاری نزیك))، ((لەکاتێ خزمەتی سەربازی))، ((زیندان)) و...[٢٨٨]

٧. فاکتەری لاوازیی باوەڕ و ئیمان: ((لاوازی پەیوەندیی نێوان تاك و خوا و نەبوونی باوەڕ و پێوەری ئایینی و مەزهەبی)).[٢٨٩]

٨. نەبوونی هەستی بەرپرسیاریەتی و گرنگیدان بە بەها و پێوەرەکانی خۆی و ڕەچاو نەکردنی بەها و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان.[٢٩٠]

٩. ئازادیخوازی و هەڵاتن لە کێشەکانی ژیان؛ هەندێ گەنجان بۆ نیشاندانی ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان و کەمکردنی چەپاندن یان کەبتی دەروونی، خووگر دەبن. هەندێتر خووگرتوو بوون بە ماددە هۆشبەرەکان وەکو شەڕ و ململانێیەك بەرامبەر هێزە کۆمەڵایەتییەکان، خێزان، بەها و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان

---

٢٨٦. حبیب احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٦.

٢٨٧. نیك بخش، راحله؛ **عوامل انحراف جوانان و ازدواج**؛ چ١؛ قم: انتشارات فخردین (٢٠٠٣)؛ ص ٥١-٥٧.

٢٨٨. مولوی، فاطمه؛ **نگاهی به آسیب شناسی اعتیاد**؛ لە سایتی ئینتەرنێتی:
http:// www.dchq.ir

٢٨٩. گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٤٤.

٢٩٠. نارنجی ها، د. هومن؛ **علل گرایش به سوء مصرف مواد مخدر**؛ لە سایتی ئینتەرنێتی:
http:// www.dchq.ir

دەزانن و وا هەست دەکەن کە بە خووگرتنی خۆیان، سەرکەشی و دژایەتی خۆیان بەرامبەر بە کۆمەڵگا و خێزان پیشان دەدەن.

### ٢. هۆکارە جەستەیی و بایۆلۆژییەکان:

بێجگە لە هۆکارە کەسییەتی و دەروونییەکان، هۆکارە جەستەیی و بایۆلۆژییەکانیش لە ئاستی مایکرۆییدا دێنە پێشەوە. لێرەدا باس لە فاکتەرەکانی بۆماوەیی (الوراثة) و جینەکان و نەژاد (عرق) و ڕەگەز و تەمەن و حاڵەتی جەستەیی دەکەین:

#### أ. هۆکاری بۆماوەیی و جینییەکان:

خووپێوەگرتنی دایك و باوك، کاریگەریی ڕاستەوخۆ هەیە لەسەر منداڵەکان. ئەو ژەهرەی کە لە ئەنجامی مەوادی هۆشبەر لە جەستەی دایك و باوك دروست بووە، دەگوازرێتەوە بۆ کۆرپەلە و دەبێتە هۆی خووگرتنی کۆرپەلە بەو ماددەیەی کە دایکەکەی پێی خووگرتوو بووە.[٢٩١] هەندێ لە زانایان وەکو "گرا" پێی وایە کە هەندێ کەس لە ناو مێشکیان دا ماددەیەکی کیمیاوی بە ناوی "ئاندرۆفین" و "سرۆتۆنین" و "دۆپامین" نییە، کە ئەم جۆرە کەسانە زیاتر پەنا دەبەنە بەر ماددە هۆشبەرەکان کە وەکو جێگرەوە دەژمێردرێت بۆ ئەم ماددانە.[٢٩٢]

---

٢٩١. ساعی، بهروز؛ **بررسی علل گرایش معتادان به مواد مخدر**؛ چ١؛ تهران: دانشکدەی علوم اجتماعی و تعاون (١٩٩١)؛ ل ١١٢.

٢٩٢. آزمون، علی؛ **سبب شناسی اعتیاد**؛ تهران: مجلەی اجتماع درمان مدار (٢٠٠٥)؛ سال ٢؛ شمارەی٣؛ ل٤ و ٥.

**ب. هۆکاری نەژادی:**

مەیل بۆ خووپێوەگرتن لە نەژادە جۆراوجۆرەکان جیاوازە؛ بۆ نموونە زەرد پێستەکان و سپی پێستەکان زیاتر لە ڕەش پێستەکان تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن.[293]

**ج. هۆکاری ڕەگەزی:**

بەپێی ئامارەکان و لێکۆڵینەوەکان، ژنان کەمتر لە پیاوان تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن. بەڵام ئاسەواری نێگەتیڤی خووپێوەگرتنی ژنان بەهێزترە لە خووپێوەگرتنی پیاوان.[294] لە لێکۆڵینەوەی ئێمەدا دەرکەوت کە هەموویان واتە (١٠٠٪)ی خووگرتووەکان نێر بوون.

**د. هۆکاری تەمەن:**

لە هەر ئاستێکی تەمەنی دا، ئەگەری خووپێوەگرتن زۆرە. لەو خێزانانەی کە دایك یان باوك، یاخود هەردووکیان خووگر بن، ئەوا منداڵی کەم تەمەنیشیان تووشی هەمان ماددە دەبێت و دواتر لەگەڵ گەورە بوونیان، جۆری ماددەکە دەگۆڕن. بەپێی ئاماری ڕێخراوی تەندروستی جیهانی (٧٢٪)ی خووگرەکان لەسەرتاسەری دونیا دا لە ژێر تەمەنی (٢٥)ساڵ دان! خووگرەکان ـ بەشی زۆریان ـ بە جگەرە کێشان دەست پێدەکەن و دواتر وردە و وردە بەرەو ماددە هۆشبەرەکان دەچن.[295] هەروەك لە لێکۆڵینەوەی ئێمەشدا دەرکەوت کە ڕێژەی

---

٢٩٣. دانش؛ سەرچاوە پێشوو؛ ل٢٧٦.

٢٩٤. صفری، فاطمە؛ **اعتیاد و زنان، تفاوتهای جنسیتی در زمینەی سوء مصرف مواد و درمان آن**؛ تهران: دبیرخانە ستاد مبارزە با مواد مخدر (٢٠٠٢)؛، ص١-٢.

٢٩٥. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٧٦.

(٪١٠٠)یان گەنج بوون کە کەم تەمەنترینیان (٢٣)ساڵ و گەورەترینیشیان (٣٤) ساڵ بوو و ڕێژەی (٪١٠٠)یشیان سەرەتا بە جگەرەکێشان دەستیان پێکردووە کە تەمەنیان لە کاتێ دەست پێکردن لەسەرووی (١٨) ساڵییەوە بوە؛ جگەرە وەك ماددەیەکی هۆشبەری ڕێگەپێدراو لە کۆمەڵی "نیکۆتین" دادەنرێت، کە وەکو دەروازیەك دەژمێردرێت بۆ مادده هۆشبەرەکانی دیکە؛ هەروەك "تیۆری ڕەفتاری کێشە ئامێز" و "تیۆری دەروازە" باس لەوە دەکەن کە بەشی زۆر لە گەنجان بە جگەرەکێشان دەست پێدەکەن و دواتر وردە وردە بەرەو مادده هۆشبەرەکانی دیکە دەچن؛[٢٩٦] کەواتە بە پێی ئەم زانیارییە مەیدانییانە ئەو کەسانەی کە زۆرتر دوچاری بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەبنەوە، ئەوانەن کە لە تەمەنی گەنجیدان. لە کاتێ چاوپێکەوتنمان، پرسیارێکمان ئاراستەی خووگرتووەکان کرد کە: (پێتان وایە چ کەسانێك زیاتر تووشی ئەم ماددانە دەبن؟)، وەڵامی هەر هەموویان (واتە ٪١٠٠) بریتی بوو لە: "گەنجان".

لە کاتێ بەراوردکردنی ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەمان لەگەڵ ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەیەکی سعودی کە لە ساڵی (١٩٩٦) ئەنجام دراوە، تەبایە کە ڕێژەی زۆرترینیان دەکەونە نێوان تەمەنی (٢٧– ٣٣) ساڵی، بە ڕێژەی (٪٦١.٤)[٢٩٧] هەروەها ناوەندی ژمارەیی تەمەنی تاکەکان (٢٨.٩) ساڵە.

---

٢٩٦. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٧٦.

٢٩٧. الخزرج، يحيى تركي و سعيد، أسماعيل عبدالحميد؛ **الآثار الاجتماعية لتعاطي الهيروين – دراسة ميدانية**؛ بيروت: مجلة الفكر العربي، معهد الانماء العربي (١٩٩٧)؛ العدد٣٧؛ السنة ١٢؛ ص٧٥.

**ه. باری جەستەیی:**

بەکارهێنانی دەرمانە ئازاربەر و خەوهێنەرەکان بۆ هەندێ لە نەخۆشی و ئێش و ئازاری جەستەیی و ماندووبوون، ئەو تاکانەی زیاتر بەرەو خووپێوەگرتن دەبات؛ بە تایبەتی ئەوانەی پیشەی گرانیان هەیە و زۆر ماندوو دەبن و خەویان کەمە. یاخود زێدەڕۆییکردن لە پەیوەندی سێکسی دەبێتە هۆی کەمبوونی هێز و لاوازبوونی توانای دەروونی تاکەکان، کە هەموو ئەوانە زیاتر لە مەترسی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان دان.[298] مادە هۆشبەرەکان بەتایبەتی پێکهاتەکانی تریاك لەوانەیە بۆ هێورکردنەوەی هەندێ ئازار وەکو: ئازاری گەدە، قاچ، ڕۆماتیزم* و... لە لایەن پزیشکەوە بدرێت، ئەو هێورکردنەوە کاتییە و کەسەکە بۆ دووبارە بەکارهێنان و لە ئەنجامیشدا بۆ خووگرتن رادەکێشێت؛ بۆ نموونە لە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان وەك تریاك و هاوشێوەکانی چاومان بە چەندین باوەڕی وەك: تریاك لە تەمەنی ٥٠ساڵی بۆ سەرەوە نە تەنیا زیانی نییە، بەڵکو پێویستیشە، تریاك بۆ هێنانە خوارەوەی پاڵەپەستۆی خوێن پێویستە، یان تریاك باشترین دەرمانە بۆ منداڵان. توێژینەوەکەی دکتۆر "رضا مظلومان" کە لەسەر (٢١٠٥) خووگرتوو ئەنجامی دابوو، دەرکەوت کە (٣١٢) تاکیان بە هۆی نەخۆشیی جەستەییەوە ڕوویان لە ماددە هۆشبەرەکان کردووە.[299]

٢٩٨. سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٧٧.

* ڕۆماتیسم: نەخۆشییەکی جەستەییە کە تووشی خوێن و جومگەکانی لەش دەبێت.

٢٩٩. صفایی راد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٣.

## دووەم: هۆکارەکانی خووگرتن لە ئاستی ناوەندی دا:

ئاستی ناوەندی، ئەو ئاستەیە کە پەیوەندی دروست دەکات لە نێوان ئاستی ورد (کە پەیوەستە بە تاکەوە) و ئاستی قەبە (کە پەیوەستە بە بونیادی کۆمەڵگاوە). لە ئاستی ناوەندیدا پشت بەو هۆکارانە دەبەسترێت کە لە بە کۆمەڵایەتیبوونی تاك، نە لە ئاستی ورد و نە لە ئاستی قەبەدان؛ وەك خێزان، گروپە هاوتەمەنەکان، قوتابخانە و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندییە جەماوەرییەکان.

### ١. *فاکتەری خێزانی:*

لە ئاستی ناوەندیدا سەرەکیترین هۆکارە؛ بە شێوەیەك کە ـ هەروەك لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد ـ تیۆری خێزانی یەکێك لە گرنگترین تیۆرەکانی شیکردنەوەی هۆکارەی خووگرتنە؛ چونکە پەیوەندییەکان و نموونەکانی ڕەفتاری خێزان ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕن لە پاڵنانی تاکەکان بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان. توێژینەوە بەرفراوانەکان لە وڵاتانی جیاجیا ئەوە پێشاندەدەن کە زۆربەی تاکە خووگرتووەکان سەر بە خێزانی لەیەکترازاو و نائارامن.[300] "برەنساید" و هاوکارەکانی لەم بارەیەوە دەڵێن: لەیەکترازانی خێزانی توانای نەوجەوان و لاوان بۆ گونجان لەگەڵ پاڵەپەستۆکانی دەروونی کەم دەکاتەوە، ئەمەش لاوان ئامادە دەکات بۆ پەنابردنە بەر بەکارهێنانی

---

٣٠٠. شیخاوندی، د. داور؛ **جامعەشناسی انحرافات و مسائل جامعتی ایران**؛ چ ١؛ تهران: نشر قطره (٢٠٠٥)؛ ص ٤٧١.

مادده هۆشبەرەکان.[٣٠١] دکتۆر "مظلومان" له ئەنجامی چاوپێکەوتن لەگەڵ (٢١٠٥) خووگرتوو، گەیشته ئەوه (22٪) له تاکەکانی نموونه به هۆی هۆکاری خێزانییەوه (شەڕ و ململانێ له ناو خێزان و کاریگەریی دایك و باوك لەسەر منداڵان) ڕوویان له مادده هۆشبەرەکان کردووه. هەروەها لەم نموونەیەدا (٩٠) کەسیان هاوسەرانی خۆیان به هۆکار دەزانن بۆ تووشبوون به مادده هۆشبەرەکان. له توێژینەوەیەکی تردا ئەنجامەکان ئەوه دەردەخەن که له کۆی (٣٥١) خووگرتوو (35٪) به هۆی پرسه خێزانییەکان تووشی خووگرتن به مادده هۆشبەرەکان بوون.[٣٠٢]

لێکۆڵینەوەی ئێمەش نیشان دەدات که: ڕێژەی (٦٠٪)ی نموونەی لێکۆڵینەوه "خێزاندار" و ڕێژەی (٤٠٪) "سەڵت" بوون. له کاتێ چاوپێکەوتنمان بۆمان دەرکەوت که زۆربەی سەڵتەکان جەخت لەسەر ئەوه دەکەن که بیر له ژنهێنان ناکەن لەبەر نەبوونی پارەی تەواو بۆ ئەم مەبەسته، بەڵام هەندێکیان دەڵێن له کاتێ داخوازی ژنهێنان، پاش ئەوەی که بۆیان دەرکەوت که توشبووی مادده هۆشبەرەکانه، داواکاریان ڕەتکردووتەوه. هەروەها ڕێژەی (٩.٣٨٪) هۆکاری "نەبوونی چاودێری خێزان لەسەریان" دەزانن و ڕێژەی (٦.٢٥٪) هۆکاری "کێشەی خێزانی و ناسەقامگیری نێوانیان" دەزانن. کاتێك که ئەو پرسیارەمان ئاراستەی خووگرتووەکانمان کرد: (هۆکاری تووشبوونی گەنجەکان به مادده هۆشبەرەکان چییه؟)، ڕێژەی (١٣.٩٪) گووتیان که "نەبوونی چاودێری له لایەن دایك و باوك" یەکێك له فاکتەرەکانی تووشبونی گەنجانی کوردستانه. به ڕاستی خێزان یەکەم دەزگا و سیستەمه که تاك تیایدا فێری

---

٣٠١. کدیور، محمدرحیم؛ **بررسی میزان شیوع موارد مثبت آزمایش تشخیص اعتیاد در شهرستانهای استان فارس**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠١)؛ سال ٣؛ شماره ٢١؛ ص١٩.

٣٠٢. صفایی راد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٣.

ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت. تاك لە دایك و باوك و خوشك و برای خۆی لاسایی دەکاتەوە. ئەگەر ڕەفتاری دایك و باوك باش و پەسەند بێت، ئەوا ڕێژەی باشبوونی ڕەفتاری منداڵیش بەرز دەبێت؛ چونکە ڕەفتاری خێزان بۆ منداڵان وەکو ڕەفتارێکی ژێدەر (مرجعی) دەژمێردرێت. هەروەك لە لێکۆڵینەوەکەمان دەرکەوت کە ڕێژەی (٨٠٪)ی نموونە لێکۆڵینەوە دانیان بەوە دانا کە لە ناو خێزانیاندا کەسێك هەبوە کە جگەر دەکێشێ و ڕێژەی (٢٠)٪ وەڵامیان بە نەخێر بووە، بەڵام هەمان کەسان گوتیان کە برادەری جگەرەکێشیان هەبوە! هەروەها ڕێژەی (٩٠٪)یان ئاماژە بەوە کرد کە خێزانیان هیچ پابەندییەکیان بە ئایینەوە نییە!

بە شێوەیەکی گشتی، بە ڕەچاوکردنی ئەنجامەکانی زۆر لە لێکۆڵینەوەکان، هۆکارەکانی خوارەوە لە ڕەهەندی خێزانی وەکو زەمینەسازی خووگرتنی گەنجەکان بە مادده هۆشبەرەکان بزانین:

١. خێزانی بایۆلۆژی یان ژیانی: بریتییە لەو خێزانانەی کە مەشروعییەتی کۆمەڵایەتییان هەیە، بەڵام ناتوانن سەرپەرشتی منداڵانیان لە ئەستۆ بگرن؛[٣٠٣] واتە تەنیا پەیوەندی بایۆلۆژی و ژیانی لەگەڵ منداڵیان هەیە و منداڵیان لە خوێنیان پێکهاتووە، بەڵام لە پێناو بەکۆمەڵایەتیکردنی ئەوان کەمتەر خەمن و بەرپرسیار نین یاخود تواناییان نییە؛ وەکو ئەو خێزانانەی کە منداڵیان خەریکی سواڵکەری یان بەرەڵایی لە ناو گەڕەك و کۆڵانەکان دەبن.[٣٠٤] ئەم جۆرە خێزانانە هۆکاری ڕێخۆشکەرن بۆ پەلکێشبوونی منداڵانیان بۆ مادده هۆشبەرەکان.

٣٠٣. بهنام، جمشيد؛ **تحولات خانواده**؛ ترجمه: محمد جعفر پوينـده؛ چ٢؛ تهـران: نشـر مـاهی (٢٠٠٥)؛ ص ١٣٨.

٣٠٤. ساروخانی، باقر؛ **جامعەشناسی خانواده**؛ چ١؛ تهران: انتشارات سروش (١٩٩٧)؛ ص١٣٦-١٣٧.

توێژینەوەکان نیشان دەدەن کە (٧٦٪) خووگرتووان لەم جۆرە خێزانانە پەروەردە بوونە.[٣٠٥]

٢. لاوازی و خراپی پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانی خێزان بە تایبەتی نێوان باوك و دایك، یان ژن و پیاو و، پێکهەڵپڕژانە بەردەوامەکان و هەستی ڕکابەرایەتی نێوانیان.[٣٠٦] لە چەند توێژینەوەیەکدا زیاتر لە (80٪) تووشبوان بە مادده هۆشبەرەکان شپرزەیی و نائارامیی ژینگەی خێزان و شەڕی نێوان باوك و دایك بە هۆکاری تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان دەزانن.[٣٠٧] ئەم ڕێژەیە لە توێژینەوەیەك لە "سعودیە" دەگاتە (٦٨٪).[٣٠٨] نەگونجانی بەردەوام لە خێزاندا و لە دەستدانی باوك یان دایك یان هەردووکیان لە کاتی منداڵیدا، دەتوانێت زۆر بە توندی کاریگەریی هەبێت لەسەر تاك و بیکاتە یەکێك لە بەکارهێنەرانی مادده هۆشبەرەکان. ئەگەر چی لەسەرەتادا لە جگەرەکێشانەوە دەستی پێبکات؛ هەروەك لە توێژینەوەکانی ئێران دەرکەوتووە، (٢٣) لێکۆڵینەوە داکۆکیان لە کاریگەریی ئەم بابەتە کردووە.[٣٠٩] دەروونپزیشکێکی فەڕەنسی بە ناوی "پرۆفیسۆر هویر" لە توێژینەوەکەیدا بەناوی "توێژینەوە لەسەر لادانەکانی هەرزەکاران لە (٤٠٠) فایلی منداڵانی لادەر" لە ساڵی (١٩٤٤) لە پاریس گەیشتۆتە

---

٣٠٥. فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٩٦.

٣٠٦. تایبر، ادوارد؛ **بچەهای طلاق**؛ ترجمە: توارندخت تمدن؛ چ٤؛ تهران: نشر دایرە خاتون (٢٠٠٥)؛ ص ١٦٩.

٣٠٧. آبادینسکی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٩.

٣٠٨. المبحل، عبدالعزیز؛ **"بدون مخدرات.. حیاتنا جمیلة"**؛ لە سایتی الوقایة: http://www.wiqayah.com/

٣٠٩. پیران، پرویز و دیگران؛ **بررسی اعتیاد و بازپروری معتادان**؛ چ١؛ تهران: دفتر آموزش و پژوهش بهزیستی (١٩٨٩)؛ ص١٤٣.

ئەو ئەنجامە کە لێکترازانی خێزانی کاریگەریی هەیە لەسەر لادانەکانی منداڵ و (88٪) منداڵانی لادەر لە خێزانە لێکترازاوەکانن.[٣١٠]

٣. ناکامڵی جۆراوجۆر لە نێوان باوان لە لایەنەکانی ئەخلاقی، ڕەفتاری و بیروباوەڕییەوە.[٣١١]

٤. بوونی پێشینەی شێوەیەکی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان لە لایەن باوانەوە؛ واتە خووپێوەگرتنی دایك و باوك، یان یەکێك لە ئەندامانی خێزان.[٣١٢] "لۆکاف" و هاوکارانی، ئەو نەوجەوانانەی کە باوانیان ماددەی هۆشبەری وەك ماددە ئەلکهۆلییەکان، ئارامبەخش، جگەرە یان هێورکەرەوەکان (مسکّن) بەکار دەهێنن، لە لاوانی تر زیاتر تووشی حەشیش، ئەلکهۆل و ماددەی تری هۆشبەر دەبن.[٣١٣] بوونی تاکی خووگرتو لە ناو خێزاندا لەوانەیە ببێتە هۆی کەمکردنی ڕق و نەفرەت لە تاکی خووگرتو و ببێتە هاندەرێك بۆ تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان. بە گشتی باوك و دایکی خووگرتو بە دوو ڕێگە ئەندامانی خێزان تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەکەن: یەکەمیان لە ڕێگەی هاندان، ئەو کاتەی باوك ودایك یان ئەندامانی تر خووگرتون، ئەوانی تر هان دەدرێن و پاڵنەریان بۆ دروست دەکەن. دووەمیان رێگەی لێبوردەیی و بێگوێدانە منداڵەکان و دوورکردنەوەیان لەو ژینگە ئالۆدەیەی کە هێناویانەتە ئاراوە. ئەو تاکانەی لەگەڵ خووگرتوان پەروەردە دەبن و بەیانی تا شەو ئەو دوکەڵە هەڵدەمژن و چۆنیەتی بەکارهێنانی هیرۆیین، حەشیش، تریاك و جگەرە دەبینن بە شێوەیەکی گومان هەڵنەگر، وردەوردە هاندەدرێن کە خۆشیان ئەم ماددانە

---

٣١٠. رفعت، محمد؛ **إدمان المخدرات أضرارها و علاجها**؛ ط ١؛ بيروت: دارالمعرفة (١٩٨٨)؛ ص ٥٤.

٣١١. د. سید احمد احمدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٠٠.

٣١٢. قربان حسینی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٦١.

٣١٣. وجدیان؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٠.

بەکار بێنن.[314] هاوسەری خووگرتوش بە هەمان شێوە؛ چونکە ژن یان پیاو بە هۆی هاودەمی کردن لە نزیکەوە و بەردەوامبوون لەسەری، لە منداڵان زیاتر لە بەردەم هەڕەشەدان. خووگرتو هەوڵدەدات بە بیانووی هەمەجۆر هاوسەرەکەشی ئاڵودە بکات تاکو: پێشگیری بکات لە پەند و ئامۆژگاری و سەرکۆنەکانی هاوسەر، پێشگرتن لە بەجێهێشتن و جیابوونەوەی ئەگەری، هەروەها هەبوونی هاوبەش و هاودەم بۆ شوێنەکانی بەکارهێنان و بارەکانی چێژوەرگرتن.[315]

٥. تەڵاق یان جیابووونەوەی کاتی و بەردەوام لە نێوان باوان و سپاردنی سەرپەرشتی تاکەکانی خێزان بە کەسان و دەزگای تر. "لۆباوڤی" لە ساڵی (١٩٨٦) دا بەپێی ئەو توێژینەوانەی کە ئەنجامی داوە، تێگەیشت کە ئەو نەوجەوانانەی کە خێزانەکانیان تووشی کێشمەکێشن، ئەگەری تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان زیاترە لە لایان.[316] توێژینەوەیەك کە لە ساڵی (١٩٩٦) لە شاری (بیرجەند)* سەبارەت بە تەڵاق ئەنجام دراوە، ئەوە پیشان دەدات کە ناوەندی ژمارەیی خەمباربوون لە ناو نەوجەوانانی خێزانە لێکترازاوەکان لە خێزانە ئاساییەکان زیاترە؛ بۆیە ئەوان زیاتر تووشی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان دەبن.[317]

٦. نەبوونی باوەڕ و پابەندبوونی ئایینی لە ناو خێزان و گرنگیدان بە شتە مادديیەکان. هەروەها چاودێرینەکردنی لایەنەکانی داوێنپاکی و خۆپارێزی

---

٣١٤. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢١.

٣١٥. کار، مهرانگیز؛ **بچەهای اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: انتشارات روشنگران (١٩٩٠)؛ ص ٢٨.

٣١٦. برماس، حامد؛ **نقش خانواده در پیشگیری یا نجات معتاد**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠١)؛ سال ٣؛ شماره ٢٦؛ ص٣٧-٣٨.

* شارێکی ئێرانیە لەسەر سنووری ئەفغانستان سەر بە پارێزگای خوراسانە.

٣١٧. علیخانی، محمد تقی؛ **نقش والدین در اعتیاد فرزندان**؛ تهران: ژرفای تربیت (١٩٩٩)؛ سال ١؛ شماره ٨؛ ص٢٧.

**گشتی، سستی و پابەندنەبوونی ئەندامانی خێزان بە تایبەت باوان بە بەها مەعنەوی، ئەخلاقی، بیروباوەڕە ئایینیەکان.[318]**

**٧. جیاکاری لە نێوان منداڵان لە پێشوازیکردن لە داخوازییەکانی.[319]**

**٨. لەبەرچاو نەگرتنی گرنگی و پێویستی دروستکردنی پەیوەندی داهێنەرانە بۆ هێنانەدی خۆشەویستی، سۆز، دڵنیایی، بەشداری و هاوکاریی دوولایەنە.[320]**

**٩. ناهاوسەنگی لە پەروەردەکردنی لایەنەکانی سۆزی منداڵان و لاوازی و کەمیی ئاستی سۆز و خوشەویستی نێوان منداڵان و باوان.[321] نەبوونی هاودڵی و هاودەردی و تێن و گەرما لە پەیوەندییەکان، هەروەها بە پێچەوانەوە زێدەڕۆیی لە میهرەبانی و کەمتەرخەمی لە ئەمر و نەهی و چاوپۆشی و نەبوونی سەکۆنەکەرەکان (تەنبیهات).[322]**

**١٠. سەڵت بوون و ژن نەهێنان. ژنهێنان و پێکهێنانی خێزان خۆی لە خۆدا دەبێتە هۆی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیی هەردوولا و قەبوڵکردنی بەرپرسیاریەتی خێزانی و پابەندی کۆمەڵایەتیی زیاتر لە ناو کۆمەڵگادا. ئامارەکان ئەوە دەردەخەن کە ئەوانەی خێزاندارن، کەمتر تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن و پابەندی ئەخلاقییان زیاترە.[323]**

---

٣١٨. جابر، أمينه و ديگران؛ **فروپاشى خانواده و آسيب شناسى آن**؛ ترجمه: داود ناروويى؛ چ١؛ تهران: نشـر احسان (٢٠٠٥)؛ ص ٦٥-٧٣.

٣١٩. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١١.

٣٢٠. منوچهر رعدى؛ **راهنماى پيشگيرى از اعتياد (ويژه خانوادەها)**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٦٢-٦٤.

٣٢١. مدنى، سعيد؛ **خانواده و اعتياد**، مجموعه مقالات دومين همايش ملى آسـيب شناسـى اجتمـاعى در ايران: اعتياد و قاچاق مواد مخدر؛ ج ٢؛ چ٢؛ تهران: نشر آگه (٢٠٠٧)؛ ص١٨٢.

٣٢٢. دانش؛ **معتاد كيست؟ مواد مخدر چيست؟**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٠.

٣٢٣. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٦٧-٦٩.

١١. هەڕەشە خستنە سەر ئارامی و هێمنی منداڵان لە ناو خێزان؛ وەك دەرکردن، توندوتیژیی بەکارهێنان، توندڕەویی بێ بنەما، لۆمە و سەرکۆنەکردنی بێ سنوور و لە ڕادەبەدەر، پەلەکردن لە بڕیاردان و یەکلاکردنەوە و ناولێنانی خراپ لەسەر منداڵان و شکاندنیان؛[٣٢٤] وەکو ئەو توێژینەوە کە لە "سعودیە" کراوە کە دەڵێت: ڕێژەی (١٤٪) تووشبوان بە مادده هۆشبەرکان لەبەر توندوتیژیی دایك و باوك لەگەڵیان پەنایان بردووە بەر مادده هۆشبەرەکان.[٣٢٥]

١٢. داخوازییە نابەجێیەکانی باوان لە ڕاستکردنەوەی خواستەکان و چاوەڕوانییەکانی منداڵانیان و بە پێچەوانەوە و شلگیری بەرامبەر هێنانەدی خۆشگوزەرانییە تەندروست و داهێنەرانەکان.[٣٢٦]

١٣. نەخوێندەواری دایك و باوك؛ بەپێی ئەو لێکۆلینەوەی کە لە ساڵی (١٩٨٨) لەسەرتاسەری ئێران لە نێوان قوتابیان ئەنجام دراوە، نەخوێندەواریی دایك و باوکان هۆی گرنگی لادانی قوتابیان بووە.[٣٢٧] لێکۆڵینەوەیەکی تر نیشان دەدات کە زۆربەی خووگرتووان دایك و باوکیان نەخوێندەوار بوونە: باوکیان (٦٤٪)، دایکیان (٨٣٪)، خودی خووگرتووان (٥١٪)، هاوسەرانیان (٤٠٪) نەخوێندەوارن.[٣٢٨]

١٤. زۆری منداڵ و خراپ پەروەردەکردنیان لەسەر بنەمای پەیوەندیی ناتەندروست و تێکدەر و تاکڕەوانە، یان ئازادیی لەڕادەبەدەر، یان ناچوونییەکی

---

٣٢٤. علیخانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٧.

٣٢٥. المبحل؛ سەرچاوەی پێشوو.

٣٢٦. هەمان سەرچاوە؛ ل ٢٨.

٣٢٧. گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٥٢-٥٣.

٣٢٨ . فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٩٧.

لە پاداشت و سزا بەپێی کردەوەکانیان و دژبەیەکبوون لە شێوازەکانی پەروەردەی باوان و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ منداڵەکانیان.[٣٢٩]

١٥. نەبوونی کونترۆڵ و چاودێری لەسەر منداڵان و پەنابردنی منداڵان بەرەو گروپی هاوتەمەنەکان و هاودەمی لادەر و ڕووخێنەرەکان.[٣٣٠]

١٦. هەژاری و خۆشگوزەرانییە ئابوورییەکانی خێزان. تاکەکان لە خێزانە هەژارەکاندا تووشی گرفت وکێشەی جۆراوجۆرن. هەستکردن بە بێبەشکردنی تاك لە خێزانە هەژارەکاندا، لە بەرامبەر گرفت و کێشەکانی هەژارییدا تاك زیاتر تووشی لادان و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەکات. گرفتی ئابووریی خێزان تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندی بە کار و پیشەی باوکەوە هەیە. ئەو باوکەی کە بارودۆخێکی کاری نەگونجاوی هەیە، بەردەوام لە ژیانیدا شپرزە، نیگەران، ڕەشبینە و لە ڕووی ڕەفتاریشەوە ئاسایی نییە، بارودۆخێك دروست دەکات دەبێتە هۆی شپرزەیی منداڵان، توڕەیی، شەڕەنگێز و گۆشەگیر، خاوەن هەستی بێڕێزی، تووشی ململانێی سۆزداری، تێکدان، تۆڵەسەندن، ڕقئەستوری، دڵناسکە و ئامادەیە لەماڵەوە ڕا بکات و دەست بداتە لادانەکانەکانی دزی و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.[٣٣١] لە لایەکی ترەوە ژمارەیەکی بەرچاو لە کڕیارانی مادده هۆشبەرەکان کەسانی دەوڵەمەندن و لە خێزانە دەوڵەمەندەکان و سەرمایەدارانن، بە هۆی زۆری کارکردن یان سەرگەرمی و سەرقاڵیان، پەیوەندییەکانیان لاواز دەبێت؛ ئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ ڕوو کردنە مادده هۆشبەرەکان. هەروەها ئەوانەی خاوەن دەرامەتێکی زۆرن،

---

٣٢٩. حسینی زاهدی؛ سید ولی؛ **اعتیاد و جوانان**؛ مقالەی ئینتەرنێتی لە سایتی:
http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

٣٣٠. منوچهر رعدی؛ **راهنمای پیشگیری از اعتیاد (ویژه دانش آموزان دبیرستان)**؛ سەرچاوەی پێشـوو؛ ل ٢٢.

٣٣١. میرافخمی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٣.

زەمینەیەکی لەباریان هەیە بۆ بەشداریکردن لە یانەکانی شەوانە یان ڕابواردنی جۆربەجۆر و پەیوەندیکردن بە چەندین کەسی تایبەت و، بەکارهێنان و فرۆشتنی مادده هۆشبەرەکان.[332]

### ٢. فاکتەری گروپی هاوتەمەنەکان:

لە هۆکاری تر کە ڕۆڵی هەیە لە ئاستی ناوەندیدا بۆ بەکارهێنان و تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان بە تایبەتی لە ناو نەوجەوانان و لاوان، گروپە هاوتەمەنەکانە. لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان بە تیۆرەکانی ((گواستنەوەی کولتوری (وردەکولتور) و تیۆری گروپی هاوتەمەنەکان و هاودەمی جیاواز و لاساییکردن)) کرد، کە جەختی دەکردە سەر کاریگەریی برادەرە لادەرەکان لەسەر گەنج و لاوان.

لەگەڵ ئەوەی منداڵان دەگەنە تەمەنی نەوجەوانی و مێرمنداڵی، لە ڕێژەی کاریگەریی خێزان لەسەریان کەم دەبێتەوە و زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەریی ژینگەی کۆمەڵایەتی و گەڕەکی نیشتەجێ بوونیان و گروپی هاوتەمەنەکانیان.[333] ئەم گروپە پێك دێت لە منداڵانی تیپی یاریکردن، بازنەی برادەران لە کۆڵانەکان و ناوچەکانی جیاوازی شار و گوند، گروپی برادەران لە ناو خزمان و بنەماڵە دا، هەروەها لە ناو قوتابخانە و زانکۆ کە ئەندامانی لە ڕووی پێگەی کۆمەلایەتییەوە تا ڕادەیەك لە یەکتر نزیکن.[334] لەم گروپانەدا تاکەکان بۆچوونی یەکتر قەبوڵ

٣٣٢. فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٥٥-١٥٦.

٣٣٣. ستودە؛ **آسیب شناسی خانوادە**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٤١.

٣٣٤. مظفری، عباسعلی؛ **گروە دوستان و همسالان و تأثیر آن در انحراف اجتماعی با تأكید بر اعتیاد مواد مخدر**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠١)؛ سال ٣؛ شمارە ٢٢؛ ص ٣١.

دەکەن بۆ ئەوەی یەکتریان خۆشبوێت و یان ڕێز لە یەکتری بنێن و یان دەیانەوێت وەك یەك بن.[335]

گروپی هاوتەمەنەکان لە ڕێگەی هاندان یان ناچارکردنی ئەندامانی بۆ شوێنکەوتنی ڕەفتارەکانی گروپ و پەیوەندییەکانی، تاکەکان کۆمەڵایەتی دەکا. تاك لە ناو گروپدا زۆربەی جار وەك ئەوە نییە کە لە ناو خێزاندایە؛ واتە پەیوەندییەکانی لەسەر بنەمای توانایی جەستە، پەیوەندیی خاو و خزمایەتییەکان نییە.* تاك لە ناو گروپدا نە فەرماندەیە و نەفەرمانبەر؛ بەڵکو دەبێ فێر بێت کە چۆن لەگەڵ شێواز و بەهاکانی هاوتەمەنەکانی کە یەکسانن لەگەڵ ئەودا بگونجێت و ڕۆڵی هاوکارێك بگێڕێت؛[336] بۆیەشە کە تاك لە ناو گروپدا بە نیسبەت خێزانەوە زۆر ئاسانتر و خێراتر فێری ڕەفتاری دیاریکراو دەبێت.[337] لێرە ئەو فەرموودەی پێغەمبەرمان ـ د. خ ـ دێتەوەبیر کە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿المرء على دين خليله، فلينظر أحدكم من يخالل﴾؛[338] واتە: ((مرۆڤ لەسەر ئایین و ڕەوشتی برادەر و هاودەمی خۆیە، بۆیە هەر یەك لە ئێوە چاوی لێی بێت کە لەگەڵ چ کەسێك دەبێتە هاودەم و برادەر!)). یان

---

٣٣٥. لوكاريني، اسپارتكو؛ **جوانان و اعتياد**؛ ترجمە: مهشيد بهروزى؛ چ٢؛ تهران: نشر ساحل (١٩٩٠)؛ ص ٩١.

* بۆ نموونە ناڵێن: کێ لە ڕووی جەستەییەوە بەهێزترە یان لەشی جوانترە، یان چون ئەوە ئاموزای فلانە و کوڕی فلان کەسە و... با گوێ لەو بگرین!

٣٣٦. مظفرى؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣١.

٣٣٧. موسى نژاد، على؛ **نگاهى به عوامل مؤثر بر گرايش نسل جوان به مواد اعتياد آور**، مجموعە مقالات دومين همايش ملى آسيب شناسى اجتماعى در ايران: اعتياد و قاچاق مواد مخدر؛ ج ٢؛ چ٢؛ تهران: نشر آگە (٢٠٠٧)؛ ص٢١٤.

٣٣٨. رواه أبو داود والترمذيّ، بسندٍ حسن؛ منقول عن الموقع إسلام أون لاين:
http://www.islamonline.net

دەفەرموێت: ﴿إياك و قرين السوء فإنك به تُعرف﴾؛[339] واتە: ((خۆت لە برادەری خراپ بپارێزە، چونکە تۆ بەوی دەناسرێیەوە!)).

خووگرتووان وەك ئەو نەخۆشانە وان کە بۆ هەر شوێنیك بچن، ئەو ژینگەیە بەو نەخۆشییە ئاڵودە دەکەن. کەمتر خووگرتوویەك دەبینرێت کە بانگەشە بۆ ماددە هۆشبەرەکان نەکات. ئەوان بەردەوام لە خۆیاندا هەست بە کەمی دەکەن و بە لانی کەم ئەم بۆچوونە لە لایان دروست دەبێت؛ بە واتایەکی تر بۆ تۆڵەسەندنەوە لە کۆمەڵگا، هەوڵدەدەن ئەوانی تریش بۆ ئەو دۆزەخە ڕابکێشن کە خۆیان تیایدا دەسوتێن و بۆ ئەو کەندەڵانەی کە خۆیان تێیکەوتوون خەڵکی تێباوێن، تاکو هەم لەم ڕێگەیەوە بۆ خۆیان هاودەمێك بدۆزنەوە و، هەم باری خۆیان دابەش بکەنە سەرشانی خەڵکانێکی تر و هەم دیسان سەرکۆنە نەکرێن. خووگرتووان لەوە کە کەسانێك تووشی ئەو دەردە بکەن کە چارەی نییە، هەست بە ئارامی دەکەن.[340]

بەپێی توێژینەوە و بۆچوونی زانایان، گروپی هاوتەمەنەکان بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان دادەنرێت؛ هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان کرد، "سیگۆل" بەپێی ئەو توێژینەوانەی کە لەسەر (١٥٠٠) قوتابی تەمەن (٧-١٢) ساڵی لە ئالاسکا ئەنجامی دابوو، بۆ ڕوونکردنەوەی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان سێ پاڵنەر هەڵدەبژێرێت کە یەکێکیان پاڵنەری ((بوونە ئەندامی گروپی هاوتەمەنەکان)) بوو.[341]

"کاپلان" و هاوکارانیشی باوەڕیان وایە، ئەگەر تاك بەردەوام بکەوێتە بەر هەڕەشە و ڕەخنەی ئەوانی تر، خۆی بە بێڕێز دێتە بەرچاو و شکۆ (عزت)ی

---

٣٣٩. علوان، عبدالله ناصح؛ **چگونه فرزندان خود را تربيت كنيم**؛ ترجمه: عبدالله احمدی؛ ج١؛ چ١؛ تهران: نشر احسان (١٩٩٤)؛ ص ١٢٢.

٣٤٠. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١١٩-١٢٠.

٣٤١. کافیە عبدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٦٦-٦٧.

نەفسی دادەبەزێت، کە کاریگەریی هەیە بۆ سەر پەیوەندی لەگەڵ هاوتەمەنە تووشبووەکان و لە ئەنجامدا ڕوو دەکاتە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان. یەکێکی تر لە هۆکارەکانی بە ئەندامبوونی تاك بۆ گروپی هاوتەمەنەکان، بەردەوامی نەگونجانیی پەیوەندی نەوجەوانان و باوانە، کە هانیان دەدات بۆ پەیوەندیکردن بە گروپی هاوتەمەنەکان کە بە شێوەیەکی ئاسایی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان یان لادانەکانی دیکەیان هەیە.[٣٤٢]

لە توێژینەوەیەشماندا، گروپی هاوتەمەن و هاوڕێکان، یەکێك لە هۆکارە سەرەکی و کاریگەرەکانی تووشبونی خووگرتوە بەندکراوەکان بووە بە ماددە هۆشبەرەکان. ئەنجامەکانی توێژینەوەکەم ئەوە دەردەخەن کە ڕێژەی (٥٠٪)ی تاکەکانی نموونە لە ڕێگای برادەرەکانی دەرەوەی قوتابخانە فێر بوونە و یەکەمجار بە پێشنیاری ئەوان تووشی ماددە هۆشبەرەکان بوونە. ڕێژەی (٢٠٪)یش لە ڕێگای برادەرانی ناو قوتابخانە و، ڕێژەی (١٠٪)یش لە ڕێگای یەکێك لە خزمەکان و ئەوانیتر فێر بوونە. ڕێژەی (٧٠%)یش یەکەمجار لە میوانداری برادەران دەستیان پێکردوە. ئەم ئەنجامەش لەگەڵ ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی ئێرانی کۆکە کە زۆرترین ڕێژەی نموونە واتە ڕێژەی (٤٠٪)ی خووگرتووان یەکەمجار لە میوانداری برادەرەکان تووش بوونە و ئەوانی تر لە ماڵ و لە پارك و سەربازخانە فێربوونە.[٣٤٣] ڕێژەی (٩٠٪)یشیان برادەری جگەرەکێشی هەبووە و ڕێژەی (٦٠٪)یش لە ڕێگەی برادەران فێری خواردنەوەی مەشروباتی ئەلکهۆلی بوونە. هەروەها لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئاراستەیانم کرد: (ڕێگای بە دەستهێنانی ماددە هۆشبەرکان لە لایەن ئەوانەوە چی بوە؟)،

---

٣٤٢. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٤٠-٤١.

٣٤٣. رزاقی، عمران محمد و دیگران؛ **ارزیابی سریع وضعیت سوء مصرف مواد در ایران**؛ ج١؛ چ١؛ تهران: سازمان بهزیستی کشور، معاونت امور فرهنگی و پیشگیری (٢٠٠٣)؛ ص ٣٨٣.

ڕێژەی (٩٠٪) گوتیان لە ڕێگای  برادەرە خووگرتووەکان بووە و ڕێژەی (١٠٪) بەرێگای فرۆشیارە دیاریکراوەکان. لێرەدا وەك لە ڕاپورتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و هاوکاریکردنی کەسانی تر بۆ تووشبوونیان بەو ماددانە.[344] ڕێژەی (٥٠٪)یش گوتیان کە شێوازی بەکارهێنانیان گروپی بووە؛ واتە لەگەڵ برادەرەکان و هاودەمەکانیان کۆدەبنەوە و پێکەوە ماددەی هۆشبەر بەکاردەبەن. ڕێژەی (١١.١٪)یش فاکتەری ((لاساییکردنەوە)) لە برادەری خراپ، بە هۆکاری تووشبونی گەنجانی کوردستان دەزانن.

لێرەدا دەردەکەوێت کە هەبوونی برادەرانی خراپ دەبێتە هۆی تووشبون بە ماددە هۆشبەرەکان. ئەمەش دەبێتە هۆی بڕینی پەیوەندی لەگەڵ خزم و کەس و برادەرانی کۆن؛ چونکە ناوبراو گرنگی زیاتر دەدات بە ئامادەبوون و هاتوچۆکردن لەگەڵ برادەرانی وەك خۆی کە وادەکات پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نەمێنێ لەگەڵ خێزان و خزم و کەس؛ وەك لێکۆڵینەوەکان جەخت لەسەری دەکەن.[345]

### ٣. فاکتەری قوتابخانە:

جگە لە خێزان و گروپی هاوتەمەنەکان، قوتابخانەش بە گوێنەدان بە داخوازییەکانی قوتابیان، نەبوونی بەڕێوەبردنێکی دروست، کۆنترۆڵ و چاودێرینەکردنی هاتن و دەرچوونی قوتابیان و ئامادە نەبوونیان، نەبوونی پەروەرشیارانی هۆشیار و شارەزا لە کێشەکانی منداڵان و نەوجەوانان و لاوان،

---

٣٤٤. تقرير الدورة (٣٨) للجنة المخدرات التابعة للأمم المتحدة التي عقدت بمركز الأمم المتحدة في فينا في الفترة من ١٤- ٢٣ آذار/ مارس (١٩٩٥)؛ ص٤٩.

٣٤٥. الخزرج و سعيد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٨٨.

به هۆكاری تری كاریگەر لەسەر تووشبوون بە مادده هۆشبەرەكان دادەنرێت. لە لایەكی ترەوە ناهاودەنگی سیستەمی فێركردن لەگەڵ بونیادی خێزان و نیازە كۆمەڵایەتییەكانی تاك بە درێژایی زەمەن، دەبێتە هۆی شلەژان لە بەكۆمەڵایەتیبوونی تاك، دژ بەیەكبوونی ڕۆڵ و لە كۆتاییدا نامۆبوونی، خۆی لەخۆیدا كاریگەرە لە بەكارهێنانی مادده هۆشبەرەكان.[٣٤٦] هەروەها نەبوونی یاسای جیددی لە ڕێگرتنی بەكارهێنانی جگەرە و ماددەكانی تر، سترێسی زۆری ژینگەی خوێندن،[٣٤٧] ڕەچاونەكردنی هەستە سۆز و دەرونییەكانی قوتابیان، پێداویستییەكان، پەروەردەی كۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئایینیان لە لایەن مامۆستا و پەروەرشیارانەوە، دەبێتە هۆی كێشە و شلەژان لە درێژەپێدانی خوێندن و، دواتر لە خوێندن و ژینگەی خوێندن ناڕازی دەبن و خوێندن و قوتابخانە بەجێ دێڵێن و لاسایی برادەرە خووگرتووەكانیان دەكەنەوە، یان بۆ دەرخستنی ئازایەتی و هێز و توانایی خۆیان بە جگەرەكێشان دەست پێدەكەن و دواتر بە هیرۆیین و حەشیش و ئەلكهۆل خووگر دەبن.[٣٤٨]

قوتابخانەكان و بەشە ناوخۆییەكانی قوتابیان لەبەر تێكەڵبوونی قوتابییە جۆراوجۆرەكان كە بەردەوام لە زۆربەی كاتەكاندا لەگەڵ یەكترن، تەنانەت كاتێ دەستبەتاڵی و نووستن و خواردن، هەروەها بە هۆی دووركەوتن لە خێزان، زەمینەی خووگرتنیان زۆر دەبێت كە بۆ هەڵاتن لە كێشەكانی تەنیایی و دووری لە خێزان، بە پێشكەشكردنی جگەرەیەك لە لایەن قوتابی و هاوڕێیەك دەست پێدەكات و تاكو دەبێتە خووگرێكی ئەلكهۆلی یان تریاكی و...[٣٤٩]

---

٣٤٦. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٦.

٣٤٧. گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٣.

٣٤٨. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٣.

٣٤٩. گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٣.

توێژینەوەیەك لە "سعودیە" كراوە پیشانی دەدات لە كۆی گشتی (٢٢١) خووگرتوو، ڕێژەی (٦٦٪) كە تەمەنیان لە نێوان (١٢ ـ ٢٠) ساڵ بووە، لە ژینگەی قوتابخانەكاندا فێری مادده هۆشبەرەكان بوونە بەو پاڵنەرەی كە مادده هۆشبەرەكان دەبێتە هۆی باشتربوونی خوێندنیان و هۆش و زاكیرەیان بەهێزتر دەكات و دەبێتە هۆی زیرەكی و نەخەوتنیان. ڕێژەی (٨٪) بە شێوەیەكی ڕاستەخۆ لەبەر مامۆستایان بووە، كە ئیهانە و بێرێزی و توندوتیژی لەگەڵیاندا كردووە.[٣٥٠]

لە لێكۆڵینەوەی ئێمەشدا دەركەوت كە: ڕێژەی (٢٠٪)ی تاكەكانی نموونە، لە ژینگەی قوتابخانە لە ڕێگای هاوڕێیەكانیانەوە كە پێكەوە لە قوتابخانە بوونە، فێری بەكارهێنانی مادده هۆشبەرەكان بوونە.

### ٤. فاكتەری ڕاگەیاندن:

ڕاگەیاندن و پەیوەندییە جەماوەرییەكانیش وەكو یەكێكی تر لە كۆڵەكە كاریگەرەكانی بەكۆمەڵایەتیبوونی تاك دەتوانێت لە دروستكردنی پاڵنەر بۆ بەكارهێنانی مادده هۆشبەرەكان كاریگەریی خۆی هەبێت.

ڕاگەیاندن ڕۆڵێكی سەرەكی دەبینێت لە بڵاوكردنەوەی بەها و پێوەرە زیانبەخشەكان، ململانێ و هەڕەشەی كولتوری، شلەژانی بەهاكانی كۆمەڵگا و تەنانەت شلەژانی ڕەفتاریی تاكەكان كە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوان و لادانەكان بە هەموو جۆرەكانەوە.[٣٥١]

---

٣٥٠. المبحل؛ سەرچاوەی پێشوو.

٣٥١. بڕوانە: هرزاني، د. نوری یاسین؛ **الإعلام و الجريمة**؛ ط ١؛ أربيـل: جامعـة صـلاح الـدين (٢٠٠٥)؛ ص ١٠٠-١٣٣.

نەبوون یان کەمیی پڕۆگرام و کتێب و گۆڤاری فێرکردن کە بگونجێت لەگەڵ پێداویستیی تاکەکان لە گروپەکانی تەمەنی جیاجیادا، یان بە پێچەوانەوە بوونی فیلم و پڕۆگرام و چاپەمەنی کە دەتوانێت زیانبەخش و سەرلێشێوێنەر بێت لەو هۆکارانەن کە پاڵ بە تاکەوە دەنێن بۆ خووگرتن بەماددە هۆشبەرەکان.[٣٥٢]

لە کاتێ سەردانم بۆ "زیندانی محەتتە"ی هەولێر و چاوپێکەوتنم لەگەڵ خووگرتووەکانی بەندکراو، دوای پرسیارەکانم وەڵامی هەندێ لەوان ئەوە بوو کە من و هەندێ لە برادەرانم، لە دوای تەماشاکردنی زنجیرە درامای کۆری کە لە سەتلایتی کوردستان ماوەیەك بەر لە ئێستا پەخش دەبوو، فێر بووین هەر کاتێك لەگەڵ خۆشەویستم تووشی کێشە و ئاڵۆزی دەبووین، تەنانەت بە قسەکردن بە تەلەفۆن، یەکسەر پەنامان دەبرد بۆ خواردنەوەی بیرە و ڤۆدکا و جگەرە[*]!

کەواتە دەتوانین بڵێین: تەواوی ئەو هۆکارانەی ڕۆڵیان هەیە لە "بەکۆمەڵایەتیبوونی" تاك (واتە: خێزان، هاوڕێیەکان، قوتابخانە و ڕاگەیاندن)، ئەگەر لە پەیوەندی و هاوکاریی لەگەڵ یەکتردا دژ بەیەك بوەستنەوە، توانای تاك لە گونجان لەگەڵ ژینگەدا دێنێتە خوارەوە و ڕازیبوون بە بەها و پێوەرەکان تێکدەچێت و تاکەکانیش دەکەونە بەر ئابلۆقە و ململانێی بە کۆمەڵایەتیبوونی ناتەواو، لەم بارەشدا تاك ئامادەگی تێدایە بۆ تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان.

---

٣٥٢. یزدخواستی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٥.

* ئەم چاوپێکەوتنە لە ڕێکەوتی (٢٠٠٩/١١/١٩) لە زیندانی ئاسایش گشتی هەولێر ئەنجام دراوە.

## سێیەم: هۆکارەکانی خووگرتن لە ئاستی قەبە دا:

لە ئاستی قەبەدا ئاماژە بەوە دەکرێت کە خووگرتن بە نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت کە فاکتەرە بونیادییەکان و قەبەکان لە ئاستی کۆمەڵایەتی دەبنە هۆی خووگرتن و خراپ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان؛ وەکو: هۆکاری سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری، یاسایی و ئیکۆلۆژی. ئەم کۆمەڵە فاکتەرانە لە دەرەوەی دەسەڵاتی تاکدان و لە ڕابردوویەکی دوورەوە پەیدا بوونە و بۆیە بە جەبرە کۆمەڵایەتییەکان ناودەبرێن. گەشەنەسەندن و هەژاریی گشتی، ئابلۆقە و کارەساتە گشتییەکان، نەبوونی هۆشیاری سەبارەت بە مادده هۆشبەرەکان لەبەر هەژاریی کولتووری، وردە کولتووری تر لە ژینگەکەدا، نەبوونی وەفا و خۆشەویستی و بێبەشکردنەکان لە ئەنجامی ژیانی ماکینەیی، سیاسەتی داگیرکەرانە و هی تر، لە کۆی ئەو فاکتەرانەن کە ئێستا یەك بەك باسیان دەکەین:

### ١. *هۆکارە ئیکۆلۆژییەکان:*

**أ. هۆکاری جوغرافی:**

پێگەی جوغرافیایی لە هەندێ وڵاتدا کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردنی سنوورەکان زەحمەت دەکات و دەستگەیشتن بە مادده هۆشبەرەکان و بازرگانیکردن و کڕین و فرۆشتنی ئاسان دەکات. کەمتەرخەمیی دەوڵەتانیش ئەم هۆکارە بەهێزتر دەکات؛ بۆ نموونە: بوونی ((ئێران)) لە تەنیشت ((ئەفغانستان)) و بوونی ((کوردستانیش)) لە تەنیشت ((ئێران)) یەکێك لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوە و ئاڵوگۆڕکردنی مادده هۆشبەرەکانە لە نێوان دوو

سنوری (ئێران و ئەفغانستان) و (ئێران و کوردستان) و تەنانەت لە نێوان خودی هەرێمی کوردستانیشدا!

کەواتە گواستنەوەی ناوچەیی و دراوسێیەتی وڵاتە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنەری مادده هۆشبەرەکان، هۆکاری هەرەگرنگی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان دەژمێردرێت. بارودۆخی زاڵ بە سەر ئەفغانستان (کە بە سەرەکیترین وڵاتی بەرهەمهێنەر دادەنرێت) بۆتە هۆی ئاوارەبوونی سەدان هەزار ئەفغانی، بێبەندوباری، تاڵان، بەرهەمهێنان و قاچاغیکردن بە مادده هۆشبەرەکان. ئێرانیش وەك دراوسێیەك، ئاسانی گەیشتن و بارکردنی زیاتری مادده هۆشبەرەکان بۆتە هۆی سەرنجڕاکێشانی بەرهەمێنەرانی ئەو جۆرە ماددانە. بێتوانایی وڵاتی عێراق و هەرێمی کوردستانیش لە کۆنترۆڵکردنی مادده هۆشبەرەکان لە سنوورەکان، بەڵگەیەکی ترە بۆ لێشاوهاتنی ئەو جۆرە ماددانە بەرەو شارەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان؛ هەروەك لەسەردانی مەیدانیم و چاوپێکەوتنم لەگەڵ خووگرتووە بەندکراوەکانی هەولێر، دەرکەوت کە هەموویان واتە (١٠٠٪)یان ئاماژەیان بەوە کرد، کە هەموو ئەو مادده هۆشبەرانەی لە کوردستان بە دەست دەکەون و بازرگانی پێدەکرێن، لە وڵاتی ئێرانەوە دێتە ناو خاکی کوردستان.

### ب. هۆکاری بەردەستبوونی مادده هۆشبەرەکان (شوێنی نیشتەجێبوون):

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان لە ئاستی قەبەدا، بەردەستبوونیانە. لەو وڵاتانەی کە بە چاندنی خەشخاشەوە خەریکن، خووگرتن بەو ماددانە شتێکی ئاساییە و لەو وڵاتانەی کە شاهدانە و کانابیز دەچێنرێت، خوو بە حەشیشەوە دەگرن و لەو وڵاتانەش کە داری کۆکا گەشە دەکات، خووگرتن بە کۆکایین زیاتر دەبینرێت. لە شارە گەورەکانیشدا کە بە هۆی گۆڕینی تریاك بۆ هیرۆیین و مۆرفین و کراك و ئەمفیتامین دەبینرێت،

قوربانیانی هیرۆیین و مۆرفین و کراك و ئەمفیتامین زۆرینەن؛ هەر وەکو لە توێژینەوە ئەنجامدراوەکان دەرکەوتووە کە (٥٥) توێژینەوە داکۆکیان لەم بابەتە کردۆتەوە.[٣٥٣]

کەواتە زۆربوون و هەرزانبوون و ئاسان دەستکەوتنی مادده هۆشبەرەکان بۆ هەموو خەڵك، گرنگترین هۆکاری بڵاوبوونەوەیە. بەپێی ڕاپۆرتی ئەو توێژینەوەیەی کە لە ساڵی (٢٠٠٠) بڵاوکرایەوە، دەرکەوت کە لە نموونەیەکی (٧٠٧٦) کەسی خووگرتووی شاری ئیسفەهانی ئێران، (٧٠,٥٪)یان هۆکاری تووشبونیان بە مادده هۆشبەرەکان بریتی بووە لە بەردەستبوونیان.[٣٥٤]

لەم توێژینەوەیەمدا، هەموویان (واتە ١٠٠٪)ی خووگرتوە بەندکراوەکان، ئەو ماددەیانە بە ئاسانی و بە فراوانی لە ڕێگای فرۆشیارە دیاریکراوەکان و برادەر و خزم و کەس و کاریان، هەر لە ناو هەرێمی کوردستان بە دەست کەوتووە؛ هەموویان لە وەڵامیاندا دەیانگوت: ئەگەر ماددەی هۆشبەر نەبایە و بە دەستمان نەکەوتبایە، سروشتییە کە ئێمەش تووش نەدەبووین و تەنانەت هەوڵیشمان نەدەدا بۆ گەڕان بە دوایدا؛ چونکە بە تەواوەتی بێهیوا و نائومید دەبووین!

### ج. هۆکاری دانیشتوان:

تەقینەوەی دانیشتوان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کێشە و دژواریی جۆراجۆر دروست دەکات، کە بە جۆرێك دەبێتە هۆی زیاد بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان. کاتێك دانیشتوان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی لە ماوەیەکی کورتدا زیاد دەبێت، بێگومان تواناکانی کۆمەڵگا لە دابینکردنی پێویستییەکانیان کەم دەبێتەوە و تاکەکانیش کەمتر دەستیان دەگاتە خزمەتگوزارییەکان؛ وەکو:

---

٣٥٣. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٣.

٣٥٤. صفایی راد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤.

خوێندن، کار، تەندروستی، نیشتەجێبوون، سەرگەرمی و پڕکردنی کاتی دەستبەتاڵی و هتد. پەیدابوونی پێویستییەکان و تێرنەکردنیان، کەسەکە تووشی سەرلێشێوان و بێبەشی دەکات و، ئەمەش دەتوانێت زەمینەسازی خووگرتن و تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان بێت. لە لایەکی ترەوە زیادبوونی دانیشتوان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و بەرنامەڕێژنەکراو بە درێژایی کات دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری، هەژاری و نایەکسانی، کۆچکردنی گوندنشینان بۆ شارەکان و پەراوێزنشینی، تەڵاق و فەحشا و لادانە کۆمەڵایەتییەکان کە هەر کامیان دەتوانێت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و ڕاستەخۆ کاریگەر بێت لە تووشبوون بە ئالوودەی ماددە هۆشبەرەکان؛[٣٥٥] چونکە تاك بە نیسبەت بە ئاییندە نیگەران و نائومید دەبێت و ئەوەش خۆی لەخۆدا دەبێتە هۆی کێشەی دەروونی و لە پێناو هەڵاتن لە سترێس و فشاری ژیان و لە بیرکردنی خەم و خەفەتی ئایندە، پەنا دەبنە ماددە هۆشبەرەکان.[٣٥٦]

**د. هۆکاری کۆچکردن:**

**١) کۆچکردنی گوندنشینان بۆ شارەکان و پەراوێزنشینی:**

کۆچکردوانی گوند لە پەراوێزی شارەکان ـ لەبەر نەبوونی خانوو و نەبوونی توانایی کریێ خانوو ـ نیشتەجیێ دەبن و بێبەش دەبن لە کار و داهاتی گونجاو. ئەوان لەبەر بێکارییەکی بێسنوور کە تووشیان دەبێت، ناچار دەبن ڕوو بکەنە هەندێ کاری تایبەت وەکو ڕۆژنامەفرۆشی و دەستفرۆشی و بۆیاغچی لە گەڕەکەکان کە وردە وردە دەست بە کارە نایاسایی و خراپەکارییەکانی وەك قاچاغی بە ماددە هۆشبەرەکان دەکەن کە لە ئەنجامدا، ئەو شوێنانە دەبنە

٣٥٥. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٢.

٣٥٦. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٥.

هۆی بڵاوبوونەوە و دابەشکردنی مادده هۆشبەرەکان. لەلایەکی ترەوە کۆچکردوان و پەراوێزنیشینان لەبەر نەگونجانیان لەگەڵ شێوازی ژیانی شار ـ لەبەر جیاوازیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لاوازیی پابەندیی ئایینی و نەتەوەیی ـ و دابڕانیان لە کولتووری ڕابردوویان، تووشی ونکردنی ناسنامەیان دەبن، کە زەمینەیەکە بۆ سەرهەڵدانی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی وەك خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان و داوێن پیسی.[٣٥٧]

### ٢) کۆچکردن لە وڵاتێك بۆ وڵاتی تر:

کۆچکردن لە وڵاتێك بۆ وڵاتی تر بە هۆی بەرجەستەتر بوونی دژایەتی کولتووری، جیاوازی ئایینی و نەتەوەیی، جیاکاری لە مافەکانی پەنابەرانی کۆچکردوو، کێشەکانیان زیاترە لە کۆچکردنی گوندنشینان بۆ شارەکان. کۆچکردووان بە هیوا و ئاواتێکی خەیاڵی بۆ وڵاتێك کۆچ دەکەن، کەچی بە پێچەوانەوە ڕووبەڕووی هەندێ ڕاستی دەبنەوە کە ناتوانن تەحەممول بکەن. بۆیە تووشی نەخۆشی دەروونی دەبن و زیاتر لە خەڵکانی تر دەکەونە ڕاوی مادده هۆشبەرەکان و قاچاغچییەکان.[٣٥٨]

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەشم ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ((شوێنی نیشتەجێبوونی پێشوو))ی هەر هەموویان واتە (١٠٠٪)ی هەموو خووگرتوەکانی بەندکراو لە شارە گەورەکانی وڵاتی ئێران بووە بە حوکمی ئەوەی گشتیان پەنابەری ئێران بوونە و لە ساڵانی ڕابردوودا بۆ خاکی کوردستان گەڕاوەنەتەوە کە زۆرترین ڕێژە واتە (٣٠٪) لە شاری ئەسفەهان، (٢٠٪) لە شاری شیراز و

---

٣٥٧. کافیە عبدی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٧٠ــ میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٣-٤٤ ـــ دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٧-١٢٨.

٣٥٨. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٨.

ئورومیە، (١٠٪) لە شارەکانی جەهروم و سەردەشت و شنۆ بوە. دەشزانین کە شارەکانی ئێران هەموو جۆر ماددەی هۆشبەر بە دەست دەکەوێ؛ بۆیە هۆکاری جوگرافی یەکێك لە هۆکارەکانی تووشبون بە ماددە هۆشبەرەکان دادەنرێت. ئەم ئەنجامەش لەگەڵ ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی ئێرانی کۆکە کە ڕێژەی (٨٩.٦٪)ی تووشبووان لە شارەگەورەکانی ئێران نیشتەجێ بوونە.[٣٥٩]

هەروەها ئەگەر بێتۆ سەیری ((ساڵی گەڕانەوەیان)) بکەین (واتە لە ئێرانەوە بۆ کوردستان)، یەکەم وەجبەی گەڕانەوەی پەنابەرانی کورد لە وڵاتی ئێران بۆ خاکی کوردستان لە ساڵی (١٩٩١) دەستپێکرا، کە ئەم پرۆسەیە تا ئێستاش بەردەوامە کە زۆرترین ڕێژەی گەڕانەوەی تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٢٠٠٥) کە بریتییە لە (٣٠٪)، هەروەها ڕێژەی (٢٠٪) بۆ ساڵانی (٢٠٠٠ و ٢٠٠٤) بوە و، ڕێژەی (١٠٪)یش بۆ هەر یەك لە ساڵانی (٢٠٠٣ و٢٠٠٧ و ٢٠٠٩) بوە؛ کەواتە هیچ کەس لەوانەی کە زووتر لە ساڵی (٢٠٠٠) گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان لە ناو خووگرتووەکاندا نابینرێن ئەوەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە دواکەوتن لە پرۆسەی گەڕانەوە بۆ کوردستان بۆتە هۆی تێکەڵبوونیان لەگەڵ ئێرانییەکان و لەدەستدانی ناسنامە و سۆز و وەفا و ئینتیما بۆ نەتەوە و خاك و خزم و کەس و کار، هەروەها وەرگرتنی ڕەفتار و داب و نەریتی ئێرانییەکان!

ئەوەی زیاتر سەرنجی توێژەری ڕاکێشا، ((شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا))یانە؛ ئەم پەنابەرانە لە دوای گەڕانەوەیان بۆ کوردستان هەر یەك لە شوێنێك نیشتەجێ بوونە کە زۆربەیان واتە (٧٠٪) لە دیانا (قەزای سۆران)ـە، کە ئەم قەزایە سنووری هاوبەشی هەیە لەگەڵ وڵاتی ئێران و هەر کەسێك بیەوێ

٣٥٩. کارگری، بهروز؛ **مروری تحلیلی بر گزارش آماری واحدهای پذیرش و پیگیری معتادان خودمعرف کشور در سال ١٣٧٨**، مجموعه مقالات دومین همایش ملی آسیب شناسی اجتماعی در ایران: اعتیاد و قاچاق مواد مخدر؛ ج ٢؛ چ٢؛ تهران: نشر آگه (٢٠٠٧)؛ ص٢٥٤.

**هاتوچووی ئێران بکات، دەبێ لەو شارە تێپەڕ بێت. دواتر ڕێژەی (٢٠٪) لە بنەسڵاوە نیشتەجێبوونە کە دەزانین شوێنی نیشتەجێبوونی زۆر لە پانەبەرانی کورد بووە کە لە ئێران گەڕاوەنەتەوە.**

**هەندێ جار ((جۆری نیشتەجێبوون))یش هۆکارێکە بۆ تووشبوونی تاکەکانی کۆمەڵگا بە کێشەیەکی دیاریکراو. ئەگەر بمانەوێ ڕەچاوی جۆری نیشتەجێبوونی ئەو خووگرتووەکان بکەین، دەبینین کە ڕێژەی (٥٠٪)یان کرێچین، و ڕێژەی (٣٠٪) موڵکی تایبەتی، و ڕێژەی (٢٠٪) جۆری نیشتەجێبوون لەگەڵ کەسوکاری خۆی بوە.**

**هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد، پاڵپشتی ئەو هۆکارە جوگرافییە کۆمەڵایەتییانە دەکەن کە مەبەستمانە؛ وەکو: هۆکاری کۆچکردن، هۆکاری دراوسێبوون و هۆکاری نیشتەجێبوونی پێشوو و ئێستا و جۆری نیشتەجێبوون.**

**٢. هۆکارە یاساییەکان:**

**قاچاغی ماددەی هۆشبەر بە هۆی گەشەکردنی تەکنۆلۆژی، باندەکانی مافیایی و دەستە نهێنی، ئێستا بۆتە دیاردەیەکی ئاڵۆز کە ((نەتەوە یەکگرتووەکان)) بە ((تاوانی ڕێکخراو))ی ناوناوە[٣٦٠].**

**تا ئێستا چەندین ڕێککەوتننامە و کونفرانسی نێودەوڵەتی (وەکو: کۆنفرانسی شانگهای چین (١٩٠٩)، ڕێککەوتنامەی لاهای هوڵەندا (١٩١٢)، پەیمانی جنێڤ لە ساڵەکانی (١٩٢٥) و (١٩٣١) و (١٩٧١)، نەتەوە یەکگرتووەکان (نیویۆرک١٩٦١)**

---

٣٦٠. بڕوانە: بوسار، آندره؛ **بزهکاری بین المللی**؛ ترجمه: نگار رخشانی؛ چ١؛ تهران: انتشارات کتابخانەی گنج دانش (٢٠٠٠)؛ ص٧٣-٨١.

و...)[٣٦١] سەبارەت بە مادده هۆشبەرەکان بەستراوە و هەموویان مادده هۆشبەرەکان بە تاوانکاری دەزانن؛ بە تایبەتی ڕێککەوتننامەی کۆتایی ((کونفرانسی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان)) لە ساڵی (١٩٨٤)[٣٦٢] ، هەروەها ((کونفرانسی نێودەوڵەتی مادده هۆشبەرەکان و بازرگانی قەدەغەکراو)) لە ساڵی (١٩٨٧) لە شاری ڤیەننا، کە بەیاننامەیەکیان دەرکرد سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی مادده هۆشبەرەکان کە بە کارهێنان و قاچاغ و بازرگانیکردن و بەرهەمهێنانی مادده هۆشبەرەکان بە شتێکی نایاسایی و زیانبار لە قەڵەم درا[٣٦٣].

بەشێکی گەورەی بەندیخانەکان لە هەموو وڵاتاندا ئەم تاقمە تاوانبارانە دەگرێتەوە، کە یان ئینتیمایان بۆ باندێکی قاچاغچییان هەبووە، یانیش تاکێکی سەربەخۆ و ناڕێکخراو بووە.. بۆیە هۆکاری یاساییش دەوری زۆرە لەسەرهەڵدانی ئەم کێشەیە؛ وەکو:

– نەبوونی یاسای گونجاو بۆ بەرەنگاربوونەوە لە مادده هۆشبەرەکان: (بەرهەمهێنان، کڕین و فرۆشتن، ئامادەکردن، ترانزیت و گواستنەوە، دەڵاڵی، بەکارهێنان).

– لاوازی و کەمتەرخەمیی لایەنە پەیوەندیدارەکان لە جێبەجێکردنی یاساکان؛ بۆیە ئەو وڵاتانەی کە یاسای توندیان هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مادده هۆشبەرەکان، هاوڵاتیانیان کەمتر تووش دەبن و ئاماری تووشبوانیان زۆر کەمترە؛ چونکە یاسا یەکێك لە ئامرازی هەرە گرنگی کۆنترۆڵی ئەندامانی کۆمەڵگایە.

---

٣٦١. بڕوانە: شعبان؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٦٥- ٧٥ ـــ هەروەها بڕوانە: عەلی مورتەزەوی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٦.

٣٦٢. دانش؛ **مجرم کیست، جرم شناسی چیست؟**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٣٧.

٣٦٣. ستودە؛ **آسیب شناسی اجتماعی**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٨٧.

### ٣. هۆکارە سیاسییەکان:

هۆکاری سیاسیش نابێ لە فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان، لە بیر بکەین کە دەتوانین لە دوو ئاستی خودی و بابەتی شی بکەینەوە:

### أ. هۆکارە سیاسییە بابەتییەکان:

#### ١) داگیرکەران:

یەکێك لە هۆکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان داگیرکەران بوون بۆ پاشکەوتن و وابەستەبوون و ڕازی بوون بە داگیرکەران و ئەنجامەکانی و بەرگری نەکردن و بیر لەسەربەخۆیی و ئازادی نەکردنەوە، کە داگیرکەران لە پشت ئەوەدا دەگەنە ئامانجەکانی کە بریتییە لە قۆرغکردنی سەرمایە و سامانی گەڵ و هاوڵاتیان!

یەکێك لە سیاسەتەکانی دەرەوەی وڵاتانی داگیرکەر بۆ دەست بەسەرداگرتنی سەرچاوەکانی سروشتی و ژێرزەویی و زاڵبوون بە سەر وڵاتانی وابەستەدا، بڵاوکردنەوەی تریاك و ماددە هۆشبەرەکان و، تووشکردنی گروپی کارای کۆمەڵگا ( واتە گەنجان و لاوان) بەو ماددانە، کێشەدارکردن و بێلایەنکردنیان سەبارەت بە پرسە نەتەوییەکانە، تاکو بتوانن پەرە بدەن بە بڵاوبوونەوەی خۆیان لەم وڵاتانە دا. ئەزموونە مێژووییەکان ئەوە دەردەخەن هیچ هۆکارێك ئەوەندەی تریاك کاریگەر نییە بۆ لاوازکردن و ڕامکردن و داگیرکردنی وڵات. سیاسەتمەداران

باوەڕیان وایە بۆ زاڵبوون بەسەر نەتەوەکان، کیلۆیەک تریاک و ئۆقە وافورێک* کاریگەریی لە چەندین تانك و هەزاران تۆپ زیاترە.[٣٦٤]

داگیرکەران لە وڵاتانی ژێر دەستی خۆیان، سوودیان لە چەکی ماددە هۆشبەرەکان وەرگرتووە بۆ لە ناوبردنی بەها ئایینی و مەعنەوی و میراتە کولتوورییەکان و سستکردنی بونیادی ئابووری، کۆمەڵایەتی. داگیرکەر بەردەوام بە بڵاوکردنەوە و بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکان لە هەوڵی تێکدانی بەها شۆڕشگێرییەکان و سازێنەری کۆمەڵگای ژێر دەسەڵاتیاندا بوون و بەردەوامیشن لەسەر ئەم کارەیان؛ چونکە داگیرکەران تێدەکۆشن تا بە بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و هەرزانی و بەدەستکەوتنی ماددە هۆشبەرەکان، کولتووری بەرگری و گیانبەختکردن بە کولتووری ملکەچی و کۆیلایەتی بگۆڕنەوە.[٣٦٥]

بۆ نموونە: بازرگانیی تریاك لە لایەن بەریتانیا لە چین، کاتێ داگیرکردنی چین بە ناوبانگە، کە بریتانیای داگیرکەر بە گورزی ماددە هۆشبەرەکان، خەڵکی چالاك و بە جم و جۆڵی چینی کردە کەسانی پاشکۆ و داڕووخاو. دواتر بوە هۆی شەڕ لە نێوان خودی خەڵك لە لایەك و لە نێوان داگیرکەر و بازرگانەکانی تریاك کە لە لایەنگرانی داگیرکەر بوون لە لایەکی دیکەوە، کە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا بە ناوی جەنگی ئەفیون ((حرب الأفيون)) ناسراوە.[٣٦٦]

---

* وافور: ئەو ئامرازەی کە تریاکی پێدەکێشن.

٣٦٤. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل الف.

٣٦٥. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٣٦.

٣٦٦. المغربی، د. سعد؛ **ظاهرة تعاطی الحشيش**؛ ط١؛ بيروت: دار الراتب الجامعية (١٩٨٤)؛ ص١٩.

**٢) بوونی باندەکانی قاچاغ و پشتگیری هەندێ وڵات لە بەرهەمهێنان و بازرگانیکردنی مادده هۆشبەرەکان:**

زۆر لە داگیرکەران لە ڕێگای پێکهێنانی هەندێ ڕێکخراوی مافیا و باندەکانی قاچاغ و ناوەندەکانی بازرگانیان هەوڵی بڵاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکانیان داوە، بە شێوەیەك کە ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی باس لەوە دەکات کە هەندێك ناوچە لە هیند، تایلەند، بەرازیل، پاکستان و ئەفغانستان، بۆ چاندن و بەرهەمهێنانی مادده هۆشبەرەکان تەرخان کراون و قاچاغچییەکانی مادە هۆشبەرەکان بە شێوەی جۆراوجۆر ئەو ماددەیە بۆ سەرتاسەری جیهان دەگوازنەوە، کە زۆر جار دەستی یەکێك لە پیاوانی دەسەڵات یان بەرپرسێکی دەوڵەتی تێدایی. جێگای سەرسوڕمانە کە کەنارێکی گچکەی وەکو "هۆنگ کۆنگ" نزیکی دە هەزار شوێنی بەکارهێنان و کێشانی مادده هۆشبەرەکانی هەیە، لەو کەنارە ڕۆژانە (٣٥) کەس بە تاوانی قاچاغی مادده هۆشبەرەکان گیراون و لە سەدا حەفتای بەند کراون.[٣٦٧] یان لە وڵاتێکی وەك "ئەفغانستان"، بۆ نموونە لە ساڵانی (١٩٩٧ و ١٩٩٨)، ڕێژەی بەرهەمی مادده هۆشبەرەکان گەیشتە (٤٨٠٠) تەن کە داهاتەکەی نزیکەی ٢٥ ملیارد دۆلار بووە.[٣٦٨]

لە توێژینەوە ئەنجامدراوەکان دەرکەوتووە کەوا (٥٦) حاڵەت بوونی باندە سووخۆرەکان قاچاغچی و (٩٣) حاڵەتیشیان سیاسەتەکانی داگیرکاری بە هۆکاری تووشبوون بە مادده هۆشبەرەکان دەزانن.[٣٦٩]

---

٣٦٧. أردوبای، احمد صبور؛ **گسترش جهانی اعتیاد**؛ چ١؛ تهران: انتشارات کیهان (٢٠٠٠)؛ ص١٢٥.

٣٦٨. هاشمی، د. علی؛ **مواد مخدر: بحران اجتماعی و تهدید علیه امنیت ملی**؛ چ١؛ تهران: دبیرخانه ستاد مبارزه با مواد مخدر (٢٠٠٣)؛ ص١١.

٣٦٩. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٢.

**٣) دژایەتی نەتەوەیی:**

بۆ نموونە لە ((ئێران)) دەبینین کە مادەی هۆشبەر لە هەموو شارەکانی دا تاوانکاریەکی گران و سزایەکی گرانیشی هەیە، بەڵام لە ((کوردستانی ئێران))دا جۆرێك لە نەزانی و ئاسانکاری و چاوپۆشین دەبینرێ و ئازادییەکی ئەوتۆ هەیە لە بەکارهێنان و کڕین و فرۆشتن و بازرگانی کردنی ئەم جۆرە माددانە کە وای لێهاتووە گەنجەکانی کوردی ئێران کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە یەکەمەکانی زانکۆکانی تاران بوون و ناومان لە ناو ڕۆژنامەکانی ئێرانی دەدیت و ڕوحی نەتەوایەتییان بەهێز بوو، ئێستا تووشی ئەو نەخۆشییە تێکدەر و لاوازکەرە بوونە و لە ژێر دیوارەکان و چوارڕێیەکانی سنە و مەهاباد و بۆکان و... بێکار دەسووڕێن و دەجولێن و بە دوای ئەم ماددانە دا وێڵن. کاتێ کە سەردانی چەند خووگرتوومان کرد کە لە ئاسایشی هەولێر گیرا بوون، یەکێك لەوان ئاشکرای کرد کە ((اطلاعات))ی ئێران – دەزگایەکی ئەمنییە – ڕایسپاردم کە ((تریاك)) لە ئێرانەوە بۆ کوردستان بهێنم و مانگانە موچەیەکی دیاریکراوم بدەنێ* !

**٤) شەڕ و تەنگژەی سیاسی:**

شەڕ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی نەگونجاوە کە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی ئابووری و لە ئەنجامیشدا هەژاری؛ هەژاریش بە نۆرەی خۆی هۆکارێکی ڕێخۆشکەرە بۆ پەلکێشبوونی تاکەکان بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان. لە توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی دوو سەدەی دوایی دەردەکەوێت کە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکانی وەك هیرۆیین و مۆرفین لەو کاتانەی کە شەڕ لە وڵاتێکدا هەیە، زیاد دەبێت و ڕێژەی خووگرتووان بەرز دەبێتەوە؛[٣٧٠] وەکو شەڕی لوبنان

---

* ئەم چاوپێکەوتنە لە ڕێکەوتی (٢٠٠٩/١١/١٣) لە زیندانی ئاسایش گشتی هەولێر ئەنجام دراوە.

٣٧٠. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٥-٤٦.

و ئیسرائیل، یان شەڕی ناوخۆی لوبنان کە لەو کاتە مادده هۆشبەرەکان بە شێوەیەکی مەترسیدار بڵاو بوونەوە.[371] یان وەکو شەڕی ئەمریکییەکان لە گەڵ ڤێتنام کە لە ساڵی (١٩٦٤)ـەوە دەستی پێکرد و تا (١٩٧٣)ی خایاند، دەزگای CIA لەگەڵ ڕیکخراوە مافییەکانی ئەمریکا دەست بە بڵاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکانی کرد لە نێوان شەڕکەرەکانی ڤێتنامی کە لە ئەنجامدا خودی سەربازە ئەمریییەکانیشی گرتەوە کە ئاسەواری خووگرتن چەندین ساڵ لە دوای تەواو بوونی شەڕیش هەر ماوە.[372]

**ب. هۆکارە سیاسییە خودییەکان:**

**١) تەنگژەی فەزای کراوەی سیاسی، نەبوونی ئاسایش و متمانە بە حکومەت و لاوازی ڕەوایی ڕژێم:**

تاکەکانی کۆمەڵگا بە تایبەتی لاوان دەبێ هەست بکەن کە بوونیان بۆ کۆمەڵگا پێویستە و مافی بەشداریی و ڕا و سەرنجیان هەیە. ئەگەر ئەندامانی کۆمەڵگایەك هەست بکەن حکومەت بۆ بوونیان هیچ بەهایەك دانانێت، ئیتر متمانەیان بە حکومەت نامێنێت و سەرپێچکار، دوورەپەرێز و کاردانەوەیان دەبێت و پەیوەندیی نێوان تاکەکان و ڕژێمی سیاسی بەرەو لاوازی دەڕوات. لە ڕاستیدا ئەو کاتەی شەرعییەت و ڕەوایی حکومەت دەکەوێتە بەرپرسیارییەوە، هاوبەندی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و ڕژێمی حکومەت لاواز دەبێت. هەروەها لەبەر ئەوە تاکاکان توانای ڕووبەڕوو بوونەوەیان لەگەڵ ڕژێمی حاکمدا نییە، بۆ

---

٣٧١. شلالا، نزيه نعيم؛ **دعاوى المخدرات**؛ ط ١؛ بيروت: منشورات الحلبي الحقوقية (٢٠٠٤)؛ ص ٦.

٣٧٢. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٠.

ڕەخنەگرتن لەو بارودۆخە دژی خۆیان دەوەستنەوە و لەم بارەدا زەمینەکان لەبارن بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.[٣٧٣]

**٢) زاڵبوونی گروپە کەمایەتییەکان لە کۆمەڵگا:**

ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا زاڵبوونی کەمینەیەك بە سەر زۆرینەیەکدا، ببێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و گروپی زۆرینە، توانای ڕووبەڕووبوونەوەیان نەبێت لەگەڵ کەمینە، لە بەرامبەر ئەم نادادپەروەرییە سیاسییە کۆمەڵایەتییە ئابوورییە دا کاردانەوەیان دەبێت و ئەگەر پارتێکی سیاسیی بەهێز یان ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەت لەو کۆمەڵگایەدا ئامادە نەبێت بۆ گۆڕینی بارودۆخەکە، هەندێکیان بۆ ڕزگاربوون لەم بێبەشییە سیاسییە ئابوورییە و کۆمەڵایەتییە، ڕوو دەکەنە مادده هۆشبەرەکان، تاکو بۆ ماوەیەك لەم واقعیەتە تاڵە کە زاڵە بە سەر کۆمەڵگادا دوور کەونەوە. ئاشکرایە کە دووبارەکردنەوەی ئەم کارە لە لایەن تاك سەر دەکێشێت بۆ خووگرتن. نموونەی زیندوویی ئەم پرسە لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا، بوونی ڕەش پێست و سوور پێست (واتە: هیندییە سوورەکان)ی خووگرتوو بە مادده هۆشبەرەکان ژمارەیان لە سپی پێستە خووگرتووەکان زیاترە لەو کۆمەڵگایەدا.[٣٧٤]

**٤. هۆکارە ئابوورییەکان:**

مەبەست لە هۆکارە ئابوورییەکان تەنیا بریتی نییە لە تەنگژە و ئابلۆقەی ئابووری و یان پێشنەکەوتنی پیشەسازی و...، بەڵکو زیاتر جەختمان لەسەر کاریگەریی هەژاری و نەداری و دەوڵەمەندی لەسەر خووگرتن بە مادده

---

٣٧٣. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٥.

٣٧٤. فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٧٥.

هۆشبەرەکان؛ چونکە خووگرتن لە ناو هەموو توێژ و چینە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبینرێت:

**أ. هەژاری و دەوڵەمەندی:**

لە بەشەکانی پێشوودا، باسمان لە تیۆریی "ئانۆمی کۆمەڵایەتی" لە ڕوانگەی دۆرکایم و مێرتونەوە کرد کە لە ئاستی قەبەدا جەختیان دەکردە سەر ئەوەی کە لە کاتێ تەنگژە و قەیرانەکاندا، مەودای نێوان هەژار و دەوڵەمەند زۆر دەبێت و کۆمەڵگا لەو کاتە دا تووشی بەرەڵایی و بێسەروبەری و بێپێوەریی کۆمەڵایەتی دەبێت و ڕێژەی تاوان و لادانەکان لەو کۆمەڵگایانە دا بەرز دەبێتەوە.

بینرواە کە ژمارەیەك لە خووگرتووانی هەر کۆمەڵگایەك کەسانێك کە نەدارن و ئەمەش بەو مانایە نییە کە لە نێوان نەداری و خووگرتن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە؛ چونکە لە هەر کۆمەڵگایەکدا ژمارەیەکی زۆر خەڵك نەدارن کەچی خووگرتو نین. بە شێوەیەکی ئاسایی لەپاڵ نەداریدا، پرسەکانی تری ژیان وەك نەخۆشییەکانن کە تاکە نەدارەکان بۆلای خووگرتن ڕادەکێشێت. لە توێژینەوەکاندا، (٨٠) جار داکۆکیان لە کاریگەریی نەداری لە بواری خووگرتن کردۆتەوە. بەڵام تاکی دەوڵەمەندیش لەبەر چێژوەرگرتن و تاقیکردنەوە و زێتەڵی و زانینخوازی، تووشی خووگرتن دێت و هەندێك جاریش لە ڕووی فەخرکردن بە سەر خەڵکدا ئەم کارە دەکات؛ هەروەکو لە ڕابردوودا بە گوێرەی پلەکەی، جۆرێکی تایبەتی جگەرە دەکێشێت؛[٣٧٥] کەواتە دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکان بە هۆی هەبوونی ئیمکانیات و پارە و سامانی باش، لە پێناو لەززەت و خۆشگوزەرانی و چێژوەرگرتن، بە تایبەتی لە کاتێ میوانداری بۆنەکان زیاتر بەرەو ماددە هۆشبەرەکان دەچن. هەروەها هەژار و نەدارەکانیش کە زۆر جار

---

٣٧٥. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٢.

قاچاغچییەکانی ماددە هۆشبەرەکان بۆ بەکارهێنانیان لە دابەشکردن و کڕین و فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکان، تووشی خووپێوەگرتن دەکەن و دەبنە قوربانی ئامانجەکانیان؛[376] بەپێی ئەو توێژینەوانەی کە لە ساڵی (١٩٩٧) لە لایەن دەزگای چاودێری ماددە هۆشبەرەکان سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجام دراون، دیاردەی خووگرتن لە وڵاتە هەژارەکانی وەك ئەفریقیا زۆر کەمتر دەبینرێت بە نیسبەت لە وڵاتانی پێشکەوتوو و سەرمایەداری وەك ئەمریکا و سوید و هوڵەندا و ئەوانی تر. بەپێی ڕاپۆرتی دەزگای ناوبراو، لە ئەمریکا هەر قوتابییەك ـ لانی کەم ـ یەکجار بۆ خۆشی و چێژوەرگرتن و زێتەلی و تاقیکردنەوە، جۆرێك لە ماددەی هۆشبەری بەکار هێناوە.[377]

**ب. بێکاری وەك دیاردەیەکی ئابووری:**

بێکاری و نەبوونی پیشە، دوو ڕەهەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە کە لێرە مەبەستمان زیاتر لە نەبوونی داهاتە کە یەکێك لە هۆکارە ئابوورییە گرنگەکانی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان دەژمێردرێت. داهات بریتییە لە بڕی ئەو سەرمایەیەی کە تاکەکەس دوای ئەنجامدانی هەندێك چالاکیی عەقڵی و بازوویی بە دەستی دەهێنێت. هەروەها یەکێك لە هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتیی گرنگ و بنەڕەتی دادەنرێت لە دیاریکردنی پێگەی تاکەکەس و چینی کۆمەڵایەتی، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر باری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و هزریی تاکەکان.[378]

---

٣٧٦. دانش؛ مجرم کیست؟ جرم شناسی چیست؟؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٧٩.

٣٧٧. دانش؛ معتاد کیست؟ مواد مخدر چیست؟؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٩.

٣٧٨. الحسن، احسان محمد وآخرون؛ **الطبقة الاجتماعية**؛ ط١؛ موصل: مطابع جامعة الموصل (١٩٨١)؛ ص١٠٣.

بەپێی ئەنجامی توێژینەوەکان، بێکار ناچارە بە جۆرێك گوزەران بکات و دەبێت بۆ گوزارانیشی داهاتێکی هەبێت. لەبەر ئەوەی وەها داهاتێك لە ڕێگا و شێوازەکانی ڕاست و یاسایی دابین نابێت، واتە تاك ئامرازی گەیشتن بە ئامانجی لە دەستدا نییە، بۆیە سەری لێدەشێوێت و زەمینەی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان زیاتر دەبێت. لە زۆربەی کاتدا ئەم جۆرە کەسانە ڕێگا نایاساییەکان بۆ بە دەستخستنی داهات هەڵدەبژێرن؛ واتە لە ڕێگای دزی یان خراپەکاری خەریکی دەستخستنی داهاتن و هەر لێرەشە کە گریمانەی بوون بە ئەندامی باندێکی قاچاغکردن و مادده هۆشبەرەکان بەهێز دەبێت.[٣٧٩]

**ج. قەیران و تەنگژەی ئابووری:**

قەیرانی ئابووریش کە بە هۆی ئابلۆقەی ئابووری یان زۆر جاریش لە دوای شەڕەکان دروست دەبێت و دەبێتە هۆی هەژاریی خەڵك، خۆی لە خۆیدا دەبێتە فاکتەرێکی یارمەتیدەر بۆ مادده هۆشبەرەکان.[٣٨٠]

سەبارەت بە هۆکارە ئابوورییەکان، ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەش نیشان دەدەن کە: ڕێژەی (٦٠٪) تاکەکانی خووگرتوو، داهاتی مانگانەیان بەر لە هاتنیان بۆ بەندیخانە، لە نێوان (١٥٠٠٠٠–٤٩٩٠٠٠) دینار بووە. ڕێژەی (٣٠٪)یش داهاتی مانگانەیان لە نێوان (٥٠٠٠٠٠–٩٩٩٠٠٠) دینار بوە. ڕێژەی (١٠٪)یش داهاتی مانگانەیان لە نێوان (٣٥٠٠٠٠–١٤٩٠٠٠) دینارە. لێرەدا دەردەکەوێت کە داهاتی مانگانەیان لاوازە بۆ قەیرانی ئابووریی ئێستا بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە زۆریشیان کرێچین؛ ئەوەش دەکرێ بە فاکتەرێکی یارمەتیدەر بۆ مادده

٣٧٩. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٣.

٣٨٠. فرجاد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل١٥٩.

هۆشبەرەکان دابنرێت؛ هەر وەك کۆمەڵناسان بڕوایان وایە کە هۆکاری هەژاری یەکێکە لە هۆکارە هەرەگرنگەکانی زۆر لە تاوانەکان و کێشە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان.

هەروەها لە دوای پرسیارێك کە: (پێتان وایە چ کەسانێك زیاتر تووشی ئەم ماددانە دەبن؟)، وەڵامی هەر هەموویان (واتە ١٠٠٪) بریتی بوو لە:"گەنجان". دواتر ئەم پرسیارە ئاراستەیان کرا: (بۆ چی؟) کە ڕێژەی (٢٥٪)یان فاکتەری "بێکاری" و ڕێژەی (١٣.٠٩٪)یش هۆکاری "هەژاری" و ڕێژەی (٢.٠٧٧٪)یش فاکتەری "دەوڵەمەندی" بە هۆکاری تووشبونی گەنجانی کوردستانیان زانی.

**٥. هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان:**

پێشتر باسمان لە هەندێ هۆکاری کۆمەڵایەتی لە ئاستی ناوەندیدا کرد؛ وەك: خێزان و گروپی هاوتەمەن و قوتابخانە و ڕاگەیاندن کە هەموویان ــ ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ــ کاریگەرییان هەیە لەسەر پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی تاکەکان. لێرە باس لە هەندێ فاکتەری کۆمەڵایەتیی قەبە دەکەین کە ڕۆڵی گرنگ دەبینن لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیی تاك و زۆر جار دەبنە پاڵنەری هەندێ لادان وەکو تووشبون بە ماددە هۆشبەرەکان:

**أ. بێکاری وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و جۆری پیشە و ژینگەی کار:**

هەبوونی کار و پیشە دەبێتە هۆی دروستبوونی جۆرێك لە ئارامی و ئاسایشی دەروونی کە ڕێگە دەگرێ لەسەرهەڵدانی نەخۆشی و کێشە دەروونییەکان.[٣٨١]

---

٣٨١. کوکرین، ريموند؛ **مبانی اجتماعی بیماریهای روانی**؛ ترجمە: منوچهر راستینی؛ چ١؛ تهران: انتشارات رشد (١٩٩٨)؛ ص١٩٥.

لەبەر دروستبوونی فشارە ئابوورییەکانی بێکاری و هەروەها بوونی کاتی دەستبەتاڵی کە زۆر جار لە ئەنجامی کەمیی ناوەندەکانی پەروەردەیی، بە سەرگەرمییە ناتەندروست و گومڕاکەرەکان پڕ دەکرێنەوە، لە هۆکارە زۆر کاریگەرەکان دادەنرێت بۆ ڕاکێشانی هاوڕێیانی ناکەس کە زەمینەسازی خووگرتن دەرەخسێنن. بێکارانی نەدار بۆ دەستکەوتنی کار لە ماددە هۆشبەرەکان نزیك دەکەونەوە، بەڵام بێکارانی دەوڵەمەند بۆ خۆشڕابواردن لە دانیشتنەکاندا ماددە هۆشبەرەکان بەکاردێنن. لەو توێژینەوانەی کە ئەنجامدراون (٧٠) حاڵەتیان داکۆکیان لە کاریگەریی بێکاری کردووە بۆ ڕووکردنە ماددە هۆشبەرەکان.[٣٨٢]

بەپێی توێژینەوە ئەنجامدراوەکان هەر کاتێك لاوان بێکار بن و کەمتر چاودێری بکرێن، زیاتر حەزیان دەچێتە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان. بێکاری جگە لە نەبوونی داهات، دەبێتە هۆی هەلی زیاد و کاتی دەستبەتاڵیش. کاتێك تاکەکانی کۆمەڵگا بە تایبەتی لاوان کاتی دەستبەتاڵی زیاتریان هەبێت، ئەم هەلانە ـ بە هۆی نەبوونی پێداویستی و کەلوپەلی پێویست کە ئەنجامێکی لاوازی سیستەمی ئابووریی کۆمەڵگایە ـ لە بوارەکانی ڕاست و دروست سوودیان لێ وەرنەگرێت، بۆ بەتاڵکردنەوەی هەڵچوون و پاڵەپەستۆیی دەروونیی خۆیان، بێگومان پەنا بۆ ڕێگای نایاسایی، دژە کۆمەڵایەتی و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان دەبەن.[٣٨٣] زۆر جاریش لەبەر بێکاری و پڕکردنەوەی کاتی دەستبەتاڵیی خۆیان تووشی قاوەخانەکان و هەندێ برادەری خراپ دەبن کە بۆ لای تاوان و خراپەکاری و لەوانەش ماددەی هۆشبەریان دەبەن.[٣٨٤]

---

٣٨٢. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٢.

٣٨٣. دیوانی، امیر؛ **مواد مخدر کمندی بر سر جوانان و نوجوانان**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠١)؛ سال ٣؛ شماره ٢٠؛ ص١٧٢.

٣٨٤. گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ٥٠.

جۆری ((کار و پیشە)) و ((ژینگەی کار))یش پەیوەندی بە مەیل یان بێ مەیلی بۆ ماددە هۆشبەرەکان هەیە؛ ئەگەر چی ناکرێ بڵێین: ئەوە یاسایەکە و دەبێ گشتگیر بکرێ!

هەندێ جار تاك لە ڕووی ناچارییەوە بۆ گوزەرانی ژیان پەنا دەباتە هەندێ کار کە هیچ حەزی لێی نییە و لە ڕووی جەستەیی و دەروونی و مەیل و زەوق و ئامادەگییەوە ڕازی نییە، کە دەبێتە هۆی ماندووبوون و نەخۆشیی دەروونی. کاری یەکجۆر کە هەموو ڕۆژ وەکو یەك دووبارە دەبێتەوە، ژینگەی قەرەباڵغ و پڕ لە دەنگ، کاری شەوانە، کاری سەخت و دژوار، شێوازی مامڵەی بەرپرس و باڵادەست و هاوکاران کە وا لە کەسی کرێکار دەکات لەپێناو گەڕاندنەوەی ئارامیی دەروونی پەنا بباتە جگەرە و ئەلکهۆل و ماددەی تری هۆشبەر؛[٣٨٥] هەر وەکو شۆفێرەکان بۆ ڕەواندنەوەی خەویان، ماددە هۆشبەرەکان بەکار دەهێنن، کە دواتر وردە وردە خووی پێوە دەگرن. یان وەرزشکاران بە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرە وزە بەخش و چالاککەرەوەکان لە کاتێ کێبەرکێ وەرزشییەکان ڕوو لە ماددە هۆشبەرەکان دەکەن.* هەڵبەتە ئەمەش بەو مانایە نییە کە وەرزش یان کارێکی تر ڕاستەوخۆ هۆکارن بۆ خووگرتن بەو ماددانە، هەر وەکو خودی وەرزش هۆکار نییە بۆ خووگرتن بەو ماددانە بەڵکو ڕەتیشی دەکاتەوە. ئەوەی گرنگە، ئەو ژینگەیەیە کە وەرزشی تێدا ئەنجام دەدرێت و ئەو ئامانجەیە کە وەرزشی بەدی دێنێت.[٣٨٦] یان تاکەکانی خووگرتوو لە چینە بەرزەکان و خۆشگوزەران دا زیاتر گورانیبێژ و موزیسیەنەکان و ئەوانەی مۆزیکژەنن، هەروەها هەندێ لە هونەرمەندە ئاست نزمەکان پێکدەهێنن، بە تایبەتی ئەگەر

---

٣٨٥. دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٤-١٢٥.

* نموونەی ئەو وەرزشکارانە دەتوانین "دییەگۆ مارادۆنا"ی ئەرژەنتینی ناو ببەین کە بە هۆی خووگرتن بە ماددەی کۆکایین و ئەلکهۆل چەندین جار کەوتە نەخۆشخانە و لە مەیدانی وەرزشی دوور کەوتەوە!

٣٨٦. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٣.

لەو کۆمەڵگایەدا، ((هونەر بۆ هونەر)) بێت، نەك لە خزمەتی خەڵك و کۆمەڵگا! کە نموونەی ئەو جۆرە هونەرمەندانە لە ساڵی (٢٠٠٦) لە رۆژنامەکانمان بینی کە چۆن بە هۆی ماددە هۆشبەرەکان لە شاری سلێمانی گیراون![٣٨٧]

لە توێژینەوە ئەنجامدراوەکاندا، دەرکەوتووە (٢٤) حاڵەتیان هەبوونی پەیوەندی پیشەکانی خووهێنەر بە هۆکاریان زانیوە بۆ تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان.[٣٨٨]

**ب. نایەکسانی و نەبوونی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی:**

هەبوونی نابەرابەری و نایەکسانی، واتە بوونی بەربەست لە نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان یەکێك لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی تووشبونە بە ماددە هۆشبەرەکان؛ بۆ نموونە لە ئەمریکا بە هۆی جیاوازی چینایەتی، رێژەی ماددە هۆشبەرەکان و خووگرەکان لە هەموو وڵاتێك زیاترە.[٣٨٩] ئەنجامی توێژینەوەکان باس لەوە دەکەن کە بوونی نایەکسانییەکان لە هەر کۆمەڵگایەکدا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی. ئەو کاتەی داهاتەکان بە شێوەیەکی نایەکسان دابەش دەکرێن، هەژاران تا دێت هەژارتر و دەوڵەمەندانیش دەوڵەمەنتر دەبن و، جیاوازییە چینایەتییەکان زیاتر دەبێت و کەسانێك کە ناتوانن دژی ئەم نادادپەروەرییانە بوەستنەوە، هەست بە بێبەشبوون دەکەن و هەروەك لە بەشی پێشوودا باسمان لە تیۆری مێرتون کرد، دوورەپەرێز دەبن و زەمینە خۆش دەبێت کە زیاتر ڕوو لە ماددە هۆشبەرەکان بکەن.[٣٩٠]

---

٣٨٧. بڕوانە: محەمەد، فائیز ئیبراهیم؛ **خووپێوەگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان**؛ چ١؛ هەولێر: بنکەی توێژینەوە (٢٠٠٧)؛ ل٥٤.

٣٨٨. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٣.

٣٨٩. فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٥٧.

٣٩٠. ستودە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٩٧-٩٨.

**ج. نەبوونی سەرگەرمی و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی:**

نەبوونی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری پێویست و گونجاو و تەندروست، شوێنەکانی ڕابواردن و سەرگەرمی و وەرزشی بۆ پڕکردنەوەی کاتی دەستبەتاڵی خەڵك بە تایبەتی گەنجەکان، یەکێك لە هۆکارە کۆمەڵایەتییە هەرە گرنگەکانی تووشبونە بە ماددە هۆشبەرەکان. هەروەك مرۆڤ پێویستی بە خۆراك و پۆشاکی هەیە، بە هەمان شێوە پێویستی بە خۆشگوزەرانی و ئامرازێك هەیە کە ماندوویێتی لێ بەرێتەوە. نەبوونی سەرگەرمیی پێویست و گونجاو بۆ چەندین کاتژمێر یان چەند ڕۆژێك، خۆی لە هۆکارەکانی سازێنەری جۆرەها ناپێوەری و لادانن؛ چونکە بۆ ئەوەی تاك خەریکی شتێك بێت و کاتەکانی بە سەر ببات، بەپێی کات و شوێن هەندێك کار ئەنجام دەدات. لێرەدایە ئەگەر کۆمەڵگا بەدەست نەبوونی خۆشگوزەرانی تەندروستەوە بناڵێت، تاك لەوانەیە ڕوو بکاتە خۆزشگوزەرانیی ناتەندروست وەك خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان؛[391] هەروەکو لە توێژینەوە ئەنجامدراوەکان دەرکەوتووە کە (٣٨) حاڵەت باسیان لەم بابەتە کردووە سەبارەت بە خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان.[392] بە هەر حاڵ ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە سەرگەرمیی ناتەندروست، مرۆڤ بۆ کاری ناتەندروست ڕادەکێشێت. "فرانسیس دۆگە" دەڵێت: پێم بڵێن کاتەکانت چۆن بەسەر دەبەیت تا پێت بڵێم تۆ کێی و منداڵەکانت چۆن پەروەردە دەکەیت![393]

---

٣٩١. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٤.

٣٩٢. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٢.

٣٩٣. اورنگ؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١١٨.

**د. ژیانی ماکینەیی و گەشەکردنی لە ڕادەبەدەری تەکنۆلۆژیا:**

ئەمڕۆکە جیهان بۆ مرۆڤ بۆتە شوێنێکی تەنگ و پڕ لە گرفت و کارەسات و کەمبوونەوەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ بە توندییەکی هەرچی زیاتر هەڕەشە لە مرۆڤ دەکەن. مرۆڤی هێمن و لەسەرخۆی ڕابردوو، ئێستا بۆتە کۆیلەی پیشەسازی (تەکنەلۆژیا و ماددەگەرایی) کە مرۆڤایەتی لە بیر چۆتەوە و بۆ خۆی جیهانێکی پڕ لە فشار و دەرد و ڕەنج، بەتاڵ لە هەر سۆزێکی مەعنەوی بینا کردووە،[394] کە هەر کاتێك بۆ ڕزگاربوونی لە فشارەکان، پەنا بۆ خواردنەوەکانی ئەلکهۆلی، حەشیش، مادده هۆشبەرەکان، دوکەڵییەکان و مادده خەیاڵسازەکان دەبات، تاکو بۆ ساتێکیش دڵیان ئارام بگرێت.

بە ڕەچاوکردنی قەیران و شڵەژانی کۆمەڵگا پیشەسازیەکانی ئێستا هەروەك "پیتریم سۆرۆکین" ـ کۆمەڵناسێکی ڕوسییە ـ ئاماژە دەکات کە کۆمەڵگاکان یەکێك لە فاکتەرەکانی چوونە ناو سەردەمی ((هەستی/ Sensate))، کەمی یان تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆییە؛ ئەو کات کە ـ بەپێی بۆچونی ئەو ـ ئیدئۆلۆژی (بیروباوەڕ و عەقیدەی مەعنەوی) بە فەرامۆشی دەسپێردرێت و ((شت سەروەری و ماددەسالاری/ Reification )) جێگای هەموو شتێك لە ناو کۆمەڵگا دا پڕ دەکاتەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی ((بەهای مرۆیی)) بە ((شت و مادده)) یان ئەو کات کە تووشی ((نامۆبوون/ Alienation)) دەبێت و خودی خۆی لە بیر دەکات، لێرەیە کە گەیاندن و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆیی هەموو دەبێتە پاشکۆی هەندێ پێوەری وەکو ((بەرژەوەندیگەرایی/ Pragmatism)) و ((ماددیگەرایی/ Materialism)) و

---

٣٩٤. بڕوانە: کاریل، ألکسیس؛ **الإنسان ذلك المجهول**؛ ترجمة و تحقيق: شفيق أسعد فريد؛ ط١؛ بيروت: مؤسسة المعارف للطباعة و النشر (٢٠٠٣)؛ ص ٣١-٥٨.

((سوودگەرایی/ Utilitarianism))؛[395] هەموو ئەوانە دەبنە هۆی زیادبوونی ڕێژەی خووگرتن، تەڵاق، خۆکوژی، داوێنپیسی، تاوان و نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانی تر.

**٦. هۆکارە کولتوورییەکان:**

هۆکارە کولتوورییەکانیش دەتوانن ڕۆڵیان هەبێت لەسەر تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان کە لێرە ئاماژە بە گرنگترینیان دەکەین:

**أ. گۆڕانی خێرای کولتووری و گەڕان لە دوای ناسنامە:**

گۆڕانی خێرای کولتووری و نەگونجانی تاك لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتیی نوێ و گۆڕانکارییەکان و سەرهەڵدانی تەنگژەی ناسنامە، یەکێك لە هۆکارە کولتورییەکانی تووشبونە بە ماددە هۆشبەرەکان. بەپێی توێژینەوەکان، تەنگژەی ناسنامە لەو ڕوویەوە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی خووگرتن و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان؛ چونکە تاك متمانەی خۆی بە پێوەرەکان لە دەست داوە و دەکەوێتە حاڵەتی سەرگەردانی، بێپێوەری و نامۆبوون. بەم شێوەیە تاك دوورەپەرێز دەبێت و ڕوو دەکاتە دنیای کەسی خۆیی و گریمانەی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان زیاتر دەبێت.

**ب. نەبوونی هۆشیاریی مەعریفی و بێئاگایی سەبارەت بە زیانەکانی ماددە هۆشبەرەکان:**

---

٣٩٥. ساروخانی، د. باقر؛ **جامعەشناسی ارتباطات**؛ چ ١٥؛ تهران: انتشارات اطلاعات (٢٠٠٦)؛ ص ٢٦.

یەکێك لە هۆکارە کولتوورییەکانی تووشبون بە ماددە هۆشبەرەکان نەبوونی هوشیاری کۆمەڵگا لەسەر ماددە هۆشبەرەکان و ئاسەوارە نێگەتیڤەکانیانە. زۆر لە توێژینەوەکان بە تایبەتی توێژینەوەی خۆمان، تاك بە هۆی بێئاگابوون و نەبوونی هۆشیاری لە سروشتی ماددە هۆشبەرەکان و زیانەکانی هۆکاری تووشبونی خۆی فەراهەمکردووە. لە توێژینەوەکانی ئێرانیدا (٦٥٪) باسیان لەو هۆکارە کردووە.[٣٩٦] لە لێکۆلینەوەی خۆماندا ئەم ڕێژەیە دەگاتە (٨٠٪).

هەروەك لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر پیشان دەدەن، ئەوانەی ئاستی خوێندەواریی بەرزیان هەیە، کەمتر تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن؛ کەواتە نەخوێندەواری یاخود ڕێژەی کەمیی خوێندەواریش هۆکاری بەهێزی خووگرتنە؛[٣٩٧] لە لێکۆلینەوەی خۆماندا بینیومان کە (١٠٪)ی بەندکراوەکانی خووگرتوو نەخوێندەوار و (٤٠٪)یش خوێندنی سەرەتاییان هەبوە.

**ج. ئاڵوگۆڕی کولتووری یان بوونی وردە کولتووری خووگرتن لە کۆمەڵگادا:**

هەروەك لە بەشی پێشودا باسمان لە "تیۆری وردە کولتوور" کرد کە جەخت دەکاتە سەر هۆکاری وردە کولتوور لە نێوان هەندێ گروپی دیاریکراوی کۆمەڵگا دا لەسەر بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان. هەروەك ئاماژەمان کرد کە یەکەمین جار "هاوارد بیکەر" باسی لە کاردانەوەی کۆمەڵگا سەبارەت بە بەکارهێنانی حەشیش و ماریجوانای کرد. بیکەر بینی کە گەنجان بۆ یەکەم جار و لەناکاو بۆ لای ماددە هۆشبەرەکان ناڕۆن و بە کێشانی ئەو ماددانە بۆ یەکەمجار هەست بە سووکی و چالاکی ناکەن، بەڵکو ئەم گروپە لاوەکییانەن کە ئاشنایان دەکات بە ماددەکان و بە پێناسە و زیاترناسینیان لە ڕێگەی ئەندامانی

٣٩٦. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٤٢.

٣٩٧. بڕوانە: فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٥٥-١٥٦.

ئەو گرووپە، پەی بە ماهییەت و کاریگەرییەکانیان دەبەن. لە گرووپدایە کە ماددە هۆشبەرەکان دەناسێت و سوودیان لێوەردەگرێت و بەردەوامیش ڕەفتارەکەی لە ژێر کاریگەریدایە. بەپێی گوتەی بەیکەر تاکی تازەهاتوو لە لایەن گرووپی لاوەکییەوە دووبارە بەکۆمەڵایەتی دەبێتەوە؛ واتە پێوەرەکانی گرووپ فێر دەبێت و دەبێتە بەشێك لە کەسەکە و پێوەرە زاڵەکانی کۆمەڵگا وەلاوە دەنێت.

**د. خووگرتنی کەسایەتییە ناودارەکان:**

کاتێك کە لە ناو کەسە دیار و پلە بەرزەکانی کۆمەڵگا، وەکو کەسایەتییە کولتوورییەکان (هونەرمەندان و شاعیرەکان و وەرزشکاران)، زانستییەکان، سیاسییەکان، ئایینییەکان و پزیشکییەکان دەبینرێت کە دەست بۆ جگەرە یان ئەلکهۆل یان ماددە هۆشبەرەکانی تر دەبەن، کەسە ئاساییەکانی کۆمەڵگاش لە قەبوڵکردنی ئەوە کە بەکارهێنانی ئەم جۆرە ماددانە کارێکی بێهودەیە و دژەبەهایە و زیانبەخشە، دوچاری گومان دەبنەوە و هەر چەندە بەڵگەکانی زیانی بەکارهێنانیان بۆ خۆیان و دەوروبەرەکانیان پرسیارێکی وەها ئاراستە دەکات کە ئەگەر بەکارهێنانی ئەم ماددانە خراپە، کەواتە بۆچی ئەوانە بەکاری دەهێنن؟!

**ه. شیعر و ئەدەبیاتی عیرفانی:**

ئەدەبیاتی عیرفانی و هێماگەرایی شاعیرانی کورد و هەروەها ئێرانی (وەکو مەلای جەزیری و حافز و عومەر خەیام) خاوەن تایبەتمەندیی خۆیانن و ئەو شەیدابوونە تایبەتەی شاعیران لە بەکارهێنانی وشەکانی (مەی، مەیخانە، سەرخۆشی و تریاك) لە شیعرەکانیاندا، کە ڕەهایی و خۆلەخۆچوون و شەیدای جوانیی جیهانی ڕازاوەی پەرستراوە لە وشەی "مەستی"دا کورتیان کردۆتەوە و، گوێپێنەدان بە مەبەستە پاك و بەرزەکانی ئاسمانی و مەلەکوتی ئەم شاعیرانە

بۆتە هۆی ئەوەی کەوا هزری هەندێ لە ژیانی رۆژانەیاندا لە رێگای ڕاست، گومڕا و سەرگەردان بن و لە کاتێکدا دەتوانین بڵێین کە: زۆربەی هەرە زۆری ئەو شاعیرانە لێویان بۆ مەی نەبردووە و خۆیان خەریکی مەستییەکی کاتی نەکردووە؛ هەروەکو کۆچکردوو (محمد علی فروغی) لە پێشەکی چوارینەکانی "عومەر خەیام" دەڵێت: ئەو کەسەی لە چوارینەکانی خەیام ئەوە هەڵدێنجن کە ئەو مەیخۆر یان فاسق بوە، غافڵ و بێئاگایە لەوەی کەوا لە شیعردا زۆربەی جار مەی و مەعشوق بە شێوەکی خوازراو (إستعارە) وتراون. گومان لەوەدا نییە کە مەی بە واتای هۆکارێکە بۆ ڕزگاربوون و بەتاڵبوونەوەی بیرەوەییە تاڵەکان و خۆشوەرگرتن، وازهێنان یاخود سەرنجدانە وردەکارییەکان و هاوشێوەی ئەمانەیە. کاتێك عومەر خەیام بڵێت: کات بە هەل بزانە و مەی بخۆوە کە تەمەن هیچ ئەرزشێکی نییە!، مەبەست ئەوەیە کە ڕێزی کات بگرە و تەمەن بە فیڕۆ مەدە و خۆت گرفتاری پیسییەکانی دونیا مەکە! زۆربەی چوارینەکان کە وەك لێدان دێنە بەرچاو، تانە و توانج و گاڵتەپێکردنە بە خەڵکی کورتبین و وشك و کەللە ڕەق، کە لە هەر حاڵەتێکدا یەك ڕا وەردەگرن و خۆیان لە هەزار ڕای تر دوور دەگرن و کەوتوونەتە ناو خەوی غەفڵەت و نەزانی. دەبێ خەڵکی ئاسایی و تازەفێربوو ئاگایان لەوە بێت کە بە خراپی سوود لە شیعرەکانی خەیام و حافز و هاوشێوەیان وەرنەگرن، وەها گومان بەرن کە ئەو گەورە پیاوانە پەنایان بۆ مەیخواردنەوە و فسق و کوفر و هەڵگەڕانەوە بردووە، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوەیە.[398]

٧. هۆکارە ئایینییەکان:

أ. نەبوونی هۆشیاریی ئایینی سەبارەت بە حەرامبوونی مادده هۆشبەرەکان:

---

٣٩٨. کی نیا؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٢٧.

هیچ شکێك لەوەدا نییە کە ئایین ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە کۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری تاکەکان و بەهێز کردنی کۆنترۆڵی دەروونییان. نەبوونی ئامۆژگاریی ئایینی بە فاکتەرێکی سەرەکی دادەنرێت لە خووگرتن و ئالوودەبوونی ئەو جۆرە ماددانە، هەموو شەریعەتەکانی ئاسمانی ماددە هۆشبەرەکانیان قەدەغە کردووە، بێگومان بوونی ئامۆژگاری ئایینیی ڕاست لە ئامرازە هەرە سەرکەوتووەکانە بۆ ڕاستکرنەوەی مرۆڤ و ڕاستکرنەوەی خێزان و هەموو کۆمەڵگا.[399]

پرۆفیسۆر "پاوڵ پێرین" چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی خووگرتن بە ئەلکهۆل لە وڵاتە مەسیحییەکاندا دەخاتە ڕوو و باس لە یارمەتی ئەو قەشانە دەکات کە ڕۆڵیان هەبوە لە بڵاوکردنەوەی مەیخواردنەوە لە کلێسە دا، بە ناونیشانی مەی پیرۆز و ڕەخنەی توند دەگرێت و قەشەکان بە هۆکاری بڵاوبوونەوەی خووگرتن بە ئەلکهۆل دەزانێت لە ناو نەتەوە مەسیحییەکان.[400]

توێژینەوە هەمەجۆرەکان ئەوە پێشان دەدەن کە باوەڕبوون بە حەرامبوونی ماددە هۆشبەرەکان دەتوانێت هۆکارێکی گرنگ بێت لە پێشگیری لە دیاردەی خووگرتن بەو ماددانە.

نووسەرانی کتێبی "لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی خووگرتن لە ئێران" لە ئەنجامی توێژینەوە دەڵێن:" ئایینیش وەك هۆکارێك بۆ ڕێگەگرتن لە خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان دەژمێردرێت؛ چونکە نیوەی خووگرتووان بە هۆی بێ باوەڕییان، فەرزە ئایینیەکانیان ئەنجام نەداوە و یان جارجار ئەنجامیان داوە؛ بەواتایەکی تر شوێنکەوتووانی ئەو ئایینانەی کە بەکارهێنانی ماددە

---

٣٩٩. مشاقبە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧٣.

٤٠٠. اردوبای، احمد صبور؛ **بررسی فرآوردەهای الکل از نظر فقه اسلامی**؛ چ١؛ قم: دارالتبیلغ اسلامی (١٩٩٥)؛ ص١٥١.

هۆشبەرەکان بەڕەوا دەزانن ئەگەری تووشبوونیان بەو ماددانە زۆر زیاترە".

دکتۆر "پەروێز پیران" لە کتێبەکەیدا دەڵێت: نەبوونی فەتوای حەرامبوونی بەکارهێنانی تریاك لە ڕووی شەرع و جیاوازیی زانا گەورەکان لەم بوارەدا، ئاراستەی حەلاڵبوونی ماددە هۆشبەرەکان دەکات و باری نێگەتیڤی خووگرتن و قەبوڵنەکردنی کۆمەڵایەتی ئەم خووە کەم دەکاتەوە و وەك کارێکی ئەگەرچی نائاسایی، بەڵام نەئەوەندە ناشیرین پێشان دەدات.[٤٠١]

خاتوو "د. سەلوا عەلی سەلیم" لە توێژینەوەیەکدا کە لە نێوان خووگرتووەکانی "میسر" ئەنجامی داوە: ڕێژەی (63.5٪) تاکەکانی توێژینەوە لەو باوەڕە دا بوون کە ماددە هۆشبەرەکان حەرامن، بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ ئامانجی پزیشکییان بەکار بردووە، بە حەلاڵیان زانیوە و (22.5٪) بە ناپەسندی (مکروە) دەزانن و، (14٪) بە حەلاڵی دەزانن.[٤٠٢]

توێژینەوەیەکی "سعودی"ش وادیار دەکات کە ڕێژەی (٧٤٪) سەبارەت بە حەرامبوونی ماددە هۆشبەرەکان بێئاگا بوونە و ڕێژەی (٢٦٪) بە ناپەسەندیان زانیوە.[٤٠٣]

نووسەری سعودیش "عوەییز بن محمد" ئەو باوەڕە هەڵەیە کە ماددە هۆشبەرەکان حەرام نین، بە یەکێك لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان دەزانێت.[٤٠٤]

لە توێژینەوەشماندا بۆمان دەردەکەوێ کە نەبوونی هۆشیاریی ئایینی سەبارەت بە ماددە هۆشبەرەکان، هۆکاری هەرە گرنگی تووشبون بە ماددە

---

٤٠١. پیران؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٣٢.

٤٠٢. سليم، د. سلوى علي؛ **الإسلام و المخدرات**؛ ط ١؛ القاهرة: مكتبة وهب (١٩٨٨)؛ ص ٢٢٢.

٤٠٣. المبحل؛ سەرچاوەی پێشوو.

٤٠٤. ذيابي، عويض بن محمد بن هذال؛ **المخدرات مشكلة ذات أبعاد عالمية**؛ رياض: مكتبة الصفحات الذهبية (١٩٩٣)؛ ص٤٥.

هۆشبەرەکانە. یەکێك لە پرسیارەکانم لە کاتێ سەردانی خووگرتووەکانی بەندکراو لە ئەوە بوو: (ئایا دەتزانی کە ئایین ئەو ماددانە بە حەرام دەزانێ و بە سەختی رێگا لێدەگرێ؟)، کە هەموویان وەلامیان "نەخێر" بوو! واتە (١٠٠٪)یان نەدەزانی کە ئایینی ئیسلام ئەم ماددانە تەنانەت جگەرەش بە حەرام دەزانێ.

**ب. بێئیمانی و لاوازیی پابەندییە ئایینییەکان و بەڵێنە ئەخلاقییەکان:**

بێسەروسامانییەکان، لادان و سەرکەشییەکان، هەموویان باس لە شتێك دەکەن ئەویش دوورکەوتنەوەی مرۆڤە لە خوا و لە ئەسڵی ئیمان؛ چونکە تاکی بێئیمان پابەند نییە بە هیچ بنەمایەك و رێز لە بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان ناگرێت. لاوازیی بنەماکانی ئایینی و سستبوونی باوەڕ بە خوا و ڕۆژی سزا و پاداشت، بۆتە مایەی ئەوەی کە مرۆڤ بە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ کارەساتە نەخوازراوەکان ڕوو بکاتە ماددە هۆشبەرەکان تا چەند کاتژمێرێك بحەسێتەوە.

بەپێی توێژینەوە ئەنجامدراوەکان دەرکەوتووە کە پەیوەندی لە نێوان پابەندبوون و بەشداری لە ڕێوڕەسمی ئایینی و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکاندا هەیە. ئەو گەنجانەی کە مانگی چوار جار دەچنە نوێژی هەینی لە مزگەوتەکان و بەشداری دەکەن لە ڕێوڕەسمی ئایینی، زۆر کەمتر لەوانەی کە مانگی تەنیا یەکجار یان کەمتر بەشداری دەکەن لەو رێوڕسمانە، لەوانەیە بەرەو ماددە کهۆلییەکان و بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەری تر پەلکێش بن.[٤٠٥] لە ڕاستیدا یەکێك لە بەڵگەکانی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە دەستدانی بەها مەعنەوی و ئەخلاقی و بێ ئامانجی مرۆڤە. لەو ڕووییەوە کە ئایین ڕۆڵێکی کاریگەریی هەیە لە ئامانجدارکردنی ژیانی مرۆڤ و هۆکارێکە بۆ دوورکەوتنەوە لە

---

٤٠٥. آبایان، شیوا؛ **علل گرایش به مواد مخدر در نوجوانان و جوانان**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ سال ٢؛ شماره ١٧؛ ص٢٢.

گروپە لادرەکان و کاری خراپ و ناڕێك، هەروەها وەرگرتنی بەها داهێنەرەکانە و بەشداریکردنی تاکەکان لە کۆمەڵگادا، لە کاتێکدا ئەگەر لاوازیی بیروباوەڕی ئایینی لە کۆمەڵگایەکدا دەربکەوێت، زەمینەی سەرهەڵدانی جۆرەها لادان لەوانە خووگرتن بەمادە هۆشبەرەکانیش زیاتر دەبێت.[٤٠٦]

توێژینەوەی "سعودی" سەبارەت بە پابەندی ئایینی خووگرتووەکان پیشان دەدات کە ڕێژەی (٧٧٪) نوێژ ناکەن و (٢٣٪) هەندێ جار دەکەن![٤٠٧]

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەماندا دەردەکەوێ کە ڕێژەی (٤٠٪)یان هیچ پابەندیی ئایینیان نەبوەو ڕێژەی (٦٠٪)یش زۆر کەمە! هەروەها ئەم پابەندییە لە لای دایك و باوك و بنەماڵەیان بەم شێوەیە بوە: ناوەند(١٠٪)، کەم (٨٠٪) و هیچ (١٠٪)، کە ئەوەش زۆر کاریگەریی هەیە لە شێوازی پەروەردە و بە کۆمەڵایەتیکردنی منداڵانیان و بەهێزکردنی کۆنتڕۆڵی دەروونییان. هەروەها لە وەڵامی پرسیارمان (لە کاتێ بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان، لە چ لایەنێك ترس و دڵەڕاوکێت هەبوە؟)، ڕێژەی (١٠٠٪)یان هیچ ترسێکیان لە خوا و ئایین نەبووە!

٤٠٦. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٤.

٤٠٧. المبحل؛ سەرچاوەی پێشوو.

**ئەم وێنەیە ئاستەکانی قەبە، ناوەندی و ورد و پەیوەندی نێوانیان و هۆکارە گرنگەکانی هەر یەك لە ئاستەکان ڕووندەکاتەوە**



## یەکەم. ئاکامەکانی خووگرتن لە ئاستی تاکدا (ئاستی ورد):

### ١. *ئاسەواری جەستەیی:*

ئەگەر خەرجی ڕۆژانەی خووگرێك ڕابگیرێ و لە ١٠ تا ١٢ کاتژمێر تێپەڕێ، ئەوا تووشی کۆمەڵێك نیشانە و ئاسەواری ناخوازراوی جەستەیی دەبێت، وەکو: ناڕەحەتی، دەمارگرژی، دڵەڕاوکێ، بێئارامی، پێکژین، هاتنی ئاو لە لووت و چاو، ئێش و ئازاری ئەندامەکان، فشاری زۆر لە بڕبڕە، سك ئێشە، بێ ئیشتیهایی، ڕەشانەوەی بەردەوام، کز و لاوازبوون، سووکبوونی کێش... دواتر لەرزین و جوڵانی بەهێز دەست پێدەکات و ئەگەر ماددەی پێویست نەگاتێ، ئەم ڕەقبوون و لەرزینەکان بەردەوام دەبێت لە ڕادەیەك کە زۆر جار لەگەڵ ئاسەورای نەخۆشیی گەشکە (صرع) بە هەڵە وەردەگیرێ! ئەگەر ٢ تا ٣ ڕۆژ ماددەی هۆشبەر نەگاتێ، بە تایبەتی ئەوانەی کە لەسەرەتای خووپێوەگرتن دان و لە مێژ نییە تووشبوونە، خووپێوەگرتنەکەی لا دەچێ و نامینێ، بەم مەرجە کە تاك بتوانێ بەرگەی بگرێ![٤٠٨] چونکە نەگەیشتن بە ماددەکان، نیشانە و ئاسەواری هەیە، بەڵام ((مردن و لەناوچوون))ی نییە.[٤٠٩] باشترین نموونە ئەو خووگرانەن کە بەند دەکرێن و لە بەندیخانە دا ناچار دەکرێن کە واز بهێنن و نامرن؛ بەڵام ئەگەر واز نەهێنێ و درێژە بە خووپێوەگرتنەکەی بدات، تووشی هەندێ ئاسەواری نێگەتیڤی جەستەیی دەبێت، لەوانە:

---

٤٠٨. ستودە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٩١.

٤٠٩. فرجاد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٦٠.

### أ. نەخۆشییە جەستەییە مەترسیدارەکان:

#### ١) ئایدز:

بەپێی ئامارە جیهانییەکان، تووشبوون بە ماددەی هۆشبەر لە ڕێگەی دەرزی لێدانەوە، لە ناسراوترین هۆکارەکانە بۆ تووشبوونی تاك بە نەخۆشی ئایدز (HIV)، کە زیاتر لە (١٠٠) وڵاتی جیهان ماددەی هۆشبەر لە ڕێگەی دەرزییەوە بەکاردەهێنرێت و لە (٨٠) وڵاتیش ئاڵودەبوون بە نەخۆشی ئایدز لە ڕێگەی دەرزی دووبارە بەکارهاتوو ڕاگەیەنراوە. توێژینەوەکانی ئەم دواییە لە "ئۆکرانیا" ئەوە دەردەخەن کە (83٪) تووشبووانی بە ڤایرۆسی ئایدز بە هۆی دووبارە بەکارهێنانی دەرزی لێدانی ماددە هۆشبەرەکان بووە لە ناو خووگرتووان. لە "هیند"یش (7٪) خەڵکی (3.7 ملیۆن کەس) تووشی نەخۆشی ئایدز بوون کە زۆربەی هەرە زۆریان لە تووشبووان بە ماددە هۆشبەرەکانن. لە "ئێران" بەپێی توێژینەوە ئەنجامدراوەکان تا کۆتایی مانگی حەوتیساڵی (٢٠٠٠)، ژمارەی (٢٢٠٧) کەس تووشی ڤایرۆسی ئایدز بوون، کە (65٪) تووشبووانی ماددە هۆشبەرەکان بوون.[٤١٠]

#### ٢) هپاتیت یان زەرکی:

ناوەندی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکان ڕایگەیاندووە کە هەر سێ جۆری نەخۆشی زەرکی یان زەردوویی (A و B و C) لە ناو بەکارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەکان زیاتر بڵاو دەبێتەوە و هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سرنجە دووبارە بەکارهاتووەکان و لاوازی سیستەمی تەندروستی.[٤١١] لە لێکۆڵینەوەکەماندا

---

٤١٠. پوراسلامی، محمد و دیگران؛ **اعتیاد، علل، عوارض و پیشگیری**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ سال ٢؛ شماره ١٩؛ ص١٦.

٤١١. هەمان سەرچاوە؛ ل ٥-٦.

دەرکەوت کە ڕێژەی (١٣,٣٣٪)ی خووگرتووەکان شێوازی دەرزی لێدان لە دەماری دەست بەکاریان دەهێنا کە ئەو دەرزییەش لەگەڵ برادەرەکانیان هاوبەش بووە، کە ئەوەش مەترسیی تووشبوون بە نەخۆشیی ئایدز و زەرکی زیاد دەکات!

**٣) سەرەتان و وەستانی دڵ و مێشك:**

نادیاربوونی زۆر لە نەخۆشییە مەترسیدارەکان بە هۆی کەمبوونەوەی هەستی ئێش و ئازار لەبەر بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە لای خووگرتووان شتێکی باوە.[412] تاکی خووگرتوو بە تایبەتی ئەوانەی کە چەندین ساڵە بە بەردەوامی یەکێك لە ماددە هۆشبەرەکان بەکاردەبات، تووشی جۆرەها شێرپەنجە و سەرەتانەکان هەروەها وەستانی دڵ یان مێشك دەبن؛ تەنانەت ئەوانەی کە جگەرە دەکێشن، بەپێی ڕاپۆرتی "ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی" بیست ساڵ زووتر دەمرن.[413]

**ب. نەخۆشییە جەستەییە ئاساییەکان:**

بەپشتبەستن بە سەرچاوەکان، دەتوانم هەموو ئەو نەخۆشییە ئاساییەکان کە لە ئاکامی خووپێوەگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان دروست دەبن، بە شێوەی خوارەوە دەستەبەندی و خاڵبەندی بکەم:

**١) نەخۆشییەکانی دەم و ددان:**

- زەرد بوون و ڕزینی ددانەکان.

---

٤١٢. أحمد علي طه؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٥.

٤١٣. شیخاوندی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٥٦.

- هەوکردنی دەم و لێو.
- کەمبوونەوەی دەردانی ئاوی لیکە ڕژێنەکانی ناو دەم.
- نەمانی هەستی تامکردن.
- بۆنی نەخۆش لە دەم.

**٢) نەخۆشییەکانی هەناو:**

- بە مۆمبوونی جەرگ (التشمع فى الكبد). واتە ناتوانێ ئەنزیمی پێویست بڕێژێنێت.
- زەردووی و کەمبوونەوەی ڕژێنەکانی ناو پەنکریاس.
- هەوکردن و برینی گەدە و ڕیخۆڵە.
- سکچوون و قەبزبوون.
- ڕشانەوە و دڵ تێکهەڵاتن.
- بێهێزی و لاوازیی لەش و کەمبوونەوەی کێشی جەستە.
- سک ئێشان.
- بێ ئیشتیهایی و بەدخۆراکی.
- تێکچوونی هۆرمونەکان.

**٣) نەخۆشییەکانی کۆئەندامی گورچیلە و میزەڕۆ:**

- نەزۆکی بۆ پیاو و ئافرەت و لە بارچوون لە ژنان.
- کەمبوونەوەی ئارەزووی سێکسی.
- هەوکردن و ئاوسانی گورچیلەکان و کەموکورتی لە پاڵنانی میز.
- سووتانەوەی کۆئەندامی دەرەوەی میز.

**٤) نەخۆشییەکانی دڵ و خوێن:**

- تێکچوونی لێدانی دڵ.
- قەپاتبوونی دەمارەکانی دڵ.
- پەستانی خوێن.

**٥) نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسە:**

- هەوکردنی درێژخایەنی لووت و گەروو.
- پژمین و ئاو هاتنەخوارە لە لووت بە بەردەوامی.
- برۆنشێتی مزمن*.
- ئاسم** و تەنگەنەفەسی.
- نەخۆشی سیل و هەوکردنی سیپەلك.

**٦) نەخۆشییەکانی مێشك و دەمار:**

- سەرگێژە.
- سەرئێشان.
- سەرع (صرع).
- فەرامۆشکاری و لەبیرکردن.

**٧) نەخۆشییەکانی پێست و مو:**

- هەڵوەرینی موییەکانی سەر.
- وشکی پێست.

---

* برۆنشێتی مزمن: بریتییە لە هەوکردنی بۆڕییەکانی هەناسەی خوارووی درێژخایەن.

** نەخۆشیی ئاسم: بریتییە لە تەسکبوونی بۆڕییەکانی هەناسە لەناو سییەکان ئەویش بەهۆی لەرزی (الحساسیه).

* پیربوونی پێست.
* خورانی پێست.

**٨) نەخۆشییەکانی ئێسك:**

* پوکبوونی ئێسکەکان.
* هەوکردنی جومگەکان.
* ئێش و ئازاری ئێسکەکان.

**٩) نەخۆشییەکانی چاو:**

* هەوکردنی دەماری چاو.
* کوێری.
* فرمێسکی بەردەوام.
* حەساسییەتی چاو.[٤١٤]

---

٤١٤. بڕوانە: العیسوی، د. عبدالرحمن محمد؛ **المخدرات و أخطارها**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٣-٣٨ ـــ العیسوي، د. عبدالرحمن محمد؛ **سیکولوجیة الإدمان و علاجه**؛ ط١؛ بیروت: دار النهضة العربیة (١٩٩٣)؛ ص١١١-١٢١ ــ أرناؤوط، محمد السید؛ **المخدرات و المسکرات بین الطب و القرآن و السنة**؛ ط١؛ القاهرة: المکتب الثقافي للنشر و التوزیع (١٩٩٠)؛ ص٣٣ ـــ بني یونس؛ سەرچاوەی پێشوو؛ بەشی : ((خطورة و سلبیات الکحولیات و المخدرات))؛ ص ٢٥٣-٢٥٦ ــ لامار، ئەلیکساندر؛ **ڕێنوێنیی دایکان و باوکان بۆ پەرەپێدانی دنیایەکی دوور لە مادده هۆشبەرەکان**؛ وەرگێڕانی: مستەفا مەعروفی؛ چ١؛ هەولێر: بنکەی توێژینەوە (٢٠٠٧)؛ ل ٤٧-٥٩ ــ ستودە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٩١-١٩٢ ـــ شیخاوندی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ٢٤٧-٢٦٥ ــ گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص٨١-٨٣ ــ ابوالقاسم اکبری؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٤٧ ــ دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٢-١١٠ ــ میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٨-٤٩ ــ چارلز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٦-٣٩ ــ هەروەها سایتی ((اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامی ایران)) لە ئینتەرنێت: http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

بەپێی ئامارەکانی پزیشکی یاسایی ئێران ڕێژەی مردن و گیان لەدەستدان لە ئەنجامی خراپ بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان لە ساڵی (١٩٩٨) لە هەر مانگێکدا (١٠٠) کەس بووە.[٤١٥]

### ٢. ئاسەواری دەروونی ـ کەسێیەتی:

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، یەکێك لە هۆیەکانی خووپێوەگرتن بریتییە لە وابەستەیی و بەسترانەوەی دەروونی بە مادده هۆشبەرەکان (Psychological dependence). هەروەك لە بەشی هۆکارە دەرونییەکان باسمان کرد، نەخۆشییە دەرونییەکان یەکێك لە هۆیەکانی تووشبوونی مادده هۆشبەرەکانن؛ بە تایبەتی ئەوانەی کە ((کەسایەتی))یان کامڵ نەبووە و گەشەیان نەکردووە، ئەوانە زیاتر لە ڕووی دەروونییەوە بە مادده هۆشبەرەکان پابەند و بەستراون تا لە ڕووی جەستەییەوە! ئەگەر تاکەکان بە شێوەیەکی دروست و پۆزەتیڤی پەروەردە بکرێن، هیچ کاتێك بۆ بالانس و هاوسەنگیی دەروونیی خۆی پەنا نابەنە بەر مادده هۆشبەرەکان. تاکەکانی خووگرتوو لە دوای چەند ساڵێك تووشی جۆرەها نەخۆشی دەروونی دەبن، کە لێرە ئاماژە بە هەندێ لەوانە دەکەین:

- نەخۆشی دەماری و دەروونی وەکو: نورۆتیك و سایکۆپاتیك و خەمۆکی و شیزۆفرنی و شێتبوون.
- تێکچوونی یەکسانی و هاوسەنگیی دەروونی.
- گرنگی نەدان بە بەها و بنەما ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان.
- لاوازی لە ئیرادە و لەدەستدانی هێزی بڕیاردان و جێبەجێکردن.
- سەرکێشی و سەرپێچیکردن و لە دەستدانی هێزی کۆنترۆڵ و فەرماندان.

---

٤١٥. پور اسلامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٧.

- له دەستدانی هێزی داهێنان، هزر، بیرکردنەوە، خودهۆشیاری و ڕامان و وردبوونەوە.
- خۆبەکەم زانین و متمانەنەبوون بە خۆ.
- نەمانی هەستی بەرپرسیارێتی.
- دروستبوونی هەستی دوژمنانە و شەڕەنگێزی.
- پەریشانی و شڵەژان و بێ ئارامی و دڵەڕاوکێی بەردەوام.
- سەرکێشی و سەرپێچیکردن.
- گۆشەگیری و تەنهایی، بێزاری لە خزم و کەس.
- نەمانی سۆز و عاتیفە.
- خەوزڕان.
- فەرامۆشی و شپرزەیی لە فێربوون و کێشە لە کات ناسین.[٤١٦]

بەپێی ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە بۆمان دەرکەوت کە ڕێژەی (٩٠٪)ی تاکەکانی نموونە تووشی کێشە و ئازای جەستەیی و عەسەبی و دەروونی بوونە کاتێك کە ماددەی پێویست بەدەستیان نەکەوێ، یان بە خۆیان هەوڵیان داوە کە وازبهێنن، بەڵام ڕێژەی (١٠٪) وەڵامیان بە "نازانم" بوە؛ چونکە تا ئێستا هەوڵیان نەداوە بۆ وازهێنان و لەو ماددانە دانەبڕاون کە بزانن! دواتر لە وەڵامی پرسیاری جۆری کێشەی جەستەیی و دەروونی، زۆربەی تاکەکانی نموونە زیاتر

---

٤١٦. بڕوانە: المغربی؛ هەمان سەرچاوە؛ ل١٧ ـــ کدیور؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٦ ـــ فرجاد؛ هەمان سەرچاوە؛ ل١٦٠ و١٦١ ــ ستودە؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٩٢-١٩٣- العیسوي؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص١١١-١٢١ ــ ئەلیکساندر لامار؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٧-٥٩ ــ ابوالقاسم اکبری؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٢٤٧ ــ دانش؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠٢-١١٠ ــ چارلز ای داجن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٦-٣٩ ــ هەروەها سایتی اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامي ایران)) لە ئینتەرنێت:
http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

له یەك كێشه و ئازاریان هەبووه، كه ڕێژەی (١٠.٦٧٪) كێشەی نەحەوانەیان (له ڕووی دەروونی و جەستەییەوه) هەبووه. ڕێژەی (٩.٣٣٪) تووشی نەخەوتن و بێتاقەتی و هەستی ماندووبوونی زۆر بوونه. ڕێژەی (٨٪)یش تووشی باوشكه، ئازاری ماسوولكه و ئێشانی ئێسك، ئاوهاتنەخوارەوه له لووت و لەرزینی جەسته بوونه. ڕێژەی (٦.٦٧٪)یش تووشی كێشەی لێدانی دڵ، پژمین، فرمێسك هاتنەخوارەوه له چاوان، موچركه و خورانی لەش بوونه. ڕێژەی (٤٪)یش تووشی سكچوون، قەبزبوون و سك ئێشان بوون.

## دووەم: ئاکامەکانی خووگرتن لە ئاستی خێزاندا (ئاستی ناوەندی):

بوونی تاکێکی خووگرتوو لە ناو خێزانێك دا دەبێتە هۆی ئاسەواری نێگەتیڤی جۆراوجۆر کە لێرە بە هەندێ لەوانە ئاماژە دەکەین:

- دەبێتە هۆی تووشبوونی ئەندامانی تری ناو خێزان.
- تێکچوونی شیرازەی خێزان.
- سستی و لاوازی و کەمبوونەوەی پەیوەندییەکان لە ناو خێزان و سنوورداربوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ خزم و هاوکاران و دراوسێیەکان.
- پەروەردەنەکردنی منداڵان بە شێوەیەکی دروست و پۆزەتیڤی.
- توندوتیژی و دروستکردنی کێشە لە ناو خێزان؛ وەکو: ئازاری جەستەیی و سێکسیی هاوسەران و منداڵان.
- پابەندنەبوون و گوێنەدان بە بنەماکان، دابونەریتی خێزانی و بەهاکانی.
- پشتگوێخستنی پرس و ڕووداوەکانی هەنوکەی ژیان.
- کەم بوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی خێزان.
- بێتوانایی و نەبوونی هەستی بەرپرسیارییەتی و هەڵنەگرتنی چ لە ڕەهەندی ئابووری و چ لە ڕەهەندی منداڵان و هاوسەرداری.
- خۆکوژی هاوسەر و منداڵان.
- بەرزبوونەوی ڕێژەی جیابوونەوەی ژن و مێرد.
- کەمبوونەوەی ڕێژەی زەواج.

- **دروستبوونی بێبەندوباری و نەمانی پابەندییە ئایینییە ئەخلاقییە کۆمەڵایەتییەکان.[٤١٧]**

**لە ئێراندا بەپێی لێکۆڵینەوە ئەنجامدراوەکان دەرکەوتووە کە (34٪) حاڵەتەکانی تەڵاق هۆکارەکەی خووگرتن بوە بە مادده هۆشبەرەکان.[٤١٨]**

**لە ئەنجامی توێژینەوەی خۆمدا سەبارەت بە کێشە و زیانەکانی مادده هۆشبەرەکان لەسەر خێزان، بۆمان دەرکەوت کە لە وەڵامی پرسیارێك: (ئایا پاش توشبوونت بە مادده هۆشبەرەکان، تووشی کێشەی خێزانی بووی؟)، هەموویان وەڵامیان بە (بەڵێ) بووە؛ واتە (١٠٠٪)ی خووگرتووەکان تووشی کێشەی خێزان هاتوون کە دوای ئەم پرسیارە، پرسیاری دووەم ئاراستەیان کرا کە ئەگەر وەڵامەکە بە بەڵێیە، چ جۆر کێشە و ئاسەوارێك؟ کە دەرکەوت ڕێژەی (٣٣.٣٤٪) تووشی کێشەی "لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بوون لەگەڵ خزم و کەسدا" و کێشەی "دەرکردنیان لەسەر کارەکەیان" بوونە. ڕێژەی (٢٣.٣٣٪) تووشی کێشەی "تەڵاق" بوونە کە هاوسەرەکانیان داوای تەڵاقیان کردووە. ڕێژەی (٣.٣٣٪)یش تووشی کێشەی "هەوڵی خۆکوژی" لە لایەن هاوسەرەوە، "دەرکران لە ماڵ" و، هەروەها "توندوتیژی لەگەڵ خێزان" بوون.**

---

٤١٧. بختی، نور محمد؛ **نقش اعتیاد در فروپاشی نظام خانواده**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ سال ٢؛ شماره ١٩؛ ص ٢٠ ــ کرامتی، کرامت؛ **اعتیاد و پویایی خانواده**؛ تهران: ژرفای تربیت (٢٠٠٠)؛ سال ٢؛ شماره ١٥؛ ص ٣٦ ــ رعدی؛ **راهنمای پیشگیری از اعتیاد (ویژه خانوادەها)**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٨ ــ برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٣ ــ عەتا مەلا کەریم؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٩ ــ میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٩ ــ عبداللطیف، أحمد السید؛ **"أثر الإدمان علی الفرد و الأسرة و المجتمع"**؛ عن الموقع:
http://www.hemaya.ae

٤١٨. پور اسلامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٦.

ئەم ئەنجامانەش لەگەڵ ئەنجامە لێکۆڵینەوەکانی تری پاش خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان کۆکن، تووشی بڕین و نەمانی پەیوەندی لەگەڵ خزم و کەس و خێزان و برادەران دەبن و ئامادە نابن لە بۆنەکانی خێزانی، تەنانەت پێشوازی لە میوانەکانیش ناکەن،[٤١٩] و زۆربەی حاڵاتی تەڵاق لەسەر داوای ژنەکەیان ڕوودەوە.[٤٢٠]

---

٤١٩. الخزرج و سعيد؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٨٨.

٤٢٠. هەمان سەرچاوە؛ ل٨٧.

## سێیەم: ئاکامەکانی خووگرتن لە ئاستی کۆمەڵگادا (ئاستی قەبە):

ئاسەوار و ئاکامەکانی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان و بەکارهێنانی لە ئاستی قەبە دا بریتین لە:

### ١. *ئاسەواری کۆمەڵایەتی:*

أ. **کێشە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگا:**

هەروەك توێژینەوەی جۆراوجۆر ــ و تێبینی ئێمە وەکو توێژەری کۆمەڵایەتی ــ پیشان دەدات کە تاکی خووگرتوو لە ڕووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان زۆر لاوازە و تاکێکی گۆشەگیر و وەلاوەنراو و بە قێزەوەن دەژمێردرێت!

بۆنی ناخۆشی دەمی تاکی خووگرتوو، زەردی و ناشیرینیی دەم و چاو، ددانی ڕزیو، ناڕێکی ڕەواڵەت و جل و بەرگ، یەکێك لە هۆکاری دوورخرانەوە و قێزەوەنییە کە زۆر جار بوەتە هۆی کێشەی خێزانی و تەنانەت دەستلێکبەردانی ژن و پیاو؛ بە تایبەتی ئەوانەی لە شوێنە گشتییەکان لە نێوان خەڵکی ئاساییدا جگەرە دەکێشن و مافی خەڵك پێشل دەکەن کە زۆر جار لە لایەن خەڵکەوە لۆمە و سەرزەنشت دەکرێن![٤٢١]

تاکی خووگرتوو لەبەر هەبوونی کێشەی دەروونی و کەسێتی، ئاستی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەندامانی خێزان و خزم و کەس و خەڵکانی تر لە ڕووی سۆز و عاتیفیەوە دادەبەزێت و جۆرێك بێهەستی بەرامبەر بە خەڵك لای دروست دەبێت و بۆی گرنگ نییە کە تاکێکی پۆزەتیڤ بژمێردرێ لە لای خەڵك و لە نێوان ئەو و کۆمەڵگادا دابڕانێك دروست دەبێت و ئەو تاکە تاکێکی تەندروست

٤٢١. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٣٩.

نابێ کە ڕوحێکی کۆمەڵایەتی و سۆز و ئینتیما بۆ کۆمەڵگای هەبێت. تەنانەت لە کاتێ ((هاوسەرگیریدا)) هەر کەسێك ئامادە نابێت لەگەڵ ئەم جۆرە تاکانە ژیانێکی هاوبەش پێك بهێنێت! یان لە کاتێ دۆزینەوەی هاوڕێ و برادەر، هەر کەسێك ئامادە نابێت لەگەڵیان هاتووچۆ بکات. خودی هاوسەر و دایك و باوك و منداڵانیان لێی هەڵدێن و خۆشیان خۆیان قەبوڵ نییە؛ بۆیە هیچ ڕێز و کەسایەتی و حورمەت و پێگەی کۆمەڵایەتییان نییە لە نێوان ئەندامانی خێزان و برادەران و خزم و کەس و ناسیارەکانیان.

**ب. بەرزبوونەوەی ڕێژەی ڕووداو و تاوان و لادانە کۆمەڵایەتییەکان:**

هەمیشە ئەم بابەتە جێگای باس بوە کە ئایا نێوان "خووگرتن" و "تاوان" پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە یان نە؟ کامیان دەبێتە هۆی ئەویتر؟ یانیش هەردوو ئەنجامی شتێکی ترن؟

جگە لەوە کە خووگرتن، خۆی لە خۆیدا نەخۆشی و لادانێکی کۆمەڵایەتییە، بەڵام بە پشت بەستن بەم خاڵانەی خوارەوە تاکی خووگرتوو دەست بە تاوان و لادانی دیکە دەکات:

١) لەبەر ئەوەی خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان لە ڕووی یاساییەوە بە لادان و تاوان دەژمێردرێت، تاکی خووگرتوو بەم باوەڕە کە دژی یاسا کار دەکات، ئەم پاڵنەرە لای دروست دەبێت، کە دژی یاساکانی تریش کار بکات.

٢) لەبەر ئەوەی تاکی خووگرتوو بە تاوانبار دەژمێردرێت و لە دوای دەستگیرکردنی دەخرێتە ناو زیندان، لەگەڵ تاوانبارانی تر لە زیندان دەمێنێتەوە و فێری تاوان و لادانەکانی تریش دەبێت و لە دوای هاتنەدەرەوە لە زیندان، ئەگەر کار و پیشەیەکی نەبێت، ئەو تاوانانەی کە فێری بوە بە کاری دەهێنێتەوە.

٣) لەبەر ئەوەی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان پارە و خەرجیی زۆری دەوێت و داهاتی تاکی خووگرتوو وەڵامی ئەو خەرجییانە ناداتەوە، وای لێدەکات کە دەست بە دزی و تاوانەکانی تر بدات.[٤٢٢]

یەکێك لە گرنگترین ئاکامە کۆمەلایەتییەکانی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، زیادبوونی ئەنجامدانی کارە نزم و لادانە کۆمەڵایەتی و تاوانەکانە؛[٤٢٣] وەکو: دزی، خۆکوژی، کوشتنی ژن یان مێرد و منداڵ، قاچاغ کردن، ڕووداوی سەیارە، شەڕ و پێکداادان و بریندار کردن و...؛ بۆیەشە دەبینین بەشێکی ـ زۆر یان کەم ـ لە بەندکراوەکان، تاکەکانی خووگرتوو یان ئەوانەی کڕین و فرۆشتنی پێدەکەن، دەگرێتەوە! دەکرێ ئەوەش پەیوەند بکەینەوە بە لێکترازانی خێزانی و تەڵاق کە لە ئاستی ناوەندیدا باسمان کرد کە تەڵاقیش خۆی لە خۆیدا دەبێتە هۆی سەرگەردانی و بەرەڵایی تاکەکان لە ناو کۆمەڵگا و دەستدان بە لادانە کۆمەڵایەتییەکان:

---

٤٢٢. رفعت؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٨٢-١٨٣.

٤٢٣. شفرز، برنهارد؛ **مبانی جامعه شناسی جوانان**؛ ترجمە: کرامت الله راسخ؛ چ١؛ تهران: نشرنی (٢٠٠٤)؛ ص٢٣١-٢٣٨.

**ئەم وێنەیە پەیوەندیی نێوان خێزانی شپرزە و کێشەی تەڵاق و تاوان و خووگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان ڕوون دەکاتەوە**




لێکۆڵینەوە جۆراوجۆرەکان "چایکن/١٩٨٢، تونری و ویلسۆن/١٩٩٠، زاویتس/١٩٩٢، بری و مارسدن/١٩٩٩، ویلدو/١٩٩٧" دەسەلمێنێن کە زۆربەی ئەوانەی کە ماددە هۆشبەرەکان بەکار دەهێنن، تووشی لادانەکانی دیکەش بوونە. لێکۆڵینەوەی "هارل/٢٠٠١" نیشاندەری ئەوەیە کە ئەو بەندکراوانەی کە ماددە ئەفیۆنییەکان (وەکو تریاك و هیرۆیین و...) بەکار دەهێنین، ٤ تا ٦ ئەوەندە زیاتر تووشی لادان دەبن، ئەوەش بۆ ئەو کەسانەی کە پێشینەی ماددە هۆشبەرەکان و بەندبوونی هەبوە، دوو ئەوەندە دەکات. ئامارەکان

نیشان دەدات کە نزیکەی (٧٠٪)ی بەندکراوەکان لەسەرتاسەری ئەوروپا خووگرتووان دەگرێتەخۆ.[٤٢٤]

ئامارەکان باس لەوە دەکەن کە ڕێژەی تاوانەکانی ساڵانەی "ئەمریکا" زیاتر لە (٥٠) ملیۆن بوە کە زۆربەیان پەیوەندی بە ماددە هۆشبەرەکانەوە هەبوە. هەروەها لە "بریتانیا" بەپێی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوت کە سەرەڕای دابینکردنی ماددە هۆشبەرەکان لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ خووگرتووەکان، بەڵام ڕێژەی کارە لادانەکانیان کەم نەبوەوە! توێژینەوەکانی دیکە لە وڵاتانی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە نێوان خووگرتن و تاوانکاری، پەیوەندییەکی بەهێز و دوولایەنە هەیە کە نکۆڵی لێی ناکرێ. توێژینەوەکانی "بن هام دای" لە ساڵی (١٩٧٣) لەسەر (١٠٠٠) خووگرتوو پیشان دەدات کە (٨٠٪)ی ئەوان بەر لە خووگرتنیان تووشی هیچ تاوان و لادانێك نەببوون، کەچی (٦٧٪) لە دوای خووگرتن، تووشی لادان بوونە. توێژینەوەکانی "جانسۆن" و هاوکارانی لە ساڵی (١٩٨٧) کە لە ماوەی (٨) ساڵ لەسەر قوتابیانی دواناوەندی لە چەند قوتابخانەی ئەمریکی ئەنجامدرا، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە ڕێژەی لادانکاری پەیوەستە بە ڕێژەی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان؛ چەند بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان زیاد بکرێت، ئەوەندە ڕێژەی تاوان و لادانەکانیش زیاد دەبێت.[٤٢٥]

لە لێکۆڵینەوەی ئێمەشدا دەردەکەوێت کە ڕێژەی (٥٠٪)ی تاکەکانی نموونە کە بە هۆی ماددە هۆشبەرەکان لە زینداندا بەند کراون، پێناسەی خۆیان دەکەن وەك "تاکێکی تاوانبار" خۆیان دەبینن، بەڵام ڕێژەی (٥٠٪)یش وەك "تاکێکی نەخۆش" خۆیان دەبینن. ئەوەی کە هەست دەکەن تاوانبارن، زیندانیان بە

---

٤٢٤. بوالهری، جعفر؛ **ارزیابی سوء مصرف مواد مخدر در زندان های ایران**؛ چ١؛ تهران: دبیرخانە ستاد مبارزه با مواد مخدر (٢٠٠٢)؛ ص ١١.

٤٢٥. باصری گنابادی؛ علی اکبر؛ **اعتیاد و جرم**؛ مقالەی ئینتەرنێتی لە سایتی: دپارتمان مجازی پژوهشهای حقوقی ایران: http://www.elaw.ir

جێگای هەق دەزانن و ئەوانەی خۆیان بە نەخۆش دەزانن، نەخۆخشخانەکان بە جێگای خۆیان دەزانن. هەروەها لە وەڵامی پرسیارێکی تر کە (ئایا جگە لەمجارە، پێشتریش بەند کراوی؟)، دەرکەوت کە ڕێژەی (٣٠٪) وەڵامیان داوە کە یەکەم جار نییە کە بەند دەکرێن، بەڵکو (٢)جاری دیکەش بەند کراون. ئەگەر بێتو ئەم ئەنجامەی لەگەڵ ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەیەکی "سعودی" بەراورد بکەین، تەبایە کە ڕێژەی (٣٧٪) لە خووگرتووەکانی سعودیش کە بەند کراون، لە (٢– ٣) جار زیاتر بەند کراون؛[٤٢٦] کەواتە نیشان دەدات پەیوەندی هەیە لە نێوان بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و تاوانەکانی دیکە.

بە شێوەیەکی گشتی لە ڕووی تاوانناسییەوە دوو دەستە تاوان و لادانی کۆمەڵایەتی هەن کە دەرەنجامی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکانن:

**١) لادانە ڕاستەوخۆیەکان:**

بریتیە لەو لادانانەی کە تاك لە دوای بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر لە ژێر کاریگەریی ئەو ماددەیە ئەنجام دەدات؛[٤٢٧] وەکو خۆکوژی، یان کوشتنی کەسێك، لادانی جنسی، یان ڕووداوی سەیارە و شەڕ و پێکدادان.

**١. خووگرتن و کوشتن:** بەپێی توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی "ریچ" و هاوکارانی لە شاری سەندیاگۆ (70٪) خۆکوشتنەکان لە ژێر تەمەنی (٣٠) ساڵیدا هاوکات بوە لەگەڵ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان.[٤٢٨] با سەیری ئەو

٤٢٦. الخزرج و سعید؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٧٧.

٤٢٧. گسن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٣.

٤٢٨. کرامتی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٣٩.

هەوالانەی خوارەوە بکەین کە باس لە کوشتنی ئەندامانی خێزان لە ژێر کاریگەریی ماددە هۆشبەرەکان دەکات:

– گەنجێك هەموو ئەندامانی خێزانی خۆی دەکۆژێ لە ژێر کاریگەریی ماددە هۆشبەرەکاندا: سەرچاوەی پۆلیس لە "قەزای الصویرە" لە باکووری بەغدا ڕادەگەینێ کە ڕۆژی هەینی (٢٠١٠/٥/٧) گەنجێکی (١٨) ساڵی لە دوای بەکارهێنانی ماددە هۆشبەر، بە هۆی گوللەوە شەش کەس واتە دایك و باوك و چوار منداڵیان (واتە خۆشك و برای خۆی کە هەموویان تەمەنیان کەمتر لە دە ساڵان بوە)، دەکوژێ![٤٢٩]

– خووگرتوویەکی عێراقی هەموو ئەندامانی خێزانی برایەکەی دەکوژێ: ئاژانسی "فرانس پرێس" دەگێڕێتەوە لەسەرچاوەکانی ئاسایشی عێراقی کە خووگرتوویەك لە گەڕەکی "الصلیخ" لە باشووری بەغدا پێنج کەس لە خێزانی برای خۆی (برا و هاوسەر و سێ منداڵیان) بە چەقۆ لە کاتێ نووستنندا دەکوژێ![٤٣٠]

– بەپێی ڕاپۆرتی ڕەسمیی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئاماری کۆی کوژراوەکان بە هۆی ماددە هۆشبەرەکان لە وڵاتی بەرازیل، دەگاتە (٣٠,٠٠٠) کەس کە زۆربەیان منداڵن.[٤٣١]

٢. **خووگرتن و لادانە جنسییەکان:** لادانە جنسییەکانیش پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بە تایبەتی مەشروباتی

---

٤٢٩. تەلەفزیونی العربیە. بڕوانە: http://www.alarabia.net/ ــ تەلەفزیونی السومریەی عێراقی: http://www.alarabia.net/ar/iraq-news

٤٣٠. بڕوانە: المنتدی العراقی: http://www.iraqiforum.net/vb/ ــ منتدیات شباب البحرین: http://www.bahrainevents.com/forum

٤٣١. باصری گنابادی؛ سەرچاوەی پێشوو.

ئەلکهۆلی. بەپێی توێژینەوەکانی "بادونێل" هەروەها "مارشە" لە فەڕەنسا زیاتر لە (٦٥٪)ی ئەو کەسانەی کە تووشی هەتکی نامووس بوونە لە ژێر کاریگەریی ڕاستەوخۆی ماددە هۆشبەرەکان بوونە. "کین بێرگ" و هاوکارانیش گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە زۆربەی ئەوانەی کە تووشی لادانی جنسی بوونە، لە ژێر کاریگەریی ماددە هۆشبەرەکان بوونە؛ بە تایبەتی ئەوانەی کە تووشی زینای مەحارم (لادانی جنسی لەگەڵ دایك و خۆشك و براژن و...) بوونە، بە شێوەیەکی گشتی لە حاڵەتی سەرخۆشی بوونە و ئاگایان لە خۆ نەبوە![٤٣٢]

جگە لەوە بە هۆی سەرخۆشی و کاریگەریی ماددە هۆشبەرەکان، تاك لە کاتی لادانی جنسی ئاگای لە خۆی نییە کە لەوانەیە ئەو کەسە کە جنسی لەگەڵ دەکات، نەخۆشی ئایدز یان هپاتیت یان سیفیلیس و نەخۆشییە سکسییەکانی تریان هەبێت و خۆیانیش تووشی هەمان نەخۆشی بن؛ هەروەك "پرۆفیسۆر پول پێڕن" لە کتێبی خۆی بە ناوی "ئەلکولیزم و کێشە پزیشکییە کۆمەڵایەتییە ئابوورییەکان"دا دەڵێت: لە شاری پراگ* کاتێ کە لە (٩٧٢) نەخۆشی تووشبووی لە ئەنجامی لادانی جنسی پرسیار کرا کە: ئایا لە کاتێ جنسکردن دا سەرخۆش بووی؟ (٤٣٨) کەس لەوان وەڵامیان بە بەڵێ بوو![٤٣٣]

**٣. خووگرتن و ڕووداوەکانی ناخوازراو:** بەپێی توێژینەوە جۆراوجۆرەکان دەبینین کە پەیوەندییەکی پتەوی هەیە لە نێوان ماددە هۆشبەرەکان و ڕووداوە ناخوازراوەکانی وەك: سووتان و ئاگربەربوون، خۆپێکدانی سەیارەکان و...

هەروەك توێژینەوەکانی "بادونێل" و "مارشە" پیشان دەدەن کە زیاتر لە (٤٥٪)ی ئاگربەربوون و ڕووداوی سووتان، هۆیەکانیان گەڕاوەتەوە بۆ ئەوانەی

---

٤٣٢. کی نیا؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠١٥.

* پراگ: پایتەختی وڵاتی چیکە.

٤٣٣. کی نیا؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠١٥.

که سەرخۆش بوونە. هەروەها لێکۆڵینەوەکانی "درۆبر" پیشان دەدات کە نزیکەی (٥٤.٢٪)ی ئەوانەی کە بە هۆی خۆلێکدانی سەیارە گیانیان لە دەست داوە، بە هۆی سەرخۆشی بوە کە نزیکەی (٤٠.٦٪) بە هۆی خواردنەوەی مەشروباتی ئەلکهۆلی بوونە. دوکتۆر "لۆبرتۆن"یش لە توێژینەوەی خۆیدا دەگاتە ئەو دەرەنجامە کە (٦٠٪)ی ڕووداوی سەیارە بە هۆی سەرخۆشی بوە.[٤٣٤] زۆر لە شۆفێرەکانی سەیارە گەورەکان کە زۆر لە جادەکاندا دەمێننەوە، بۆ ئەوەی خەویان لێنەکەوێ، پەنا دەبەنە بەر ماددەی هۆشبەر، کەچی بە پێچەوانەوە تووشی ڕووداوی کوشندە دەبن.[٤٣٥]

توێژینەوەی "ورنە وسانیە" لە فەڕەنسا پیشان دەدات کە لە نموونەی (١٢٣٠) کەسی وەرگیراو لە تاوانبارەکانی بەندکراو، دەرکەوت کە (٥٦٧) کەس (واتە ٤٧٪) لەوانە لە دوای خواردنەوەی ئەلکهۆل تووشی تاوان بوونە و دەستگیر کراون.[٤٣٦]

### ٢) لادانە ناڕاستەوخۆیەکان:

بریتییە لەو لادانە کۆمەڵایەتییانەی کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ژێر کاریگەریی ماددە هۆشبەرەکاندا نین؛[٤٣٧] وەکو: دزی، قاچاغ، ساختە و تەزویر، بەرتیل وەرگرتن، داوێنپیسی و فەحشا و ترساندنی خەڵك و ...

تاکی خووگرتو بە هۆی بێتوانایی ئابوورییەوە لە ئامادەکردنی ئەو ماددە هۆشبەرەی کە پێویستیان پێیە، ڕوو دەکاتە دزی، دەرۆزەیی کردن، شەرواڵ پیسی، قاچاغی کردن بەو ماددە و کەلوپەلەکان و تاوانە کۆمەڵایەتییەکانی

---

٤٣٤. هەمان سەرچاوە؛ ل ١٠١٥-١٠١٦.

٤٣٥. گنجی؛ سەرچاەی پێشوو؛ ل ٧٤.

٤٣٦. کی نیا؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٠١٠.

٤٣٧. گسن؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٢٣.

تر.[٤٣٨] بەپێی ڕاپۆرتێك لە لایەن گروپی پزیشکی "هاپکینز" سەبارەت بە خووگرتووەکانی شاری "بالتیمور"ی ئەمریکی ئەنجام دراوە، پیشان دەدات کە (١٢٠٠٠) خووگرتوو لەو شارە بۆ هۆی دزینی کەل و پەلەکان، زیاتر لە (٣٠٠) ملیۆن دولار سالآنە لە فرۆشگا جۆراوجۆرەکانی ئەم شارەیان دزیوە و بە فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانە بە نرخێکی زۆر کەمتر و هەرزانتر، پارەی بەدەست هێنراویان بە کڕینی ماددە هۆشبەرەکانیان داوە.[٤٣٩] هەروەها بەپێی توێژینەوە ئەنجامدراوەکانی "ئێران"، (25٪)ی خووگرتوان لە ڕێگەی نایاسایی (وەکو: دزی، شەروالّپیسی و..) پارەی پێویست بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بەدەست دێنن. لە سالّی (٢٠٠٠)دا نزیکەی (60٪)ی زیندانیان کەسانی خووگرتوو بە ماددە هۆشبەرەکان پێك دەهێنا و (15٪ ــ 20٪) ئەوانی تریش تاوانەکانیان بە جۆرێك پەیوەندیی هەبوە بەو ماددانە. بە شێوەیەکی ڕوونتر (25٪) تاوانەکانی دارایی، (30٪) تاوانی کۆمەلآیەتی، (24٪) کوشتنی نامەبەستدار، (77٪) لە زیانە ماددییەکان و (27٪) قاچاغی کەلوپەلەکان، پەیوەندییان بە ماددە هۆشبەرەکانەوە هەبوە.[٤٤٠]

هەروەها بەپێی ئامارە ڕەسمییەکانی "وەزارەتی دادی ئەمریکا" لە سالّی (١٩٩٩)، ڕێژەی ئەو تاوانبارە بەندکراوانەی کە بە هۆی کاریگەریی ئەلکهۆل تووشی لادان و تاوان بوون، بریتی بووە لە: (٥٢٪) کۆشتنی نەخوازراو، (٤٥٪) کوشتنی خوازراو، (٤٥٪) شەڕ و بریندار کردن، (٤٠٪) لادانی جنسی، (٤٢٪) تاوانی توندوتیژی.[٤٤١]

---

٤٣٨. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٠.

٤٣٩. أردوباری؛ **بلای قرن بیستم**؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ص ١٧.

٤٤٠. پور اسلامی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٦.

٤٤١. صدیق سروستانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ١٨١.

هەروەها بە ڕاپۆرتی "نەتەوە یەکگرتووەکان" لە ساڵی (٢٠٠٤)، نزیکەی (75٪)ی تاوانە جۆراوجۆرەکان لە بریتانیا پەیوەندیی بە ماددە هۆشبەرەکانەوە هەیە.[٤٤٢]

ج. بێکاری و لەدەستدانی پێشە:

زۆر جار خووگرتووەکان لە ڕووی پیشە و کارکردنیشەوە بە هۆی چەندین هۆکاری پێکەوە بەستراو تووشی ((بێکاری)) دەبن. تاکی خووگرتوو لە ناو کۆمەڵگا هیچ پێگەیەکی ئەوتوی نییە و کەسێك متمانەی پێ ناکات؛ چونکە لەو کارانەی کە پێی ڕادەسپێردرێ سستی و کەم و کورتی دەکا تاکو دەبێتە هۆی دەرکردنیان! لە ئێران تێستێك هەیە بە ناوی ((تێستی ماددە هۆشبەرەکان)) کە ئاشکرا دەبێت چ کەسێك خووگرتووە و تەنانەت جۆری ماددەی بەکارهێنراویش دیار دەکات! ئەگەر کەسێك خووگرتوو بوو، ئەوا هیچ پیشە و کارێکی نادەنێ، یاخود لەسەر کارەکەی دەردەکەن! یانیش زۆر لە ژیانی خۆی لە ناو زینداندا دەباتە سەر، بە هۆی تاوانی ماددە هۆشبەرەکان. ئەوەش خۆی لە خۆدا کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە. زۆربەی خووگرتووەکان بێکارن و ئەگەر کارێکیش بکەن، ئەوا بریتیە لە کڕین و فرۆشتن و دابەشکردنی ماددە هۆشبەرەکان! حەز لە کار و خوێندن ناکەن، ئەوەش کار دەکاتە سەر پرۆسەی گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کۆمەڵگا.

---

٤٤٢. باصری گنابادی؛ سەرچاوەی پێشوو.

### ٢. ئاسەواری ئابووری:

ئاسەواری ئابووری، بەشێکی تری ئاسەوارەکانی مادده هۆشبەرەکانە کە هەم سەبارەت بە تاك و هەمیش کۆمەڵگا گرنگییەکی زۆری هەیە؛ چونکە تاکی خووگرتوو ناتوانێ کار بکات (بە هۆی نەبوونی هێزی کار و هیچ بەرهەمێکی نابێت)، یاخود بە هۆی تاوانی مادده هۆشبەرەکان، بەشێکی زۆر یان کەم لە ژیانی خۆی لە ناو زیندان دا دەباتە سەر، ئەوەش خۆی لە خۆیدا هەم کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە و هەمیش ئابووری.

جگە لەوە زۆربەی ئەم ماددانە لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر بەنرخ و نایابن! تاکی خووگرتوو ناچارە هەرچی هەیە لە پێناو بەدەستهێنانی شتێکی کەم لەو ماددانە، تەنانەت مسقاڵێك (Fix) پارەیەکی زۆر سەرف بکات؛[٤٤٣] بۆیە زۆربەی داهاتی تاکی و خێزانیی خۆی لەو بوارەدا بەهەدەر دەبا و تووشی خەسارەتی تاکی و خێزانی و تەنانەت نەتەوەییش دەبێت.

#### أ. کەمبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان:

هەر کەس لە ناو هەر کۆمەڵگایەك دا بۆ ماوەیەکی زەمەنی و تەمەنێکی دیاریکراو تاکێکی بەکاربەر و کۆمەڵگاش لە زۆر ڕوویەوە سەرمایەگوزاری بۆ دەکات؛ وەکو بواری: تەندروستی، پەروەردە و فێرکردن، خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان و... بەو ئومیدە کە ڕۆژێك ببێتە تاکێکی بە سوود و بەرهەمهێنەر بۆ کۆمەڵگایەکەی. بەڵام ئەوەندەی لە نزیکەوە خووگرتووەکان دەبینین و دەیانناسین، نەك تەنها هیچ بەرهەمێکیان نییە، بەڵکو بریتین لە هەندێ مشەخۆر و بوونەوەری بەکاربەر کە تەنها زیان دەگەیێننە کۆمەڵگاکەیان!

---

٤٤٣. آبادینسکی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل١٦.

گرنگترین ئاکامی ئابووری ـ کۆمەڵایەتیی خووگرتن بە مادده هۆشبەرەکان، کەمبوونەوەی هێزی مرۆیی و بەرهەمهێنان و بوونە بار لەسەر شانی کۆمەڵگایە. تاکی خووگرتوو بە هۆی خووگرتن و بەردەوامبوون لەسەر مادده هۆشبەرەکان، توانایی خۆی لە هەموو کارێك لە دەست دەدات و هەروەك ئاماژەمان پێ کرد، بێکار دەبێت و پیشەیەکی دروست و بەردەوامی نابێت و، بە درێژایی زەمەن و بە زیادبوونی بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، دەبێتە کەسێکی بەکاربەر لە ناو کۆمەڵگا و لە ئەنجامدا تووشی کەمیی هێزی کار و بەرهەم و بوونە بار بە سەر کۆمەڵگا دەبێت و بەمەش کۆمەڵگا لە بەرەو پێشچوون دوادەکەوێت.[٤٤٤]

ب. زیانی ئابووری و کەمبوونی داهات:

لە ئاکامە ئابوورییەکانی تری خووگرتن بریتییە لە زیانە ئابوورییەکان و کاریگەرییان لە داهاتی تاك و وڵات، بەرزبوونەوەی تێچوونەکانی کۆمەڵگایە؛ لەوانە تێچووی تەندروستی و چاودێری پزیشکی، تێچووی کارە یاساییەکان، تێچووی دادگا و پۆلیس، بەفیڕۆچوون و زیانە ئابوورییەکانی ئەو تاوانانەی کە بە هۆی مادده هۆشبەرەکانەوە ئەنجام دەدرێت؛ بۆ نموونە: بڕی تێچووی بنبڕکردنی مادده هۆشبەرەکان لە "بریتانیا" نزیکەی (١٩) ملیۆن پاوند بوە. لە "ئەمریکا" نزیکەی (١٤) ملیۆن کەس خووگرتوو هەن کە بە بەردەوام یەکێك لە مادەی هۆشبەر بەکاردەهێنن و زیاتر لە (٥٠) ملیارد دۆلار ساڵانە خەرجی ئەم ماددانە دەکەن. هەر لە ئەمریکا ساڵانە (١١٠) ملیارد دۆلار لەپێناو بنبڕکردنی مادده هۆشبەرەکان و چارەسەریی خووگرتووەکان سەرف دەکرێت کە بەم بڕە پارەیە دەتوانرێت هەر لە ئەمریکادا (١٦٩٢) نەخۆشخانە و (٦٣٢) زانکۆی نوێ و

٤٤٤. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥١.

(٣٦٦٧) باخچە و پارکی گشتی دروست بکرێن و (٢٩٥٧٩٥٦) مامۆستای پێ دابمەزرێنرێت و (٧٥٨٦٢٠) بارهەڵگری پێ بکرِدرێت![٤٤٥]

بەپێی ئاماری ڕەسمی "ئاژانسی دژ بە مادده هۆشبەرەکانی ئێران" لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٣) ئەو زیانە ماددی و ئابوورییەی کە لە مادده هۆشبەرەکانەوە هاتوەتە کایەوە، بریتییە لە (٧٢٥) ملیۆن دولار.[٤٤٦]

بەپێی لێکۆڵینەوەکەش سەبارەت بە زیانی ئابووری، دەرکەوت کە ڕێژەی (٤٠٪)ی تاکەکانی نموونە لە نێوان (١٥٠٠٠٠–١٩٩٠٠٠) دینار مانگانە خەرج کردووە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ماددانە و، ڕێژەی (٢٠٪) لە نێوان (١٠٠٠٠٠–١٤٩٠٠٠) و (٥٠٠٠٠–٩٩٠٠٠) دینار و ڕێژەی (١٠٪) لە نێوان (٢٥٠٠٠٠–٢٩٩٠٠٠) و (٢٠٠٠٠٠– ٢٤٩٠٠٠) دینار. سەرەڕای ئەوە کە زۆربەیان کاری نافەرمییان هەیە و زۆر جار تووشی بێکاریش دەبن، هەروەها (٥٠٪) کرێچین و داهاتیان نزمە و لە چینی هەژار دەژمێردرێن، ئەوەندە پارە سەرفی مادده هۆشبەرەکان دەکەن کە دەبێتە هۆی خەرج نەکردن بۆ خێزانەکانیان و دواتر دروستبوونی کێشەی کۆمەڵایەتی نێوانیان بە تایبەتی تەڵاق و دەستلێکبەردان؛ هەروەك لە ئەنجامەکانی هەندێك لێکۆڵینەوەتریشدا هاتووە.[٤٤٧]

---

٤٤٥. برومند؛ د. شهزاد؛ **بررسی اقتصادی رفتار مصرف کنندگان مواد مخدر**؛ چ١؛ تهران: دبیرخانه ستاد مبارزه با مواد مخدر (٢٠٠٤)؛ ل٢.

٤٤٦. میری آشتیانی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٥٣.

٤٤٧. عبداللطيف، رشاد أحمد؛ **الآثار الإجتماعية لتعاطي المخدرات**؛ ط١؛ الرياض: المركزالعربي للدراسات الامنية والتدريب (١٩٩٢)؛ ص١٨٢.

**ئەگەر بەپێی ئامارەکان،* لە کوردستان (٤٠٠٠) خووگرتوو و بەکارهێنەری ماددە هۆشبەرەکانمان هەبێت وەکو ڕێژەی ناوەندی، زیانە ئابوورییەکان لە یەك ساڵدا ـ بەپشتبەستن بە ئەنجامەکانی توێژینەوەکەم کە ناوەندی خەرجیی** هەر خووگرتووەك لە یەك مانگدا بۆ کڕینی ماددەی هۆشبەری پێویست، بریتییە لە (١٧٤.٥٠٠) دینار واتە (١٤٧.٥)$ ـ ئەوا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:**

*4000=698.000.000 ×147.200* ***دینار بۆ هەر مانگێك***

*12×698.000.000=8.376.000.000* ***دینار بۆ یەك ساڵ***

***$ (7.100.000)*** ***واتە: بڕی حەوت ملیۆن و سەد هەزار دولار***

**هەروەها سەبارەت بە "جگەرەکێشان" لە نێوان گەنجانی کوردستان، بەپێی ئەنجامەکانی ڕاپرسییەك لە ژێر ناونیشانی "گەنج و جگەرەکێشان" کە لە لایەن "سەنتەری پەرەپێدانی لاوان" ئەنجام دراوە، ڕێژەی (٤٣.٢٪)ی گەنجان جگەرە دەکێشن و ناوەندی خەرجی ئەوان ڕۆژانە دەکاتە (٧٥٠) دیناری عێراقی.[٤٤٨] بەپێی ئاماری ڕەسمیی حکومەتی هەرێمی کوردستان،[٤٤٩] وەزارەتی وەرزش و**

---

* بەپێی ئاماری "ڕێکخراوی ڕۆشنبیری هۆشیاری دژی ماددە هۆشبەرەکان لە هەرێمی کوردستان" ڕێژەی (٣٠٠٠ — ٥٠٠٠) خووگرتوو هەیە لە کوردستان تا کۆتایی مانگی (٤/٢٠١٠) کە ئێمە پشت بە ڕێژەی ناوەندی دەبەستین کە دەکاتە (٤٠٠٠) کەس.

** کەمترین بڕی پارە بریتییە لە (٥٠٠٠٠) دینار، زۆرترین ژمارە (٢٩٩٠٠٠) کە ناوەندەکەی بریتی دەبێ لە: (١٧٤٥٠٠) دینار.

٤٤٨. سەنتەری پەرەپێدانی لاوان YDC؛ سەرچاوەی پێشوو.

٤٤٩. بەپێی ئامارەکانی "دەستەی ئاماری هەرێم" سەر بە وەزارەتی پلان دانانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، کە لە ساڵی (٢٠٠٧) دەرکراوە، ڕێژەی گەنجانی کوردستان (٢٠ ساڵ ــ ٣٤ ساڵ)، لە هەر سێ پارێزگای هەولێر و دهۆك و سلێمانی بریتییە لە: (١,٣٥٧,٥٤٤) کەس؛ واتە (٣٩,٦٪) کۆی دانیشتوانی کوردستان کە ژمارەیان: (٤,٩١٠,٧٤٢) کەسە. بڕوانە: سایتی بنکەی زانیاری کوردستان، دەستەی ئاماری

**لاوان کە لە ساڵی (٢٠٠٩) ئەنجامی داوە، ڕێژەی (٣٧٪)ی دانیشتووانی کوردستان گەنجان پێکدەهێنن کە دەکاتە (١,٨١٦,٩٧٥) کەس،[٤٥٠] ژمارەی جگەرەکێشان لە نێوان گەنجان دەبێتە نزیکەی (٧٨٤,٩٣٣) کەس؛ کەچی دەزانین کە جگە لە گەنجان، ڕێژەیەکی هەرە زۆری جگەرەکێش هەیە،[***] بەڵام ئێمە تەنها بنەماکەی لەسەر هەمان ئاماری گەنجان دادەنێین! بەم پێیە دەتوانین زیانی ئابووری جگەرەکێشان لە کوردستان دەربخەین:**

| | |
|---|---|
| *دینار خەرجی ڕۆژانە* | *٧٨٤,٩٣٣×٧٥٠ = ٥٨٨,٦٩٩,٧٥٠* |
| *دینار خەرجی مانگانە* | *٥٨٨,٦٩٩,٧٥٠×٣٠ = ١٧,٦٦٠,٩٩٢,٥٠٠* |
| *دینار خەرجی ساڵانە* | *١٧,٦٦٠,٩٩٢,٥٠×١٢ = ٢١١,٩٣١,٩١٠,٠٠٠* |
| ***واتە: نزیکەی سەد و هەشتا ملیۆن دۆلار*** | ***$ (١٨٠,٠٠٠,٠٠٠)*** |

**هەروەها بە گوێرەی ئامارێکی دی، ڕێژەی (٦١٪)ی گەنجانی کوردستان "نێرگەلە" بەکار دەهێنن کە زیانەکەی هەندەی (٦٠) جگەرەی ئێکسپایەرە.[٤٥١]**

---

هەرێم؛ حکومەتی هەرێمی کوردستان: وەزارەتی پلان دانان، بابەتی: دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٧: http://krso.net/

٤٥٠. **المسح الوطني للفتوة والشباب (٢٠٠٩) التقرير الموجز**؛ سەرچاوەی پێشوو ــ هەروەها بڕوانە: موقع الخيمة: لە ژێر ناونیشانی: كردستان: **"٦.٢٪ من الشباب لم يلتحقوا بالتعليم"**:
http://www.al-khayma.com/youth/kirdistAN_24012010.htm

*** ئەگەر نموونەی وەرگیراو بە سەر گشت دانیشتوانی هەرێمی کوردستان جێبەجێ بکەین کە بەپێی ئاماری دەستەی ئاماری هەرێم کۆی دانیشتوانی کوردستان بریتیە لە (٤,٩١٠,٧٤٢) کەس، ئەوا ساڵانە دەکاتە بڕی (٤٥٣,٦٠٠,٠٠٠) $.

٤٥١. ڕۆژنامەی ستاندەر؛ ژمارەی ٣٤؛ دووشەممە ٢٠٠٨/٦/٢٣؛ ل٦؛ لە زاری "یوسف عوسمان" پسپۆڕی پەروەردەیی.

نرخی نێرگەلەی ئاسایی (٣٠٠٠) دینارە، و فرێش (٦٠٠٠) دینارە.[٤٥٢] ئەگەر لایەنی کەم ناوەندی خەرجی هەر بەکارهێنەرێك مانگانە (٤٥٠٠٠)* دینار مەزندە بکەین، هەر بە شێوازی پێشوو بۆمان دەردەکەوێ کە ڕێژەی خەرجی نێرگەلە لە کوردستان ساڵانە زیاتر لە (٤٨,٠٠٠,٠٠٠) $ چل و هەشت ملیۆن دۆلار دەبێت!

جێگای سەرنجدانە کە ئەو بڕە پارەیە جیایە لە بڕی خەرجی "مەشروباتی ئەلکهۆلی" (بە داخەوە سەبارەت بە مەشروباتی ئەلکهۆلی هیچ ئامارێکمان نییە کە لێرە ئاماژە پێبکەین!) کە بێ شك مەسروفاتی مەشروبات بەپێی ئەو ئازادی و بەرفراوانی و بەردەستبوونەی کە لە کوردستان هەیە، هەروەها دیتنی بەرزبوونەوەی ڕێژەی داخوازییەکان، چەند ئەوەندەی ئەو بڕە پارەیە دەبێت کە تەنیا لە تریاك یان هرۆیین و کراك و ئەمفیتامینەکان سەرف دەکرێت! هەروەها نابێ مەسروفاتی زیندانەکان، دادگاکان، داو و دەرمانی پزیشکی و نەخۆشخانەکان، پۆلیس و ڕووداوی هاتوچۆ (کە ئێستا ڕێژەی ئەمجۆرە ڕووداوانە زۆر لە بەرزبووندایە کە زیاتر لەبەر سەرخۆشی ڕوودەدەن!)، زیانی بێکاری و لەکارکەوتنی خووگرتووان و خێزانیان لە بیر بکەین کە ئەم بڕە پارەیە چەند ئەوەندە دەکات. ئەگەر هەموو ئەم خەرجییانە ڕەچاو بکەین و لەگەڵ یەکتر کۆ بکەینەوە، شتێك زیاتر لە (یەك) ملیارد دۆلار ساڵانە بێهۆ سەرف دەبێت؛ لە حاڵێکدا بەم بڕە پارەیە ((هەموو ساڵێك)) دەکرێ چەندین پرۆژەی خزمەتگوزاری وەك: نەخۆشخانە و قوتابخانە و وەرزشگا و ڕێگاوبان و پارك و سەیرانگە و پرۆژەی یارمەتیدانی گەنجان لە ژنهێنان و خێزانی شەهیدان و ئەنفالەکان و... ئەنجام بکرێن!

---

٤٥٢. دزەیی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل٨٢.

* ڕێژەی ناوەندی نرخی نێرگەلە دەکاتە: (٤٥٠٠) دینار، ئەگەر مانگانە ١جار بەکار بهێنرێ، دەبێتە بڕی: (٤٥٠٠٠) دینار.

دەکرێ زیانییە ئابوورییەکانی مادده هۆشبەرەکان بەم خاڵانەوی خوارەوە کورت بکەینەوە:

- خەرجی زۆر لە کڕین و بەدەست هێنانی مەوادی هۆشبەر.
- خەرجی دەرمان و ڕاگرتنیان لە شوێنە پەیوەندارەکان.
- کەمبوونەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنان.
- خەرجی بەرەنگاری مادده هۆشبەرەکان لە سنورەکان و لە ناو شارەکان.
- خەرجی دادگاکان و پارێزەران.
- سەرەنجام کەمبوونەوەی داهاتی تاکەکەس و خێزان و کۆمەڵگا.

لێرە ئەم ئایەتە قورئانییەم بەبیر دێتەوە کە خوا دەفەرموێت: ﴿ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل﴾[٤٥٣]؛ واتە: ((سەرمایە و سەروسامانی خۆتان لە نێوان خۆتان بە پوچکردن و بێهودەیی مەخۆن!)). لێرەش حیکمەت و فەلسەفەی حەرامبوونی مادده هۆشبەرەکان، تەنانەت جگەرە و نێرگەلە لە ئیسلامدا دەردەکەوێ کە ئیسلام بە توندی ڕێگا لە هەموو جۆرێك لەم ماددانە دەگرێت.[٤٥٤]

٤٥٣. القرآن الكريم؛ سورة البقرة؛ الآية: ١٨٨.

٤٥٤. الزلمي، د. مصطفى إبراهيم؛ **التدخين أضراره و تحريمه في القرآن**؛ ط١؛ أربيل: وزارة البيئة في إقليم كوردستان العراق (٢٠٠٩)؛ ص ٦١-٧٧.

### ٣. ئاسەوارە ئایینی و ئەخلاقییەکان:

پێشتر باسمان کرد کە ئایینی ئیسلام هەر شتێك (ماددی یان مەعنەوی) کە بۆ تاك و خێزان و کۆمەڵگا زەرەر و زیانی هەبێت، حەرامی کردووە و لەوانە ماددە هۆشبەرەکانە. ئەوەش شتێکی سەلمێنراوە کە عەقڵی تەندروست لە ناو جەستەی تەندروست دایە. ئەگەر جەستەیەك بە هۆی بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر ئالودە ببێت، چۆن دەتوانێت بە دروستی بڕیار بدات و باش و خراپ، سوود و زیان، حەڵاڵ و حەرام لە یەکتر جیا بکاتەوە؟ کاتێ کە عەقڵی تەندروست و ساغ نەبێت، هەم کات و هەمیش پارە لە ڕێگایەك سەرف دەبێت کە هیچ سوود و قازانجێکی نییە. بۆ تاکی خووگرتوو هیچ شتێك لەوانە گرنگ نییە؛ بۆیە زۆر بە ئاسانی بیروباوەڕی ئایینی و بەڵێنە ئەخلاقییەکانی لە پێناو گەیشتن بەو ماددانە دەخاتە ژێرپێ. دەبینین کە تاکی خووگرتوو زۆر بە ئاسانی درۆ دەکات، دزی دەکات، منداڵی خۆی دەفرۆشێ و تەنانەت زۆر جار بووە کە هاوسەری خۆی ناچار بکات بۆ لەشفرۆشی و داوێنپیسی تاکو پارە و مەسەرەفی کڕینی ماددەی هۆشبەری پێویست دابین بکات. لە حاڵێکدا ئایینی ئیسلام ماددە هۆشبەرەکان و جگەرە و مەشروباتی ئەلکهۆلی حەرام کردووە، بە ئاسانی سنووری خوای دەبەزێنێت و گوێ لە هەوا و ئارەزوو دەروونییەکانی دەگرێت؛ بۆیەشە کە دەبینین کە زۆربەی خووگرتووەکان هیچ پابەندییەکیان نییە، نوێژ ناکەن، ڕۆژوو ناگرن، زەکات و سەدەقە نادەن و هتد![٤٥٥] واتە گوناهێك دەکەن، کە گوناهەکانی دیکە ــ یەك لە دوا یەك ــ دێنێتە کایەوە!

هەروەك پێشتریش ئاماژەمان بە ئەنجامی توێژینەوەکە دا، (١٠٠٪)ی خووگرتووە بەندکراوەکان نەیاندەزانی کە ئایینی ئیسلام ئەم ماددانە تەنانەت

---

٤٥٥. گنجی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٦٧-٦٨.

جگەرەش بە حەرام دەزانێ و بە سەختی ڕێگایان لێدەگرێ. هەروەها گووتمان کە پابەندیی ئایینی لە لای خووگرتووان، (٦٠٪)یان زۆر کەم بووە، (٤٠٪) یانیش هەر هیچ بووە!

### ٤. *ئاسەواری سیاسی:*

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، داگیرکەران و دوژمنەکان لەپێناو داگیرکردن و فراوانکردن و سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسیی خۆیان لەسەر هەندێ وڵاتان، هەڵدەستن بە بڵاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکان لە نێوان گەنجانی ئەو وڵاتانە تاکو هێزە سەرەکییەکانی ئەو کۆمەڵگایانە لەناو ببەن. مسۆگەریشە کاتێ کە بتوانن هێز و توانایی بیرکردنەوە لە کۆمەڵگایەك وەربگرن، کاتێ کە بتوانن کۆمەڵگایەك بە خۆیانەوە وابەستە و پاشکۆ بکەن، کاتێ بتوانن هێز و توانایی عەسکەری و بەرگریکردنی گەنجانی وڵاتێك بە چەند تەن تریاك و هرۆیین و ئەلکهۆل و حەشیش و... لە ناو ببەن، زۆر بە ئاسانی دەتوانن لە نەخشە و پیلانەکانیان سەرکەوتوو بن و بە کەمترین سەرمایەی ماددی و مرۆیی ئەو کۆمەڵگایەی کە دەیانەوێ، داگیر بکەن. لەو کاتەیە کە ئەو کۆمەڵگایە لە ڕووی سیاسییەوە سەربەخۆ نابێ و ناتوانێ شۆڕش بکات و ئاسایشی وڵاتەکە دەکەوێتە هەڕەشەوە.

دوژمنان و داگیرکەران دەزانن کە بە هۆی دەستتێوەردانی سەربازی و ئابلۆقەی ئابووری ناتوانن وڵاتێك بە ئاسانی بکەنە پاشکۆی خۆیان؛ بۆیە پەنایان بردە بەر ڕێگایەك کە:

وەکو شەڕ و دەستێوەردانی سەربازی هەم لە ڕووی ئابووری هەمیش مرۆییەوە کەمتر زیان بکەن و بگەن بە ئامانجی ستراتیجی و دوورمەودا کە لەناوبردنی بنەما فیکری و ئایینی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیی ئەو کۆمەڵگایە تاکو بگاتە ئەو ڕادەیە کە بە داگیرکەریی ئەوان ڕازی بن و هەمیشە دەستی

گەدایی و سواڵکەری بەرامبەریان درێژ بکەن؛ بە شێوەیەك کە "کیسنجەر" لە دوای شکست و هەرەسهێنانی "ئەمریکا" لە شەڕی دژ بە "ڤێتنام" دەڵێت: پەند و دەرسێکی یەکلاکەرەوەمان وەرگرت لەو شەڕە کە نابێ ئەمریکا هیچ کاتێك خۆی بخاتە ناو شەڕی ڕاستەوخۆ بە تایبەتی کە ستراتیجیەتێکی نادیاری هەبێت![٤٥٦]

---

٤٥٦. برفی؛ سەرچاوەی پێشوو؛ ل ٤٤.

## دەستپێك:

هەروەك دەزانین كۆمەڵناسی ئەو زانستەیە كە توێژینەوەی دیاردە كۆمەڵایەتییەكان دەكات لە ڕێگای بەكارهێنانی میتۆدی زانستی بۆ گەیشتن بە ئامانجی گونجاو كە بریتییە لە دەستنیشانكردنی هۆكارەكانی پشت ئەو دیاردەیە و ئەنجامەكانی لەپێناو پێشكەشكردنی ڕێگا و شێوازی چارەسەری و نەهێشتن یاخود ـ لانی كەم ـ كەمكردنەوەی ڕێژەی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی.

لەم بەشەدا ـ كە بەشی كۆتاییە ـ هەوڵمان ئەوە دەبێت كە بەپشتبەستن بە "ئەنجامەكان"ی لێكۆڵینەوەكە، چەند "ڕاسپاردە و پێشنیار"ێك وەك ڕێگا چارەسەرێك بۆ بەرەنگاربوونەوە و نەهێشتنی دیاردەی ماددە هۆشبەرەكان پێشكەش بكەین كە لە ئامانجە سەرەكییەكانمان نزیك ببینەوە.

## یەکەم: کورتەیەك لە ئەنجامەکان:

بە بێ دەستکەوتنی ئەنجامەکان، ناکرێ ڕاسپاردە و ڕێگاکانی چارەسەریی ئەم دیاردەیە بەدەست بهێنین؛ بۆیە سەرەتا باس لەو دەرەنجامانە دەکەین کە لە لێکۆڵینەوەکەمان بەدەستمان کەوتووە، دواتر باس لە هەندێ ڕاسپاردە و پێشنیار دەکەین بۆ هەموو لایەنێك کە چی دەبێ بکرێت بۆ بنبڕکردنی ئەم دیاردیە:

١. هەموویان ((پیاو)) بوون و ((گەنج))یش بوون.. گەورەترینیان (٣٤) ساڵ و بچووکترینیان (٢٣) ساڵ بوو؛ کەواتە دەتوانین بڵێین: هۆکاری بایۆلۆژی (وەکو هۆکاری تەمەن و هۆکاری ڕەگەزی) هۆی تووشبوونی ئەو خووگرتووانەیە لەو کۆمەڵگایەدا. (هەروەك لە بەشی پێنجەمدا باسی لێکرا).

٢. ڕێژەی (٦٠٪)یان خێزاندار و ڕێژەی (٤٠٪)یش سەڵت بوون؛ واتە ئەوانەی خێزاندارن، کێشەی خێزانییان هەبووە و ئەوانەی کە سەڵتن، لە ڕووی دەروونییەوە کێشەیان هەبوە کە پەلکێشی ماددە هۆشبەرەکان بوون. (هەروەك لە بەشی پێنجەمدا باس لێکرا).

٣. لە ڕووی ڕۆشنبیری و فەرهەنگییەوە، ئاستی خوێندنیان کەم بوە، تەنها یەك کەس نەبێت کە خوێندنی باڵای هەبوە؛ کەواتە هۆکاری کولتوری یەکێکە لە هۆکارەکانی تووشبوونیان. (هەروەك لە بەشی پێنجەمدا باسی لێکرا).

٤. هۆی سەرەکی تووشبوونی ئەم گەنجانە بۆ نێشتەجێبوونیان لە ((ئێران)) دەگەڕێتەوە، بە حوکمی ئەوەی ئاوارەی ئێران ببوون. ئێرانیش ـ هەروەك دەزانین ـ وڵاتێکە کە ڕێژەی خووگرتووەکان لە هەموو شارەکانی دا بە تایبەتی شارەگەورەکانی وەکو: تاران، ئەسفەهان، شیراز، ورمێ و... (کە

زۆربەی ئەم گەنجانە لەم شارانە دا نیشتەجێ بوون)، زۆرە و هەموو جۆرە ماددە هۆشبەرەکانیش لە ئێران و لەو شارانە بە دەست دەکەوێ؛ کەواتە لێرە دەتوانین باس لە هۆکارە ئیکۆلوژییەکان (هۆکاری شوێنی نیشتەجێبوون، هۆکاری بەردەستبوونی ماددە هۆشبەرەکان، هۆکاری کۆچکردن لە وڵاتێك بۆ وڵاتی تر)، هەروەها باس لە تیۆری ئانۆمی کۆمەڵایەتی (دۆرکایم و پارك و بێرگس) بکەین کە زیاتر جەخت لەسەر تووشبووانی شارنشینان (بە تایبەتی شارەگەورەکان) دەکەن. (هەروەك لە بەشی چوارەم و پێنجەمدا باسی لێکرا).

٥. ئەمانە کە لە ئێران تووش بوون، زۆربەیان ئەو کەسانەن کە لە گەڕانەوە بۆ کوردستان دواکەوتوون (واتە لە دوایساڵی ٢٠٠٠وە گەڕاونەتەوە)، کەچی ئەوانەی کە زووتر هاتوونەتەوە، وەکو ئەوان تووشی ماددە هۆشبەرەکان نەبوون؛ چونکە پێشتر لە هەموو شارێك کە ئاوارەکانی کورد تێدا نێشتەجێبوون، بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵگایەکی خۆجێی (Community)یان پێك دەهێنا، پەیوەندیی دەروونی ـ کۆمەڵایەتی نێوانیان زۆر پتەو و بەهێز بوو، ئینتیمایان بۆ یەکتر زۆر بوو، خۆیان بە نیسبەت ئێرانییەکان بە بێگانە دەزانی و...، بەڵام وردە وردە لەگەڵ گەڕانەوەی ئاوارەکانی کورد ڕێژەی ئەوانەی کە نەهاتنەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبوو؛ بۆیەش ئەو کۆمەڵگا خۆجێیەکان هەڵوەشا و وەکو پێشتر نەما و هەر یەکیان لە گەڕەکێك بڵاوبوونەوە و پەیوەندییەکانیشیان لەگەڵ یەکتر ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتر بوو و زیاتر لەگەڵ ئێرانییەکان تێکەڵ بوون و برادەرەکانی ئێرانی بوونە جێگرەوەی خزم و برادەری کورد. ئەوەش بوە هۆی وەرگرتنی داب و نەریت و فەرهەنگی ئێرانییەکان و لە کۆتایی دا تووشی ماددە هۆشبەرەکانیش بوون. لێرە دەتوانین ئاماژە بە تیۆرەکانی (کردەی دوو لایەنەی هێمایی، لاساییکردنەوە و فێربوونی کۆمەڵایەتی، گواستنەوەی کولتووری) بکەین. (هەروەك لە بەشی چوارەم باس لێکرا). ئێستاش کە ئەم خووگرتووانە گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان هەست بە

نامۆبوونی خۆیان دەکەن! تەنانەت کاتێك چاوپێکەوتنمان لەگەڵیان ئەنجامدا، وەکو ئێرانیەکان دەهاتنە پێش چاومان و خووگرتووەکانی ئێرانیمان بە بیر دەهاتەوە! قسەکان و هەڵسوکەوت و تەبریراتی ئێرانییانەیان هەبوو!

٦. بۆمان دەرکەوت زۆربەی ئەوانە، لە هەردوو قەزای ((دیانا)) و ((بنەسلاوە)) نیشتەجێن کە زۆربەی کوردە ئاوارەکان کە لە ئێران گەڕاونەتەوە، لەو دوو قەزایە دادەنیشن. جگە لەوەش قەزای ((دیانا)) نزیکی سنووری ئێرانە کە ڕێگای سەرەکی هاتووچۆکردن و ترانزیت و بازرگانیکردنە لە نێوان ئێران و هەرێمی کوردستان. (لێرە دەتوانین ئاماژە بە هۆکارە ئیکۆلۆژییەکان لە ئاستی قەبە دا بکەین کە لە بەشی پێنجەمدا بە تێروتەسەلی باسی لێکرا).

٧. هەموویان لە بواری ئابووریدا بێئاگا بوون بە تایبەتی لە داهات و خەرجیی خۆیان کە بەشێکی زۆری داهاتیان (واتە ڕێژەی ٣٣.٧٥٪)* بۆ کڕینی ئەو ماددانە تەرخان کردووە. هەروەها لە ڕووی ئابوورییەوە، دەکرێ بڵێین لە ئاستی نزم یان نزیك لە ناوەند بوون؛ چونکە زۆربەیان هێشتا کرێچین و داهاتی ئەوتۆشیان نەبوو و پیشە و کارێکی پڕداهاتیان نەبوو و بە تایبەتی ئەوانەی کە کاری فەرمی و حکومییان نییە و کرێکارن و کاری ئازاد دەکەن، کە زۆر جار تووشی بێکاری دەبن کە خۆی لە خۆیدا هۆکارێکە بۆ پەلکێشبوون بە مادده هۆشبەرەکان. (لێرە دەتوانین ئاماژە بە هۆکاری ئابووری و تیۆری ئابووریش بکەین کە وەکو پاڵنەرێك دادەنرێن بۆ تووشبوونیان و لە بەشی چوارەم و پێنجەم، باسی لێکرا).

٨. هەموویان زەمینەی مادده هۆشبەرەکانیان تێدا هەبوە، بە حوکمی ئەوەی کە (١٠٠٪)یان ((جگەرەکێش)) بوون و زۆربەشیان (واتە ٦٠٪)یان پێشتر

* ڕێژەی ناوەندی داهاتەکان بریتییە لە: (٥١٧٠٠٠) دینار، ڕێژەی ناوەندی خەرجی ئەوان بۆ کڕینی مادده هۆشبەرەکان بریتییە لە: (١٧٤٥٠٠)؛ کە دەکاتە ڕێژەی (٣٣.٧٥)٪.

مەشروباتی ئەلکهۆلیان دەخواردەوە. تیۆرەکانی (دەروازە، ڕەفتاری کێشەئامێز) جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ((جگەرە و مەشروباتی ئەلکهۆلی)) ـ کە لە هەرێمی کوردستاندا لە مادده هۆشبەرەکانی مۆڵەت پێدراو دەژمێردرێن ـ دەروازە و هەنگاوی یەکەمی مادده هۆشبەرەکانی ترە، وەکو تریاك و هروئین و ئەمفیتامینەکان و...! (لە بەشی چوارەم باسی لێکرا).

٩. هەبوونی برادەری جگەرەکێش و مەشروبخۆر و خووگرتوو، یان یەکێك لە ئەندامانی ناو خێزان، زۆر کاریگەریی هەیە لە تووشبوونی تاکەکان بەو ماددانە. تەنانەت ڕێگای بەدەستکەوتنی ماددەکان، بریتی بوە لە برادەری خووگرتوو و تاکەکانی ناو خێزان. هەروەها لە وەڵامەکانیان دەرکەوتوە کە زۆربەیان بە پێشنیاری برادەرکان و ئەندامانی ناو خێزان فێر بوونە و تەنانەت (٨٠٪)یان لە شوێنی میوانداری برادەران و لەماڵەوە دەستیان پێکردووە. لێرە دەتوانین ئاماژە بە تیۆرەکانی (خێزان یان تیۆری ئەرکگەرێتی ـ بونیادی لە ئاستی ناوەندیدا، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، کردەی دوولایەنەی هێمایی، فێربوونی کۆمەڵایەتی، هاودەمی جیاواز، لاساییکردنەوە کە لە بەشی چوارەم باسی لێکرا)، هەروەها بە هۆکارەکانی (خێزانی وەکو بوونی ئەندامێکی خووگرتوو لە ناو ماڵدا، هۆکاری هاوتەمەنەکان) بکەین، کە هەموویان لەگەڵ ئەنجامەکان کۆکن. (هۆکاری خێزانی لە ئاستی ناوەندیدا لە بەشی پێنجەم باسی لێکرا).

١٠. هەروەك لە وەڵامەکانیان بۆمان دەردەکەوێ، دەبینین کە سەرەڕای هەوڵدانێکی زۆر (هەموویان زیاتر لە ٣ جار هەوڵیان داوە) بۆ وازهێنان لە مادده هۆشبەرەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی بەبێ پشتبەستن بە کەسێکی پسپۆڕ وەکو پزیشك یان سەنتەرێکی تایبەت بەم بوارە، خۆیان ئەم کارەیان کردووە، سەرنەکەوتن و تووشی جۆرەها کێشەی دەروونی و جەستەیی دەبوون کە لە بەشی شەشەم ئاماژە پێکرا.

١١. بۆمان دەرکەوت کە پەیوەندی هەیە لە نێوان ((مادده هۆشبەرەکان)) و ((تاوانکاری و بەندبوون)).. هەموویان لەبەر ئەوەی مادده هۆشبەرەکانیان بەکارهێناون، بەند کراون کە (٣٠٪)یان چەندین جار لەسەر مادده هۆشبەرەکان و لادانەکانی دیکە بەندکراون. (لە بەشی شەشەم ئاماژە پێکرا).

١٢. هۆی تووشبوونی زۆربەیان جگە لە ((بوونی برادەری خووگرتوو)) و هاتووچۆکردن لەگەڵیان، دەگەڕایەوە بۆ (چێژوەرگرتن، حەزی جنسی، لاساییکردنەوە، حەز و ئارەزووی زانین و فزولییەت، زەختی برادەران، نەبوونی چاودێریی خێزان لەسەریان، کێشەی خێزانی، بێکاری، سەرنەکەوتن لە خۆشەویستی و هەڵاتن لە کێشەکانی ژیان) کە لە بەشی پێنجەم بە تێروتەسەلی ئاماژە پێکرا.

١٣. لە وەڵامەکانیاندا بۆمان دەرکەوت کە خێزانی ئەوان، خێزانێکی شپرزەن و هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەن؛ چونکە دایك و باوکیان بە هۆی چاودێری و کۆنترۆڵ نەکردنی پێویست و شێوازی گونجاوی پەروەردەکردن، زۆر لەو گەنجانە وازیان لە قوتابخانە هێناوە و لە ئاستێکی بەرزی خوێندەواریدا نەبوون. هەروەها ئاگاداری هاتووچۆکردنیان لەگەڵ برادەری خراپ و خووگرتوو نەبوونە کە شەوان چ کاتێك دەچنە دەرەوەی ماڵ و چ کاتێك دەگەڕێنەوە. لێرە دەتوانین ئاماژە بە تیۆرەکانی (کولتووری چینی خواروو، تیۆری کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، تیۆری خێزان، تیۆری ئەرکگەرێتی – بونیادی لە ئاستی ناوەندیدا) بکەین کە لە بەشی چوارەم باسی لێکرا و ئەنجامەکانیش پاڵپشتی ئەم تیۆرانە دەکەنەوە.

١٤. جێگای سەرنجدانە کە ڕێژەی (٦٠٪)یان دەزانی کە مادده هۆشبەرەکان دەبنە هۆی خووپێوەگرتن، کەچی هەر ئەم ماددانەیان بەکار هێناوە! لێرە دەتوانین پاڵپشتی لە تیۆری (هەڵبژاردنی عەقڵانی) بکەینەوە کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تاك دەیەوێت پێ بنێتە ناو ئەو جۆرە گروپ و

تاکانە کە خووگرتوون! بە هەندێ پاڵنەری وەکو: ئارەزووی تامکردن و چێژوەرگرتن، تاقیکردنەوە، ئارەزووی دەربازبوون، ڕەخنە لە نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان و ... بۆ ئەم کارەی دەبا. (لە بەشی چوارەم ئاماژەمان پێکردووە).

١٥. هۆیەکی تر بریتییە لە ((نەبوونی هوشیاری))ی پێویست لەسەر ماددە هۆشبەرەکان. زۆربەیان دەیانگووت کە ئاگاداری ئاسەوار و ئەنجامە نێگەتیڤییەکانی ماددە هۆشبەرەکان نەبووین! (لە بەشی پێنجەم کاتێ باس لە هۆکاری کولتووری کراوە، ئاماژەمان پێکردووە).

١٦. زۆربەیان دانیان بەوە دادەنا کە پەیوەندییان لەگەڵ خێزانەکانیان باش نەبووە؛ بە تایبەتی ئەوانەی کە خێزاندار بوون، تەنانەت نموونەی واش هەبوو کە هاوسەرەکەیان لە خەفەتی ئەوان هەوڵی خۆکوژییان داوە و زۆربەشیان داوای تەڵاقیان کردووە ! (لە بەشی شەشەم باسمان لێکردووە).

١٧. پێمان وایە ئەوانەی کە لایەنی ئایینی و مەعنەوی و ڕۆحییان (Spiritual) لاوازە، کەمتر خۆڕادەگرن بەرامبەر کێشەکانی ژیان و زیاتر پەنا دەبەنە بەر ماددیات و ئامرازی ماددی کە یەکێك لەوان ((ماددە هۆشبەرەکان))ە؛ بۆیەش دەبینین کە زۆربەیان تەنانەت خێزانەکانیان (ئەو شوێنەی کە تێدا پەروەردە کراون) لە ڕووی ئایینییەوە لاوازبوون و پابەندی ئایینییان کەم یان هەر هیچ بووە. لێرە دەتوانین ئاماژە بە تیۆرەکانی (ئانۆمیای کۆمەڵایەتی لە دوو ئاستی: ناوەندی واتە خێزان، هەروەها ئاستی قەبە واتە کۆمەڵگا و سیستەمەکان و بونیادەکانی، هەروەها تیۆری کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی) بکەین کە فاکتەری ئایین وەکو سیستەمێکی بەرچاوی کۆمەڵگا کە باشترین و بەهێزترین ئامرازی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی تاکەکان دەژمێردرێت، بۆ تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان شیدەکەنەوە. (لە بەشی چوارەم و پێنجەم باسمان لێکردووە).

١٨. نەبوونی ((هۆشیاریی ئایینی)) کە ئەم ئەرکە زیاتر لەسەر ئەستۆی مامۆستایانی ئایینییە بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و ڕۆشنبیری ئایینی بە یارمەتی حکومەت و ڕاگەیاندن؛ چونکە ئایینی ئیسلام بە توندی ڕێگرە و دژی هەموو جۆری ماددەی هۆشبەرە و بە زیانی تاك و کۆمەڵگا دەزانێ. هەروەك دەبینین هیچ یەك لەو گەنجانە نەیاندەزانی کە ئایین، ماددە هۆشبەرەکان بە حەرام دەزانێ. (لە بەشی پێنجەم ئاماژەمان پێکردووە).

١٩. زۆربەیان دەیانزانی کە ماددە هۆشبەرەکان شتێکی نایاساییە و ئەگەر ئاشکرا بن، دەگیرێن؛ کەچی سەرەڕای ئەوەش هەر بەکاریان دەهێنا! کەواتە ئەوانەی کە تاکی خووگرتوو بە نەخۆش لەقەڵەم دەدەن، نەك ((تاوانبار))، پێمان وایە بۆچوونیان دروست نییە و لە وەڵامی ئەوان دا دەڵێین: ((تاکی خووگرتوو، تاوانبارێکی نەخۆشە))! هەروەها باشترین ڕێگای کۆنترۆڵکردنیان لەو کۆمەڵگایەدا، بەپێی وەڵامەکانیان بریتییە لە: ترس لە یاسا و زیندان! دواتر باسیان لە ترس لە هاوسەر و دایك و باوك، و ترس لە ڕوویشتنی ئابڕوو و کەسایەتییان کردووە.. دیسان ((ترس لە خوا)) هیچ ڕۆڵێکی نەبوو بۆ کۆنترۆڵکردنیان کە نیشاندەری ئەوەیە کە ئەو کەسانە تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن، کە هیچ ترسێکیان لە خوا و ئایین نییە. ئەو تیۆرانە کە پاڵپشتی ئەم ئەنجامە دەکەن بریتین لە: (تیۆری کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، تیۆری خێزان یان تیۆری ئەرکگەرێتی – بونیادی لە ئاستی ناوەندیدا). (لە بەشی چوارەم و پێنجەم و شەشەم ئاماژەمان پێکردووە).

٢٠. ڕێژەی (٩٠٪)یان پەشیمان بوون و هۆی پەشیمانیشیان دەگەڕاندنەوە بۆ تووشبوونیان بە جۆرەها کێشەی خێزانی و دەروونی و کۆمەڵایەتی. (١٠٪)یش پەشیمان نەبوون و هۆیەکەشی دەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی ماددە هۆشبەرەکان شتێکی خۆشە و چێژ و لەززەتی زۆرە. (لە بەشی شەشەم باسمان لێکردووە).

